## چەندپەیڤێك

ئەم بەرگەش ئەم بوارانەی لەخۆوە گرتووە : بواری ئاینی ، بواری کۆمەلأیەتی ، بواری ئابوری ، بواری تەندروستی ، بواری جوانیناسی ، بواری هونەری ، بواری ئەدەبی ، بواری فەلسەفە ، بوار ی مێژوو ، بواری هزری ، بواری کەلتوری ، بواری دەروونناسی ، بواری سیاسی ، زانیاری گشتی٠

ئەوسەرچاوانەی بەکارم هێناوە : کتێب ، ڕۆژنامە ، گۆڤار ، بەلأم گۆڤارزۆرترین ژمارەیە بەبەراورد لەگەڵ سەرچاوەکانی دیکە ، چونکە زیاتر ئەو بوارانەی تێدابووکەبەسوودن بۆتوانای زمانپاراوی وگوزارشتکردن٠

کاروان سلێمان کاکەمەد

هەولێر ١٧ / ١ / ٢٠١٩

**ژیان چییە ؟**

ئەگەرلەمێژووی ژیان بڕوانین ، سەرەتای دروستکردنی مرۆڤ سەیربکەین بە(ئادەم)دەستیپێکرد ، کەیەکەم مرۆڤ بووە دروستکراوە٠

(یا ح)دەڵێ : ((یەکێ لەومەبەستانەی کەخوای گەورەمرۆڤی لەپێناویدادروستکردووە ژیان وئاوەدانکردنەوەی سەرزەوییە٠بەلاَم مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی لەبوونەوەرانی ترجیادەکرێتەوە بەوەی کەلەوژیانەداتاقیدەکرێتەوە ، لەوتاقیکردنەوەیەشداتووشی چەندین ناخۆشی وناڕەحەتی دەبێ ، بۆیەهەموومرۆڤێك دەبێ بزانێت مەبەست لەدروستکردنی چییە؟ مەبەست لەهاتنی بۆسەرئەم دونیایەچییە؟))٠

(ش)دەڵێ : ((ژیان ئاواتە ، بۆیەمرۆڤ ناتوانێت بەبێ ئاوات بژی ، نەمانی هیوانەمانی مرۆڤە))٠(گ)دەڵێ : ((ژیانی مرۆڤ وتەوکردەوەکانییەتی ، نەك ڕۆژان وسالاَنی ژیانی))

(ح ڕ)دەڵێ : ((ژیان وەکوهۆڵێکی تاقیکردنەوەوایە لەدەرگای لەدایکبوون دێینەژوورەوە ،لەدەرگای مردن دەچینەدەرەوە،ئەوماوەیەی کەلەژووری هۆڵەکەدەمێنینەوە تەمەنمانە ئەوتەمەنەبەوەببەینەسەربەجۆرێك خوای گەورەلێمان ڕازیبێ))٠(ئا ش)دەڵێ:ژیان خۆشییە ، ناخۆشییە ، گریانە ، پێکەنینە ، بەرزبوونەوەیە ، نزم بوونەوەیە))٠(ك ج)دەڵێ:هەریەکەمان لەژیانداچ خۆشی ، چ ناخۆشیمان دێتەڕێ ،وەهەریەکەلەئێمەلەژیانداڕووبەڕووی گەلێك کۆسپ وتەگەرەدەبینەوە جائەم کۆسپ وتەگەرانەبەهۆی کێشەی کۆمەلاَیەتی،ئابوری،دەروونییەوەبێت، چونکەدنیامەیدانی شەڕێکی گەورەیەپێویستەمرۆڤ خۆی بئەم ڕووبەڕووبوونەوەیەئامادەبکات بەتایبەتی لەڕووی هێزی دەروونییەوە،وەهێزی دەروونی وەکووڕەبەرزی ومتمانەبەخۆکردن٠(ع) دەڵێ : ژیان لای من سەفەرێکە ، لەئێمەزۆرترن ئەوانەی سەفەرەکەیان تەواوکردووە ئێمەش ڕێبواری ئەم ڕێگایەین ، تەنهاخوای گەورەدەزانێ چەندمان ماوەتەواوی بکەین ، بڕوام بەم وتەیەهەیەکەدەڵێ:((ژیان خەونێکی کورتە))٠(ك) دەڵێ : بەبێ دڵخۆشی ژیان ناچێتەسەر ، هەروەهادڵخۆشی ئەنجامی ئەمەلەواتا ئومێدوهیوای دواڕۆژ ، چونکەمرۆڤ بەئومێددەژیت دڵخۆشی والەمرۆڤ دەکات ژیانی خۆشبوێ وهەوڵی بۆبدات٠(س) دەڵێ : ژیان واتاسەرکەوتن ، سەرکەوتن لەئیش وکاردا ، لەهاوسەریدا ، لەپەیوەندی لەگەڵ خەڵکیدا ، لەتەندروستیدا ، سەرکەوتن ئاواتی گشت کەسێکە٠(ش)دەڵێ : ژیان مەرج نییە بۆهەمووکەس وەك یەك بێت ، کێشەکانیش هەمەجۆرن ، کاتی وهەمیشەیی وبچووك وگەورە٠(ز ح ) دەڵێ : بوارەکانی ژیان بەرفراوان وهەمەلایەنە ، وەك لایەنەکانی : ئابوری ، کۆمەلاَیەتی ، ڕۆشنبیری ،٠٠٠هتد٠سەرکەوتن لەبوارەکانی ژیان جیاوازییان هەیە ، ڕەنگەهەندێك کەس بتوانن لەبازرگانی داسەرکەون ، بەلاَم لەلایەنێکی ترئەوتوانایەیان نەبێ٠(س) دەڵێ : گەیشتن

بەژیانێکی بەختەوەرئاواتی هەموومرۆڤێکە ، بەلاّم ئەوەی جێی سەرنجە بەدەستهێنانی هەرئاواتێکی ئەم دنیایە لە ماوەیەکی کورت دا ئاواتە بەدەستهاتووەکە کە دوێنێ جێی سەرنج بوو

دەبێتە ڕۆتینێکی ڕۆژانە٠هەمووومان دەزانین مۆبایل لەسەرەتادا ئاواتی هەموومان بوو ، بەلاّم ئێستابۆتەشتێکی ڕۆتینی٠(ك) دەڵێ : لەژیان دا مرۆڤ پێویستی بەدووشتی گرینگ هەیە بۆئەوەی بژی ئەم دووشتەش خواردن وئەمن وئاسایشە ، چونکە مرۆڤ بەبێ خۆراك دەمرێت وژیانی نامینێت٠(نا) دەڵێ : ژیان دوودیوی هەیە ، دیوێك کەحەزی لێ دەکەین ، دیوێك کەخۆ شمان ناوێ٠مرۆڤ لەسەرەتادادەبێت سەرنج بدات کەژیان بریتییە لەکۆی دژەکان واتا ساردی و گەرمی وبیابان وچیاودەشت وتاریکی وڕووناکی وتەندروستی ونەخۆشی وپێکەنین وگریان و ٠٠٠هتد٠(ك) دەڵێ : ئیمان پەناگەیەکی گەورەیە بۆمرۆڤ ، هەوێنی خۆڕاگرییە بەرامبەربەگێرو گرفتەکانی ژیان ، چونکە خۆکوشتن لەبێ هیوایی ونائومێدی یە٠(ن) دەڵێ : هیوادارم هەموو کەسێ ژیان بەجوانی ببینێ٠(ئا) دەڵێ : من لەگەڵ ژیان دا کێبرکێ دەکەم بەشێوەیەکی گشتی من بەهێزم ، تاکوئێستا چەندین سەرکەوتنم بەدەستهێناوە هەندێ جاریش تووشی سەرنەکەو تن بووم ، من بەردەوامم نازانم چ چاوەڕێم دەکات لەداهاتوودا ، بەلاّم بڕوام وایە ژیان لەنێوا ن ئەمڕۆوسبەی گۆڕانکاری زۆری تێدایە٠

سیفەتەکانی نەفامی :

نەزانی بەچەندواتایەك دێت ، لەوانە : -

١ — نەزانی پێچەوانەی زانست وزانیارییە ، واتابکەری کارێك زانیاری نەبێت یاخودنەزانێت بەوگوفتارەی یان بەوڕەفتارەی یان بەوبیروباوەڕەی کاتێك دەکەوێتەناویەوە پێی تاوانباردەبێت٠بێگومان نەزانی سیفەتێکی خراپ وزەمکراوە ، مرۆڤ پێویستەهەوڵی تەواوی خۆی بدات بۆئەوەی ئەوسیفەتەلەسەرخۆی لاببات٠

٢ — ئەم چەمکەلەقورئان وفەرموودەدابەچەندسیفەتێك هاتووە ، لەوانە :-

یەکەم - تبرج :

واتا گوێنەدان بەداپۆشینی لەش ولەبەرکردنی جۆرە پۆشاکێ ، کەئەندامەکانی لەشی ئافرەت دیاربخات٠(وقرن في بيوتكن ولاتبرجن تبرج الجاهلية الاولى) الاحزاب : ٣٣

هەندێك لەئافرەتان زۆربێ تام دەگەڕێن ولەماڵ دەردەچن ئەوە مانای ئەوە نییە کەئافرەت هەر دەبێ لەماڵەوەبن و ژیانیان لە نێوان چواردیواربیەنە سەرنە ئەوکەس ببینێ و نەکەسیش ئەو ببینێ ، بەلاّم بەئەندازەوڕێسای خۆی خۆنابێ هەمووکات دەرگای ماڵێ قوفل بدرێ وەناشبێ خۆ یان سفوربکەن وجەستەی دەرپەڕێ وکوڕچاوی لێ بکەن وتەعلیقی لێ بدەن٠

تەبەرووج لەبورجەوەهاتووە واتالەبورج دەرچوون بەمەبەستی خۆدەرخستن٠لەم چاخەداگۆرانی وشیحروهونەرهەمووی باسی دلْداری وزولف وخالْ وگەردن وبالاْی ئافرەتەبەیْ ئەوەی بیرلەوەبکریْتەوەکەژن مرۆڤە ، مرۆڤیش پیْویستی بەمیْشکیْکی کاریگەرەلەهەمووبواریْك دانەك تەنهاخۆڕازاندنەوەوگرینگیدان بەڕوخساردوورلەهزروبیروباوەڕ،مەبەستیش ئەوەنییەکەژن بەیەکجارتایبەتمەندی خۆی لەبیربکات لەخۆڕیْکخستن وجوانی ، بەلاْم نەبیْتەمەسەلەیەکی سەرەکی٠(س) دەلْیْ : من جوانی ئافرەت لەمانەدەبینم :-

١ – ڕەوشتی باش٠

٢ – خاوەن نامووس٠

٣ – لەتوڕەییدائارام بگریْ٠

٤ – لەتەنگ وچەلْەمەداخۆڕاگربیْ٠

٥ – لەهات وهاواردابیْدەنگ بیْ٠

٦ – لەخەمباریدادلْفراوان بیْ٠

(ڕ) دەلْیْ : جوانی مرۆڤ بەگشتی وجوانی ئافرەت بەتایبەتی دووجۆرە :- جوانی دەرەوە : بریتییەلەڕوخساروبەژن وبالاْوپۆشتەیی٠جوانی ناوەوەبریتییەلەئەقل وژیری ونامووس٠ئافرەت ئەگەرشای جوانیش بیْ ، بەلاْم ئەگەرخاوەن نامووس نەبیْ ئەوەبەهیچ ناچیْ٠(بم) دەلْیْ : بەبۆچوونی من جوانی ئافرەت لەمانەدایە :-

- لەڕەوشت بەرزی وئاکاری جوان٠

- لەپەروەردەی باش ومامەلْەکردن لەگەلْ دراوسیْ٠

- لەگفتوگۆی شیرین وڕیْزگرتن لەبەرامبەر٠

- لەلووت بەرزنەبوون لەژیاندا٠

- لەبەکارهیْنانی ئەقل ونەکەوتنەدوای ئارەزووەهەنوکەییەکان٠

(ئا ح) دەلْیْ : جوانی ئافرەت لەئەقلیدایە ، ڕاستەیەکەمجارڕوخساری سەرنجت ڕادەکیْشیْ،بەلاْم دواترلەکاتی مامەلْەکردنی ڕۆژانەبۆت دەردەکەویْ ئەم ئافرەتەتاچەندژیروهۆشمەندە ؟ چونکەزۆرکەس کەسەیری ڕوخساری دەکەی هیچ جوانییەکی پیْوەدیارنییە،بەلاْم کاتیْك کەلەگەلْی دەکەوییەگفتوگۆوات لیْ دەکات کەجوانییەکی هەیەسەرنجت ڕادەکیْشیْ٠

### ئەوشتانەی پەیوەندی بە (تبرج)ەوە هەیە :-

**یەکەم - التحرش :**

بریتییە لەدەست بۆبردن وگێچەڵ پێکردن وتوانج لێدانی ئافرەت٠لەپشت ئەمەش کۆمەڵێك هۆ کاروپاڵنەرهەیە کەوادەکات تاك ئەم ڕەفتارە ناشایستەیە بەرامبەربەڕەگەزی بەرامبەری ئەنجام بدات ، بەزۆریش تەحەرروش لەشوێنەگشتی وقەرەبالەغەکان ئەنجام دەدرێت٠

بەشێك لەخەڵکی هۆکاری ئەمەدەگەڕێننەوەبۆخەتای کچان کەجل وبەرگی نەگونجاووتەسك وتەنك و وروژێنەرلەبەردەکەن ، بەڕێژەیەکی کەم کچانی پۆشتەش ڕووبەڕووی (تحرش) دەبنەوە،(م)دەڵێ : من وەك کچێکی داپۆشراودەچمەدەرەوە ، بەڵام زۆرجارڕووبەڕووی (تحرش) بوومەتەوە منیش جنێووقسەی ناشیرینم بەوکەسانەوتووە کەتحرشیان پێکردووم٠دوکاندارێك دەڵێ : زۆرترین کاردانەوەی کچان وژنان ئەوەیەکەدەڵێن ((خۆت خوشك ودایکت نییە؟))٠(خ)دەڵێ:لەکۆلانێکی نزیك ماڵمان کوڕێك ویستی دەستم بۆبەرێ ، بەڵام من بەمەحفەزەکەم بەرگریم کردوکوڕەکەهەلات٠(د)دەڵێ : ڕۆژێك لەشەقامێك پیاوێك کەبەتەمەنیش بوودەستی هێنابۆم منیش کاردانەوەم هەبووپیاوەکەویستی ڕابکات ، بەڵام من توندەستی کابرام گرت نەمهێشت ڕابکات تاقەرەبالغی دروست بووخەڵکی ئەوناوە پیاوەکەیان دابەرشەق وجنێو٠(ك)دەڵێ : لەقەرەبالغی زۆرجاربەریەککەوتن دروست دەبێ ، بەڵام ئەگەربێ مەبەست بێ گوناهبارنابن٠ ئەم حالەتەزیاترلەڕۆژانی عارفەوبۆنەکاندایە کەخەڵك هەمووی بەیەکجاردەچێتەدەرەوەبۆشت کڕین٠(ك س)دەڵێ : ئەوئافرەتانەی بەدی وپانتۆڵی تەسك لەبەردەکەن ، بەدییەکانیان درێژنییە دەبێتەهۆکارێك بۆئەوەی کەڕەگەزی بەرابەریان تەعەرروشیان پێبکەن وئازاری دەروونییان بدەن٠لەڕووی کۆمەلایەتیشەوەزۆربەی خەڵکی لەسەرجل وبەرگ وڕووکەش بڕیارلەسەرکەسایەتیمان دەدەن بۆنموونەمامۆستایەکی زانکۆهەرچەندەبەڕێزیش بێ،بەڵام کەبەجل وبەرگێکی نەگونجاوچووەدەرەوەلەوانەیەڕووبەڕووی تەعەرروش بێتەوە ، وتراوەلەبەرتەشقەرەبووەئایەتی (٥٩)ی سوڕەتی (الاحزاب)دابەزیوە تاژنان دووربن لەئازاروگیروگرفت : (یأیهاالنبی قل لأزواجك وبناتك ونساءالمؤمنین یدنین علیهن من جلبیبهن ذلك أدنى أن یعرفن فلایؤذین وكان الله غفورارحیما) واتا :(ئەی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)بەهاوسەرانت وکچەکانت وئافرەتانی ئیمانداربڵێ : کەبەپۆشاکی باڵاپۆش خۆیان داپۆشن ئەوەلەبارترین شتەکەپێی بناسرێن ، تائازارنەدرێن و(توشی گیروگرفت نەبن) ، هەمیشەوبەردەوام خوا(جل جلاله)لێخۆشبوومیهرەبانە٠) کەواتەیەکێك لەهۆکارەکانی باڵاپۆشی بۆئەوەیەکەئافرەتان

دووربن لەتەشقەرەوئازاری دەروونی وگیروگرفت٠(ك) دەڵێ : ئەوكچانەی تەنورەیان لەبەردایە وفەتحەی پشتەوەوپێشەوەی هەیەڕان وسەرچۆكیان بەدەردەكەوێ زیاترتوانجیان لێدەدرێ ، بەلأم ئەوكچانەی تەنورەیان لەبەردایەهیچ شوێنێكیان دیارنییە وچەفیەیان لەسەرەكەمترتوانجیان لێدەدرێ٠(ز) دەڵێ : ئەوانەی تەنورەوپانتۆڵی زۆرتەسك لەبەردەكەن وسینگیان بەرەلأدەكەن زۆرترتوانجیان لێدەدرێ٠(ئا) دەڵێ : دیاردەی توانج لێدان ئێستابنبرنەكراوە بەزۆری كوڕان تەعلیق لەكچان دەدەن هۆیەكەشی دەگەڕێتەوەبۆئەوەی كەبەشێك لەكچان لاسایی جل وبەرگی ڕۆژئاوایی دەكەنەوە ، ئەمەش كاریگەری لەسەركوڕان دەبێ٠(ع) دەڵێ : بەزۆری كوڕان بەم كارەهەڵدەستن ، چارەسەریشی لای كچانە٠(ھ)دەڵێ : كوڕتیروتوانج لەكچ دەدات هۆكەی دەگەڕێتەوەبۆناڕۆشەنبیری٠زۆرجاریش كچان خۆیان بەنازدەكەن وخۆیان بادەدەن بۆیەئەم كارەڕوودەدات٠(س ت) دەڵێ : زیاترئەم دیاردەیەلای كوڕان بەدی دەكرێ هەرچەندەكچانیش خەتایان هەیەبۆنموونەلەبەركردنی جل وبەرگی شازیان كارێكی دوورلەداب ونەریتی كۆمەلأیەتی٠(س ف) دەڵێ : ئێوەببنەدادوەرمن ئافرەتێكم ئۆتۆمبیل لێدەخوڕم ئایاتاوانم چییە ، عەیبی تێدایەئەگەرشوفێربم ؟(س) دەڵێ : تەعلیق لێدان دیاردەیەكی دزێوی نێوكۆمەڵگاكەمانە ، لەئەنجامی نەبوونی ڕۆشنبیری لای هەندێ هەرزەكارسەرهەڵدەدات٠(ئە)دەڵێ : دیاردەی توانج كارێكی ناشیرینە سەبارەت بەتوانج لەئافرەت كارێكی زۆرنادروستە ، چونكە دەبێتە هۆی نانەوەی چەندین كێشەی كۆمەلأیەتی ، هۆكاری ئەم دیاردەیەش یان بۆبەسەربردنی كاتە یان لەبەرجوانی یان لەبەرجۆری پۆشاكەكەی یان شێوەی ڕۆیشتنی٠(ئا) دەڵێ : زۆرجارشوفێری تەكسی هەبووە هۆڕنی بۆلێداوم ، لەبەرئەوەی بەجۆرێك جل وبەرگم پۆشیووە٠(م) قوتابییە تەمەنی (١٧)ساڵە لەبارەی توانجەوەدەڵێ:ڕۆژێك دەڕۆیشتمە ماڵەوە لیڤیكسێكم پێبوووێنەیەكی هونەرمەندزەكەریای پێوەبوو كوڕێك پێی وتم : توخواوێنە یەكی من پێوەبكەی باشترنییە ؟ (ح) دەڵێ : زۆرلەكچان لەڕێگەی چوون بۆماڵەوە یان قوتابخانە یان شوێنی كارلەلایەن گەنجانی سەركێش جاری وایەبەدوایان دەكەون وتوانجیان لێ دەدەن نامە وژمارەی مۆبایلیان بۆفڕێ دەدەن نابێ وەلأمیان بدەنەوە بەردەوام بە لەڕۆیشتن وابزانەكەس بو ونی نییە ، خۆلەگێلی دان باشترین چارەسەرەبۆئەوگیروگرفتە، ئەگەرنامەی فڕێداهەڵی نەگریە وە ، چونكە ئەگەرهەستی كردتۆوەلأمی دەدەیتەوە وازت لێ ناهێنێت ، ئەگەرهەندێك لەدەستە خوشكەكانت وەلأمی ئەوكەسەسەركێشانەدەدەنەوە یان بۆیان پێدەكەنن وچاویان دەدەنێ تۆلە گەڵیان هاتووچۆمەكە ، تاپارێزگاری لەكەسایەتی خۆت بكەیت٠

دووەم - عەورەت :

عەورەت ئەوشوێنەیە داپۆشینی واجبە دیتنی حەرامە، سەبارەت بەئافرەت هەمووجەستەی عە ورەتە تەنهاهەردوودەست وڕووی نەبێ ، بەلأم سەبارەت بەپیاوبەینی ناوك وئەژنۆی ، بەلأم ئە وەش لەشوێنەگشتییەکان دەبێ بلێین عەیبە ، بەلأم نابێ بلێین حەرامە٠

عەورەت ئەوشوێنانە دەگرێتەوە ، کەلەڕووی ئاینییەوە دەرکەوتنیان حەرامە ، هەروەهاعەورەت واتا (عەیب) سەبارەت بەپیاووئافرەت ، بەلأم لەئافرەت دا مەوداکەی فراوانترە ، کەدەبێتەهۆی هاندانی ئارەزوو٠قورئانی پیرۆز لەم بارەیەوە دەفەرموێت : (أوالطفل الذین لم یظهرواعلی عورت النساء) النور : ٣١ واتا : (ئەومندالأنەی کەزۆربچووکن بەشێوەیەك کەعەورەتی ئافرەتان نازانن ونەناسن)٠هەندێ لەئافرەتان لەڕێگەوبان و پێش دەرگا و کوچەوکۆلأن وبازاڕ دا دامێنی تەنوڕەومەکسی وجلەکانیان هەڵدەکەن خەڵك شوێنی عەورەت وشوێنی ڕووت وسەرنڕا کێشیان دەبینێ ، ئەگەرئەوە بەنییەتی سەرنجڕاکێشانی پیاوان بێ یاخود وەکوخونەریتێك بێ ئەوە شتێکی حەرامەوعەیبە٠(ئە) دەڵێت : کەسێك کاتێك جەستەیەك دەبینێت ، ئەگەربەزارو قسەش بێت چێژی لێ وەردەگرێت٠

سێیەم - لاسایی کردنەوە :

(ل)دەڵێ : بۆیەپۆشاکی ئێرانی دەپۆشم بۆئەوەی لەکچە ئێرانییەکان بچم٠(چ)دەڵێ : ماوەی چەندساڵێکەئەم پۆشاکەئێرانییانەدەپۆشم جوانترین پۆشاکێکن کەلەژیانمداچاوم پێکەوتبێ ، ئاماژەبەوەش دەکات کەکچانی ولأتی ئێران زۆرجوان وسەرنج ڕاکێشن بۆئەوەی لەوان بچم بۆیەدەیانپۆشم٠(ك ) دەڵێ : لەهەمووی خراپترهەندێ لەکوڕان هەڵدەستن بەبەکارهێنانی جوانکاری ئافرەتان بۆخۆیان کەبەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ڕەگەزیان ناگونجێ لەوانەملوانکەی زێڕوزیولەملیان دەکەن کەبەهیچ شێوەیەك بۆکوڕان ناگونجێ هەروەهاهەندێکی ترلەولاوانەزنجیروبازن لەدەستیان دەکەن کەخۆم بەچاوی خۆم بینیومەپیاوڕوومەتی بەرزکردووە!!!هەتامکیاجیش بۆڕوخساریان بەکاردەینن هەروەهاتەنکەسوراوێکیش لەلێویان بریقەی دەداتەوە!هەموئەوانەبەسەروسیمای هەندێ لەکوڕانەوەدەبینرێت٠پێویستەئەم جۆرەلاوانەبەخۆیاندابچنەوە٠هەندێ لەکوڕان بۆخاتری ئەوەی حەزەکانی چەند کچێ سەرنجیان بۆلای خۆی پێ ڕابکێشێت ئەمەدەکەن٠(ش) دەڵێ : مۆدیلی ئێستا هەمووی لەسەتەلایت وەردەگیرێت ولاسایی کچ وگۆرانیبێژەکان دەکەنەوە٠(لاسایی کردنەوە لەبواری سیا سیش دا ، ئەگەرسەرنج بدەین زۆربەیان تەرجەمەی ناوی حیزبی هەندەرانن ، وەك : پارتی پا ڕێزگارانی بەڕیتانیا ، ٠٠٠هتد٠)

چوارەم - پێڵاوی پاژنەبەرز :

زورلەئافرەتان پێڵاوی پاژنەبەرزلەپێ دەکەن هەندێك جارناتوانن لەپێیان بکەن وپێیان بڕۆن لەتەسکییان ، پەندێکی کوردی هەیە دەڵێ : ((نەپێڵاوی تەنگ ، نەماڵی بەجەنگ))٠زۆرجارلە گەڵ ئەوەی بەرزن نوك باریکیشن ئەمەهێندەی ترئازاری پێیەکانیان دەدات وکێشە بۆ پەنجەکا نی پێ دروست دەکات ، چونکەپاژنەبەرزقاچی دەخلیسکێ لەبەرئەوەی پێڵاوەکانی ئێستانوکیان باریکە پەنجەکان پێکەوە دەنوسێنێ ئازاریان دەدات ، هەندێکیش قایشی پشتەوەیان نییە ئەما نەخراپترن بۆپێ ، چونکە پێیەکان زیاترکاردەکەن بۆئەوەی لەپێ دانەکەنێ ئەمەش زەرەربە ماسولکەکانی پێ دەگەیەنێ ، هەروەهاوادەکات پشتەوەت دەرپەڕێت بۆیەدەبێتە هۆی ڕاکێشانی مەیلی پیاو٠

خوای گەورەلەسورەتی نورئایەتی (٣١)دەفەرموێ : (ولايضربن بأرجلهن ليعلم مايخفين من زينتهن) واتا : (باپێکانیان نەدەن بەزەویدابەونیازەی جوانی وزینەتی پێیان پێی بزانرێ) زانایان دەڵێن لەسەردەمی نەفامی دا ژنان واباوبووخڕخاڵ ومت وموروویان دەکردەپێیان ، جاکاتێ بەڕێدادەڕۆیشتن پێیان بەزەویدادەداتاجوانی پێیان وخڕخاڵەکانیان دەرکەوێت٠لێرەداباسی پێڵاویش دێتەئاراوە جۆری پاژنەی پێڵاولەگەڵ ئەومەرامەدەروونییەیەکدەگرێتەوەکەتەنهابۆبلێندکردنی بەژن نییە ، چونکەزۆرجارژنەباڵابەرزەکانیش بەکاری دەینن کەڕاکێشانی سەرنجی پیاوانی بەدواوەیە لەڕێی تەقەی پێڵاوەکانیان٠ حەزکردن لەپێڵاوی پاژنەبەرزلای زۆربەی ئافرەتان بۆنیشاندانی باڵایانە ، هەروەهابۆجوانیش٠

(ڕ ز)دەڵێ : ڕووبەڕووی توانجی زۆردەبم بەهۆی کورتی باڵام بۆیەپێڵاوی پاژنەبەرزبەکاردەهێنم٠هەروەهادەڵێ : بەهۆی پێڵاوی پاژنەبەرزچەندین جارکەوتووم وتووشی ئازاربووم(ژ هـ )دەڵێ:بەشێکەلەجوانکاری٠ئاماژەبۆئەوەش دەکات ئەم جۆرەپێڵاوانەلەکاتی ڕۆیشتن زۆرسەرنج ڕاکێشەوسەرنجی پیاوان ڕادەکێشێ٠(ف)دەڵێ : زۆرڕقم لەپێڵاوی پاژنەبەرزە ، ئاسوودەم لەگەڵ ئەوپێڵاوەفلاتانە زۆرجوان وتەندروستن٠شارەزایانی بواری تەندروستیش ئاماژەبۆئەوەدەکەن کەپێڵاوی پاژنەبەرزمەترسی هەیەلەسەرتووشبوون بەئازاری پشت وجومگەکانی قاچ٠دکتۆر(م)پسپۆڕلەنەخۆشییەکانی ئێسك وجومگەکان دەڵێ : پێڵاوی پاژنەبەرزبەکارهێنانی لەماوەیەکی کەم هەست بەماندووبوون دەکەی٠

پێنجەم - عەدەسە(هاوێنەی جوانکاری) :

چاوەکان بەشێکی گرینگی جەستەن وخزمەتێکی گرینگ پێشکەش بەمرۆڤ دەکەن٠چاوئەرکی خوێندنەوەونوسین وپاسەوانی وچاودێری وناسینی شتەکان وچەندەهائەرکی دی بۆمرۆڤ ئەدا دەکەن٠هەمووئەندامێکی لەشی مرۆڤ ئیشێکی تایبەتی هەیە وەك : دەست وپێ ولووت وگوێ و ٠٠٠هتد ، بەلاَم ئیشی چاولەهەموویان گرینگترە٠

چاوبەگرینگترین ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ دەژمێردرێت هەرچاوە خۆشی وناخۆشی ژیانی پێدەبینین بۆیەپێویستەزۆرببپارێزین وئاگاداری بین٠(ش)دەڵێ : لەڕووی کاریگەری لەسەرتەندروستی ئەوەکاریگەرییەکی نێگەتیڤانەی هەیە هەربۆیەمن بەکاری ناهێنم٠(ع)دەڵێ : من بەشتێکی خراپی دەزانم مرۆڤ ڕەنگی چاوی خۆی سروشتی چۆن بێ ئەوەجوانە ، بەزۆری کچان بەکاری دەهێنن بۆهەڵخەڵەتاندن وسەرنجڕاکێشانی کوڕان ئەمەش دوای ئەوەی ئاشکرادەبێ ڕەنگی چاوی سروشتی خۆی نییە کاردانەوەی خراپی دەبێت لەسەردەروونی کوڕەکە٠

شەشەم - چاویلکە :

لەهەمووجیهانداچاویلکەبەکاردەهێنرێ٠هەندێ لەکچان چاویلکەلەچاودەکەن لەبەرئەوەی چاویان کزە ، هەندێکی تربۆئەوەی ناسك دیاربن ، هەندێکی ترتاچاویان ئازارنەخوات لەبەرهەتاو٠

حەوتەم - بۆنخۆشکردن :

بۆن ڕاکێشانی ئافرەت بۆلای پیاوبەهێزدەکات وپیاوڕادەکێشێت وکاریگەری لەسەرهەیە٠ بێگومان گوڵ لای هەموومرۆڤێك خۆشەویستەوکارێکی زۆردەکاتەسەرمرۆڤ بۆیەهەرلەکۆنەوە بایەخ بەگوڵ وگوڵزاردەدرێ بۆڕازاندنەوەی باخچەومالْ وشارەکەیان٠جوانترین شت مرۆڤ ئاشنایی لەگەڵ هەبێ گوڵە ، چونکەبۆنی گوڵ شادومانی دەبەخشێتەمرۆڤ٠لەکۆمەڵی کوردەواریش بەچاوێکی تایبەت سەیری گوڵ کراوە ، کورد دەڵێ : ((ئەگەرگوڵ نیت ، دڕکیش مەبە))٠زانایان دەڵێن گوڵ وبۆنی گوڵ یارمەتی پشووی مێشك دەدات ویارمەتی دڵ دەدات ودانانی مەرکانی گوڵ لەژووری نوستن یارمەتی بەختەوەری ژیانی خێزانی دەدات وگیروگرفتی کەم دەکاتەوە٠لەکوردەواریداناوی منداڵەکانیشیان بەگوڵ دەستنیشان دەکەن وەك : گولیزار ، گوڵشەن ، گوڵناز ، مینا ، شەوبۆ ، هێرۆ ، شلێر،٠٠٠هتد٠پێخەمبەر(درودی خوای لێ بێ)خۆبۆنخۆشکردنی ئافرەتانی لەکاتی چوونەدەرەوەحەرامکردووە ،

چونكەهۆكارێكەبۆسەرنجڕاكێشانی پیاوان٠هەروەهاپێویستەمرۆڤ بۆنێكی سوك وخۆش لەخۆی بدات ، چونكەبۆنەقورسەكان دەبنەمایەی چاوتێكچوون وسەرئێشەی بەرامبەر٠(ك) دەڵێ : هەرلەكۆنەوەگوڵ بۆدەربڕینی هەست بەكارهێنراوە ، گوڵ پێشكەش یەكێكی ئازیزدەكرێ یان بۆئاهەنگگێڕانی خێزانی سەیارەی پێ دەڕازێنرێتەوە٠"جبران خەلیل جبران" دەڵێ : ((دەتوانی گوڵێك لەژێرپێتاپان بكەیتەوە ، بەڵام مەحالەبتوانی بۆنەكەی لەناوبەری))٠یەكێك لەزاناناودارەكانی چین وتوویەتی : ((ئەگەردوونانت هەبوو ، یەكێكیان بفرۆشە بەپارەكەی گوڵێك بكڕە)) چونكە نانی یەكەم خواردەمەنییە بۆلەش ، بەڵام نانی دووەم خواردەمەنییە بۆگیان٠پەیمانگای لێكۆڵینەوەی گوڵ لە (شیكاغۆ) ڕایگەیاندووە ، كەوا گوڵی سووریاریدەی چالاكی لەش وهێمن كردنەوەی مێشك دەدات ودەبێتەهۆی چالاكی لێدانی دڵ٠بێجگەلەوەی كەواگوڵ خۆشی وجوانی دەبەخشێ بەمرۆڤ لەمەیدانی ئابوریشدا ڕەواجی هەیە لەزۆرشوێنی جیهاندا بازاڕی كڕین وفرۆشتنی گوڵ هەیە ، چ بەشێوەی تۆو یان شتڵ لەباخچەكاندایان چەپك٠ بەگشتی بۆن بەچەند جۆرێك بەرهەم دێت ، لەوانە : بۆنی ئاژەڵی : بۆنموونە بۆنی مسك ئەم جۆرە بۆنە لەلەشی ئاسك دایە ، بۆنی عەنبەریش ئەم جۆرە بۆنەش لەناوسكی نەهەنگی زۆرگەورە دایە٠دووەم : بۆنی ڕووەكی : ئەم جۆرە بۆنە لەئاوی گوڵ بەرهەم دێت لەوانە : گوڵی نێرگزوگوڵەباخ و٠٠٠هتد٠

هەشتەم - مكیاج :

گومان لەوەدانییەكەمكیاج بۆئافرەت جوانی پێدەبەخشێ ، كەهەندێك ئافرەت لەبەرئەومكیاجەی بەبەردەوامی لەخۆیان دەدەن تائێستانازانرێ شكل ودەم وچاوی خۆیان چۆنە؟!(د) دەڵێ : مكیاج فێڵێكەئافرەت پیاوی پێ لەخشتەدەبات٠ئافرەتێك دەڵێ : مكیاج ئەگەربتەوێ گەنجی پێ شێت بكەی ودڵیان بپێكی ! (ن) دەڵێ : مكیاج دەبێتەمایەی سەرنج ڕاكێشانی بەرامبەر ، من بەڕای خۆم پێم باشە تەنیائەوئافرەتانەی شوویان كردووە مكیاج بكەن ، ئەویش بەتەنیابۆپیاوەكانیان٠(ڕ ح) دەڵێ : ئێستازۆربەی كچان لەجوانكاری دەستكرددا ڕاستی دەم وچاویان نازانین واتاجوانی لەم سەردەمەداشاراوەیە٠

نۆیەم — دەنگ ناسككردنەوە :

پەروەردگاردەفەرموێ :(٠٠٠فلاتخضعن بالقول فيطمع الذي في قلبه مرض وقلن قولا معروفا) الاحزاب : ٣٢ واتا : (لەكاتی قسەكردن دا بەناسكی قسەمەكەن بۆئەوەی كەسانی دڵ نەخۆش تەماحتان تێ نەكەن باوتەكانیشتان وتەی چاك بێ)٠كچێك دەڵێت : لەڕێگای تەلەفۆنێك

گەنجێکم ناسی بۆپرسیاری ماڵێك تەلەفۆنی کردبوو پێم وت : ژمارەکە هەڵەیە دەنگم نەرم ونا سك کردەوە ، دەڵێت : پاش ئەوتەلەفۆنە چەند جارێکی ترتەلەفۆنی کردەوە پەیوەندی نێوانما ن وردەوردە پەرەی سەند لەسەرەتادا وای دەردەخست کەخۆشی دەوێم،دەیوت:ئامانجم پێکهێنا نی ژیانی هاوسەرییە لەگەڵتا لەکاتێکدا هێشتایەکترمان نەبینیبوو! لەرێگای نامەوتەلەفۆنەوە کاتێکمان دیاریکرد بۆیەکتربینین چەند جارێك بەنهێنی بێ پرسی ماڵەوە دەرۆیشتینە دەرەوە ئەوفەرموودەیە : (لایخلون رجل بأمرأة الا كان الشيطان ثالثهما) واتا : (کاتێك پیاوێك لە گەڵ ئافرەتێك بەتەنیادەبێت ئیللا شەیتان سێیەمیان دەبێت) دەڵێ : لای خانەوادەکەم درۆم د ەکرد دەمووت : لەگەڵ کچێکی هاوڕێم دەڕۆم کەخۆشم دەوێت٠دەیووت : دەقەیەك بێ تۆناژیم وناتوانم لێت دووربم ، چەندەهاجارپێکەوە وێنەمان گرت پاش بەسەرچوونی چوارساڵ لەپەیو ەندی نێوانمان داوای زینای لێکردم٠گوتی : گرینگ نییە ئەم کارە ئێستائەنجامی بدەین یان کا تێکی دی ، چونکە دەبیت بەخێزانم لەداهاتوودا٠گوتی : ئەگەرقایل نەبی لای هەمووخەڵك و خێزانەکەت ئابڕووت دەبەم ، وێنەکانت ، گفتوگۆکانت لەگەڵمدا بەتەلەفۆن هەمووم تۆمارکرد ووە ئابڕووی خۆت وبنەماڵەکەت لەژێردەستم دایە٠

لەمبارەیەوە نابینایەك ئاماژە بەکاریگەری دەنگ وبیستن دەکات ، کەبۆدروستبوونی دڵداری رۆڵێکی گرینگ دەبینێت ، دەڵێت : دڵداری لای چاوساغەکان لەرێگەی روخسارەوەدەبێت ، بەلآم نابیناکان لەرێگەی دەنگەوە رەگەزی بەرامبەریان خۆش دەوێت زۆرجارئەگەردەنگەکە ناسك بێت ئێمەی نابینا هەست بەجوانی ئەوکەسەدەکەین٠هەروەها (ح) دەڵێت : ئەگەرنابینادەنگێکی ناسکی گوێ لێبێت وێنەی کچێکی جوان دەکێشێت ، هەروەها دەڵێت تێکچوونی روخساریان لەدەستدانی ئەندامێکی جەستە کارناکاتە سەرخۆشەویستی نابیناکان٠(ز) دەڵێ : دەنگ گەورەترین رۆڵی لەدروستکردنی خۆشەویستی هەیەلای نابیناکان ، بەجۆرێك بەهۆی دەنگەوە راستەوخۆ وێنەیەکی خەیاڵی ئەوکەسە بۆخۆی دروست دەکات ، دەنگ دەتوانێت هەست وسۆزبۆمرۆڤ دروست بکات٠

دەیەم - جانتا :

جانتایەکێکەلەوکەرەسەسەرەکییانەی کەهەمیشەهاوەڵی ئافرەتە ، بەلآم زۆرجارئافرەت وەکوکە رەستەیەك بۆجوانکاری ورازاندنەوە هەڵی دەگرێت٠جانتاش بەچەندین شێوازهەڵدەگیرێت ، هە ندێکیان دەخرێنەبن باڵ بەشێکی دیکەش بەدەست وجۆرێکی دیکەشیان قایشەکەی لەسەرشانە کانەوە دەبەسترێ جانتاکەش دەکەوێتەسەرکەمەرئەم شێوازانەش دیمەنێکی جوانی دەبێت٠(ئە) دەڵێ : هەڵگرتنی جانتاجیاوازی نێوان کچان وکوڕانە ، کەبێ جانتادێمەدەرەوە وادەزانم شتێکم

لێ کەمبۆتەوە٠(جانتاهەیە تۆئیشت پێیە ، جانتاش هەیەبۆجوانییە)٠

دووەم — قسەی زبر :

قسەزۆرگرینگە ، قسەش بەلگەیەلەسەرکەسایەتی مرۆڤ ، هەروەهاوتراوە : زمان بەلای سەرە ، ڕاگەیاندن قسەیە ، نوسین وکتێب قسەیە ، فیلم ونمایش قسەیە ، قسەمالّی خەلّکی پێ ئاوەدان دەکەیەوە لەهەمان کاتدامالّی خەلّکی پێ وێران دەکرێ ، لەبەرئەوەقسەزۆربەهادارەوسوودی زۆرە ، زۆریش ترسناکەوزیانی زۆرە،دەمەقالێ قسەیە،قسەش لەوشەپێکدێ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((الكلمة الطيبة صدقة)) واتا : ((وشەیەکی خۆش سەدەقەیە)) ، قسەهێنان وبردن ، جنێودان ، گالّتەپێکردن،هەمووی قسەیە٠هەندێك جارئافرەت جنێوبەمێردەکەی دەدات ، هەندێ جاریش مندالّ جنێوبەدایك وباوکی دەدات ، جنێودان بەهەرکەس هیچ لەکەسەکەمناکاتەوە ، بەلّکوجنێودەرەکەپێدەشکێ٠(ئە) دەلّێ : کاتێك کەسێکی بەرامبەربەهەرقسەیەك دلّت دەرەنجێنێ وکەیفی دێت ئەم کردەوانەکاری مرۆڤی ڕۆشەنبیرنین ، بەلّکوکاری مرۆڤی جاهیلن٠

ئەبوذەرو بیلال (خوایان لێ ڕازیبێ) دەمەقالێیەك لەنێوانیاندادروستبوو ، ئەبوذەربەبیلالی وت : (کوڕی دایك ڕەشەکە) بیلال چووەخزمەت پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) شکایەتی لەئەبوذەرکرد ، ئەبوذەردەلّێ : گەیشتمەخزمەت پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) زۆرلێم توڕەبوو ، فەرمووی : (انك امرؤ فيك جاهلية)واتا:(تۆپیاوێکی هێشتاجالیەتت تێداماوە)ئەم فەرموودەیەبەلّگەیەلەسەرئەوەی جنێودان کاری جاهلیەتە)٠(وعبادالرحمن الذين يمشون على الأرظ هونا واذاخاطبهم الجاهلون قالواسلاما) الفرقان : ٦٣ واتا : (بەندەکانی خوابەنەرمی دەڕۆن لەسەرزەوی ئەگەرمرۆڤی نەزان قسەیان لەگەلّ کردن (بەنەزانی ونەفامی) بەنەرمی وسەلام وەلاّمیان دەدەنەوە)٠بۆنموونە ، ئەگەرکەسێك توڕەبووهاواری کردەسەرت تۆنابێ هەلّچی ، چونکەکەسایەتی تۆش دەبێتەکەسایەتییەکی هەلّچوو ، بەلّکودەبێ کۆنترۆلّی بارەکەبکەی بەنەرمی٠بێگومان یەکێك لەسیفەت وڕەوشتی بەرزی مرۆڤ زمان شیرینییە ، ئەم سیفەتەش بۆماوەیی نییە ، بەلّکولەئەنجامی پەروەردەولاسایی کردنەوەی دایك وباوك وهاوڕێ وقوتابخانەفێری دەبێ٠بەگالّتەکورد نەی وتووە : ((بەقسەی خۆش مارلەکون دێتەدەرەوە)) ، بەلاّم بەداخەوەزۆربەی جارئەم یاسایەپێشێل دەکرێ ، لەجیاتی قسەی خۆش قسەی زبروڕەق بەکاردەهێنرێ٠لەبواری بازرگانیدا لەفرۆشیارێکی عەرەبانە هەتادەگاتەبازرگانی کۆمپانیاگەورەکان هەموویان پێویستییان بەزمانی شیرین وڕووخۆشی هەیە لەزانکۆکانی ئەمریکابڕوانامەی ماستەرودکتۆرالەبواری چۆنییەتی مامەلّەکردن وڕاکێشانی کڕیاردەدرێ

بەقوتابی خوێندنی باڵابەشی کارگێڕی (اداره الاعمال)٠بێگومان ڕووخۆشی وزمان شیرینی مەرجی سەرەکی سەرکەوتن وپێشکەوتنی بازرگانییە٠ئەم مەسەلەیەئێستابەشێوەیەکەلەمۆڵەکان پەیڕەودەکرێ ، بۆئەوەی جارێکی ترکڕیاربێتەوەلایان٠(ز پ) دەڵێ : لەساڵانی شەستەکان لەئەمریکا دەم خوێند ڕۆژێك چووم بۆکۆگای خواردەمەنی شوتییەکم کڕی لەگەڵ گەلێك شتی تر٠

لەماڵەوەشوتییەکەمان شکاند سپی دەرچوو ، ڕۆژی دواترچووم بۆکۆگاکەبەخاوەن کۆگاکەم وت : شوتییەکەم سپی دەرچوو٠گوتی : بۆچی نەتهێنایەوە پارەکەت وەرگرییەوە؟!!منیش گوتم چۆن دەبێ شووتی بشکێنی ، بیبەیەوەماڵێ لێی خورابێ بیگەڕێنیتەوە؟!!گوتی : ئێستابڕۆشوتییەکەت بهێنەوەوپارەکەت وەرگرەوە٠کێ لێرەبیستوویەتی شوتی بکڕی بیبەیەوەماڵەوە لێشی بخۆی پاشان بیگەڕێنیتەوەوپارەکەت وەرگریەوە؟ بەم جۆرەمەعمیل وکڕیار ڕادەکێشرێن وقازانج زیاددەکات ، هەروەهادەڵێ : هاوڕێیەکم بۆی گێڕامەوە لەزانکۆی بەغداقوتابی بووم باری ئابوریم زۆرخراپ بوو جلەکانم کۆن بوون وپێڵاوەکانم دڕابوون ، ڕۆژێك لەڕۆژان بەشەقامێك پیاسەم دەکرد گەیشتمەلای میوەفرۆشان هەرواگوتم بزانم کیلۆی سێوبەچەندییە ؟ گوتی پرسیارم کرد ، بەڵام خاوەن دوکانەکەسەیری جلەکانمی کرد هیچی نەگووت ، منیش هەرچاوەڕێی وەڵام بووم ، کەچی ڕووی کردەمن وگوتی : بڕۆکوڕم ئەوەخواردنی تۆنییە!!! ئایائەگەرخاوەن دوکانەکەبەئەخلاق بوایە بیوتبایەکیلۆی سێوبەهەزاردیناره ئایاچی لێ کەم دەبۆوە؟ بەڵام بێ پەروەردەیی دوکاندارەکەوئەمجۆرەنەفامی وئاخاوتنەی بەدەمەوەبوو٠هەروەهازۆرجارفەرمانبەرێك خۆی بەکەسایەتییەکی زۆرگرینگ دەزانێ بەزمانێکی ناخۆش پێشوازی لەمراجع دەکەن هەروەڵامی پرسیارنادەنەوە بەرامبەربەهاوڵاتیان کەئیشیان کەوتۆتەبەردەست پێویستەمراجع تێبگەیەنرێ بۆچی کارەکەی بۆنەکرا٠هەندێ دەستەواژەی ترسناك هەیەمرۆڤ لەژیانی ڕۆژانەی بەکاری دەهێنێت وەکو : دە ستەواژەی (تۆتێناگەی ؟) ئەم دەستەواژەیە دەبێتەهۆی توڕەبوونی بەرامبەرەکەت٠هەروەهادە ستەواژەی هەرچییەك بێ٠ئەم ڕستەیەش سیمایەکی دژواری هەیە٠

سێیەم – دەمارگیری :

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (من قاتل تحت راية عمية ، يدعواالى عصبية ، أويغضب لعصبية فقتتلت جاهلية) رواه ابن ماجه واتا : ( هەرکەسێك جەنگ بکات لەژێرئاڵایەکی کوێرانەوداوای کۆبوونەوەلەخزمەکانی بکات بۆجەنگ کردن لەبەردەمارگیری ، یان توڕەیی وهەڵبچێت بۆسەرخستنی خزمەکان (بێ ئەوەی بۆی ڕوون بێتەوەئایاخزمەکەی

ڕاستەیان نا؟) ئەگەربکوژرێ ، ئەوابەکوژرانێکی نەفامی کوژراوە٠) عن بنت واثلة بن الاسقع أنهاسمعت أباها يقول : قلت : يارسول الله (صلى الله عليه وسلم) ماالعصبية؟ قال : أن تعين قومك على الظلم) رواه أبوداود **واتا : لەکچی واسیلەی کوڕی ئەلئەسقەعەوە هاتووە گوێی لەباوکی بووە ، گوتی : گوتم : ئەی پێخەمبەری خوا(درودی خوای لەسەربێ) دەمارگیری چییە ؟ فەرمووی : دەمارگیری ئەوەیە یارمەتی خزمەکانت بدەی لەسەرزوڵم وستەم٠)**

**خۆراك :**

**خواردن سەرچاوەی وزەوژیان وگەشەکردنی هەمووزیندەوەرێك ومرۆڤە٠**

**خواردن یەکێکەلەپێویستییەهەرەگرینگەکانی لەش ، خواردن وادەکات ژیان بەردەوام بێ ئەگەروازی لێ هێنرائەومرۆڤەدەمرێ٠دڵبردنەخواردنیش تاڕاددەیەکی زۆرلەسەرباری دەروونی وەستاوە ، چونکەمرۆڤ کەبەهۆی شتێکەوەتووشی خەم وخەفەت بووئیدی دڵی هیچ نابات٠هەمووخواردنێکیش دیوێکی مەعنەوی هەیە٠**

**بێگومان لەوکاتەوەی مرۆڤ هاتۆتەسەرزەوی نانی خواردووەوگەنمی چاندووە٠هەرچەندەلەجیهانداچەندەهاجۆرنان دروست دەکرێت ، بەڵام زۆربەیان کەم سوودن بۆتەندروستی مرۆڤ ، چونکەئاردەکەی دەبێژن وکەپەکەکەی فرێ دەدەن٠بێگومان کەپەکی ئاردگەلێك بەسوودەبۆتەندروستی مرۆڤ ، چونکەدەوڵەمەندەبەڤیتامین وخوێیەپێویستەکان٠بەڕاستی نان خواردنێکی سەرەکییە زۆرنزیکەلەخواردەمەنی تەواو واتامرۆڤ دەتوانێت بەتەنهالەسەرنان بژی بەشێوەیەکی دروست تاماوەیەکی زۆر ، چونکەنان ڕێژەیەکی زۆرچەوری وڤیتامینەکان وکاربۆهیدرات وپرۆتینی تێدایە٠دەبینین سەموونی بازاڕ سپی وجوانە، بەڵام کەم سوودەبۆتەندروستی هەرچی نانی ماڵانە ڕەنگی بۆرەوبەلەزەت نییەوەکوسەموونی بازاڕ ، بەڵام بەسوودترەبۆتەندروستی٠مرۆڤ بەبێ خۆراك ناتوانێت بژی لەکاتی خواردن دیمەنی جوانی خۆراکەکەوڕازانەوەی لەسەرسفرەسەرنجمان ڕادەکێشێت٠(ن ك) دەڵێ : بیرلەدیمەنی جوانی سەرنجڕاکێشی خواردنەکەدەکەمەوە٠(س) دەڵێ : شتێکی چاکەبیرلەسودوزیانەکانی خواردن بکەینەوە٠(ڕ) دەڵێ : بیرلەخواردنی خۆش وبەتام وسەرنجڕاکێش دەکەمەوە٠(ه) دەڵێ : بیرلەلایەنی تەندروستی دەکەمەوە٠دکتۆر(نا) دەڵێ : خوێ ناتوانرێ لەخۆراك لابدرێ ، چونکە خوێ بۆگیانی مرۆڤ زۆرزەڕووری وپێویستە ، هەروەهالەگەڵ ئەوەدانیم نان لەخۆراك لابدرێ ، چونکە نان بناغەی کاربۆهیدراتە ، کاربۆهیدراتیش سەرچاوەی دروستکردنی هێزوکالۆری مرۆڤن جیالەوەش هیندێك جۆری ڤیتامین هەیە لەناونان داهەن کەپێویستمان پێی هەیە ، هەروەهاپێموایە خواردنەوەی**

شیرشتێکی زەرووری وپێویستە وزۆرسوودی هەیە ، ئەگەریەك گلاس شیر هەموورۆژێك بخورێتەوە ، شیر پڕ پرۆتین وکالسیۆم وخوێیەکانی مەعدەنی وڤیتامینی جۆراوجۆرە ، هەروەها چەوریش خاوەن گرینگییەکی تایبەتییە لەکارەکانی پێویستی لەشی مرۆڤ ، بەلاَم دەبێ رۆنی داغکراونەبێ ، هەروەهازۆرلەوکەسانەی ڕیژیم دەکەن دەرمانەکانی ئیشتیهابەر وەردەگرن ، کاری ئەم دەرمانانە زیاترلەوەی ئیشتیها ناهێلێ مرۆڤ بێ هێز دەکات وپالەپەستۆی خوێن بەرزدەکاتەوە وترپەی دلْ توندوزیاددەکات٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێ : ((خودی خۆت مافی بەسەرتەوەهەیە))هەروەهادەفەرمووێ : ((جەستەت مافی بەسەرتەوە هەیە)) یەکێ لەمافەکانی جەستەئەوەیە بیرلەلایەنی تەندروستی بکەینەوە لەمەسەلەی خواردن٠لەهەندێ خۆراك دەنوسرێ مەوادی حافزەی تێدانییە ئەی باشە ئەومادده خۆراکییە چی دەیپارێزێ ؟ ئەومادده پارێزگارانە ڕاستە خۆراکەکە بۆماوەیەکی درێژبەبێ بۆگە نبوون دەهێلێتەوە ، بەلاَم بەیەکێك لەهۆکارەکانی دروستبوونی شێرپەنجە دادەنرێت ، ئەوەسە بارەت بەخۆراکی لەقوتوونراو ، سەبارەت بەسەوزەومیوەش ئەومیوەیەی هاوردە دەکرێت هەمو وی بەپەینی کیمیاوی وپیشەسازی گەورەکراون نەك بەرێگای سروشتی٠ئەوەی لەبواری پزیشکی زانراوە ئەوجۆرە ماددەکیمیاوییانە هۆیەکن لەهۆیەکانی توشبوون بەنەخۆشی شێرپەنجە٠هەرو ەهابەپێی توێژینەوەیەك هۆیەکەلەهۆیەکانی دابەزینی تێکڕای تەمەنیش (معدل العمر)٠

### ئافاتی خۆشەویستی ودلْداری :

ئێمەی مرۆڤ پێش هەمووشتێك دەبێ خۆشەویستیمان هەبێ لەدلْدا ، تۆئەگەرخۆشەویستیت بۆ کارەکەت نەبوو ناتوانی سەرکەوی ، قوتابی ئەگەر خۆشەویستی بۆخوێندنەکەی نەبوو ناتوانی سەرکەوی ، کەواتە هیچ شتێك بەبێ خۆشەویستی نابێت وسەرکەوتوونابێت٠

لەکۆمەلگای ئێمەدا بەهۆی نزمی ئاستی ڕۆشنبیری تێگەیشتنمان بۆزۆرمەسەلەی ژیانی کۆمەلاَیەتی شێواوە ، کەیەکێك لەومەسەلانە خۆشەویستییە ، کەتێکەلْ بەحەزلێکردن کراوە بەجۆرێك هەردووکیان بەیەك واتا بەکاردەینن وجیاوازی نابینن لەنێوانیان دا ئەمە واقیعی ئەمرۆی ژیانمانە سەبارەت بەکوڕوکچ ، کەتەنیا حەزلێکردنەلەنێوان کچ وکوڕدا سەرچاوەکەشی برسییەتییە بۆ(جنس)٠خۆشەویستی واتا مالْ وسامان ببەخشی٠خۆشەویستی واتا دلْی خەلکان خۆش بکەی٠دلْداری یان ئەوین وەك غەریزەیەکی بایۆلۆجی نێرومێ بەرامبەربەیەکتری دەری دەبرن٠دلْداری لەمێژووی مرۆڤایەتی دا هەردەم کێشەیەکی گەورەبووە ، ڕۆژانە بەدەیان کارەسات بەهۆی ئەم دیاردە دزێوە ڕوودەدەن٠کۆمەلْی کودرەواریش وەك هەرکۆمەلێکی ترخالْی نەبووە لەم دیاردەیە٠لەگەلْ سەرەتای دروستکردنی گیانلەبەر ، سۆزوخۆشەویستی دروستبووە

زۆرجارتەنهاوشەیەك خۆشەویستی لەناودەبات ، بەلاٌم ئەوخۆشەویستییەی لەناوناچێت خۆشەویستی دایك وباوكەبۆرِۆڵەكانی٠(ش) دەڵێ : بروام بەوەنییەپێش پرۆسەی هاوسەرگیری پەیوەندی لەگەڵ هیچ كورِێك ببەستم ، بەڵكوبەهەڵەیەكی گەورەی دەزانم٠گۆڤاری تاوی كۆمەلاٌیەتی بلاٌویكردۆتەوە لەگەرِەكی ( )كورِێك شەوخۆشەویستەكەی ئاگاداری دەكاتەوەكەكەس لەئەندامانی خانەوادەكەی لەماڵ نییەئەویش دەچێتەماڵی كچەكەلەپرِباوكی كچەكەدەگەرِێتەوەماڵ ، پاش ئەوەی دەیبینێت كەلەگەڵ كچەكەی لەماڵی خۆی قسەدەكات دەست بەجێ بەدەمانچەچەندفیشەكێكی ئاراستەدەكات وبەهۆیەوەدووگوللەی بەرسكی دەكەوێت وبەسەختی برینداردەبێت پاشان بەبریندارى تەسلیمی پۆلیسی دەكەن٠(س ح) دەڵێ : من ئامۆژگاریتان دەكەم هەركورِێك داوای پەیوەندی كرد ، چاكوایەرِێگای ماڵی نیشانبدەن ئەگەربیانووی هێنایەوەئەوەبزانە ٩٥ ٪ درۆدەكات٠(ف)دەڵێ : هەندێك لەگەنجان كەخۆشەویستی دەكەن ، خۆشەویستەكانیان دەبەنەدەرەوەی شاروكاتێك بێئەخلاقییان لەگەڵ دەكەن وێنەیان دەگرن وبلاٌوی دەكەنەوە ، دەرەنجامی ئەمەش زیادبوونی رِێژەی كوشتنە٠(ش)دەڵێ : زۆرینەی پەیوەندییەكان لەسەربنەمای هیچ وبێ بنەمان٠كورِێك داوای پەیوەندی لێكردم وەعدی ژیانی هاوسەری پێدام دوای ماوەیەكی كورت كەوتەبرِوبیانوودواجارگوتی ناتوانم بتخوازم ، چونكەدەچم بۆهەندەران٠هەربۆیەدەڵێم برِوام بەخۆشەویستی نەماوەودووبارەی ناكەمەوە٠

(س ه)ئاماژەبەوەدەكات زۆرجارئەگەركورِەكەش بچێتەخوازبینی ماڵەوەیان لەبەرئەوەی پەیوەندییان هەیەرِازی نابن٠(ب) دەڵێ : خۆشەویستی سەرەرِای گوناه وتاوان چەندین كەسی لەسەردەكوژرێت وئاژاوەودوژمنداری لێ پەیدادەبێت٠(م) دەڵێ : كرداری خۆشەویستی لەنێوان كچان وكورِان دەبێتەمایەی بێشەرعی وبەرپابونی چەندان رِوداووكارەساتی دڵتەزێن ، بۆنموونەئەگەرلەپاركێك كچ وكورِێك لەپەنایەك كۆببنەوە بەتەنیائەوادروست نییەتەنانەت لەكاتی خوازبینیشدا كەدروستەپیاووئافرەتەكەسەیری یەكتربكەن دروست نییەبەبێ مەحرەم لەگەڵ یەكتریداكۆببنەوە٠قورئانی پیرۆزئەمرتان پێدەكات بەنەبەستنی پەیوەندی ناشەرعی : (ولامتخذات أخدان) النساء : ٢٥ واتا : (بەنهێنی دۆست وياری نێرینەتان نەبێت)٠(س) دەڵێ : ئاخركەسێك كەسێكی خۆشبوێ هەستی خۆی وادەردەبرِێ لەسەردیوارشتی بۆبنوسێ٠(م) دەڵێ : ئەونوسینانەبوونەتەمایەی كێشەبۆهەندێ كچان٠(ع) دەڵێ : ئەگەررِاستگۆیی لەمەسەلەی خۆشەویستی دا هەیە ، ئەم پەیوەندییە چارەنوسی چییە ؟ ئەگەركۆتایی پەیوەندییەكە ژیانی هاوسەرییە بالەسەرەتاوە كورِەكە بیخوازێ ئەوجا خوادەیكرد دەبوونە (شیرن وفەرهاد) ئەوكات

پیرۆزیان بێ ودەستیان خۆشبێ.(م) دەڵێ : پەیوەندی خۆشەویستی ڕابردووی ئافرەت لەکەداردەکات ، ئایاچ مرۆڤێك ئامادەیە کچێك ڕابردووی خراپ بێت بیکاتە هاوسەری ؟
بێگومان هەرکوڕوکچێك پەیوەندی دەبەستن لەڕووی ئاینییەوە ناشەرعییە زۆرجاریش سنووردەشکێنن دەگاتە ئەوشوێنەی یەکتری لەباوەش بگرن ویەکتری ماچ بکەن ئەمەش بێ ئەخلاقی وبێ ناموسییە.زۆرجاریش ئەم پەیوەندییە کۆتایی پێدێ وناگاتەزەواجیش وشووبەیەکێکی تردەکات.(ب) دەڵێ : یەك لەئافاتەکانی خۆشەویستی ئەوەیە هیچ کاتێك نەما نبیستووە بڵێن فلاَنەکەس دوای لەدەستدانی باوك یان دایك شێتبووەیان خۆی کوشتووە یان تە رکی دنیای کردووە ، بەلاَم زۆرجاربیستوومانە لەمێژووش وەکوبەڵگەهەیە ، کەفلاَن کەس خۆ ی کوشت یان تەرکی دنیای کرد یان شێت بوو خۆشەویستییەك ببێتەهۆی لەدەستدانی ژیان یا نی چی ؟ (ل) کچێکەدەڵێ : ماوەی سێ ساڵ کوڕێکم خۆشویست بەناوی (ئا) ڕۆژێك چووینەدە رەوە بۆئەوەی لەبارەی هاوسەرگیری بدوێین ، چووین بۆ(ئەزمر) چووینە شوێنێکی چۆڵ دوای ئەوەی هەندێك بیروڕامان گۆڕییەوە وبەمەرجەکانی یەکترڕازی بووین ،دواتر(ئا)داوای ماچێکی لێکردم منیش وتم : نابێت.وتی : تۆتازەهاوسەری منیت دەبێت لەگەڵم دابیت ، هەڵی خەڵەتا ندم وبەوشێوەیەخۆم دۆڕاند.دوای ئەوەی دەستم کردبەگریان و وتم : چی بکەین ؟ ئەویش ز ۆرپەشۆکابوو وتی : دەبێت کەس نەزانێت تاوەکوڕێگاچارەیەك دەدۆزمەوە بۆت.وتم : ڕێگاچا رەی چی دەبێت هاوسەرگیریم لەگەڵدابکەیت.وتی : من تۆناهێنم ئەمەت لەگەڵ من کردووە دەبێت لەگەڵ چەندکوڕی تردا بەم شێوەیەڕاتبواردبێت.ئیدی من ژیانم لێ بووبەدۆزەخ ، (ل) دەڵێ : ئامۆژگاریم بۆهەمووکچان ئەوەیە کەبەقسەی باق وبریقی کوڕان تێنەکەون ، چونکە تاوەکوخۆت تەسلیمیان دەکەیت ڕێزت لێ دەگرن ، کەخۆت تەسلیمیان کردبەهیچ شێوەیەك ڕ ێزت لێ ناگرن.(ت) دەڵێ : پێکەوەگەڕان وپیاسەکردن لەئاینی ئیسلام دروست نییە ، ئەگەرلە یەکتری مارەنەکرابن ونەبووبنە حەلالی یەکتری (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (ئە گەرسوژنێکی ئاسن بکرێت بەسەریەکێکتان دا باشترە لەوەی دەستبدات لەئافرەتێکی نامەحرەم) ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەرحەرامبوونی خۆشەویستی وەك دەستخستنەناودەستی یەکتری ودەستبازی.هەروەهائەوانەی دەڵێن : ئەم خۆشەویستییە بۆژنهێنانە ، ژنهێنان بۆبەم ڕێگایە؟ بۆناچنەلای کەس وکاری تاکوکچەکە مارەبکا وببنەحەلالی یەکتری ؟
(ئا) دەڵێ : بەهیچ جۆرێك ئافرەتێك ناهێنم ئەگەربزانم پەیوەندی خۆشەویستی ڕابردووی هە بووە ، چونکەپیاوشانازی بەکەرامەت وڕابردووی خۆی دەکات. لەساڵی (٢٠٠٠) لەگەڕەکی (     ) شاری هەولێر دووبنەماڵە لەسەرئاشکرابوونی پەیوەندی دڵداری نێوان کچێك وکوڕێکی هەردوو بنەماڵەکە دەبێتە شەڕیان لەئەنجام دا برایەکی کچەکە دەکوژرێ وبرایەکی تریشی برینداردەبێ

، هەروەهابرایەکی کوڕەکەش بریندارده‌بێ ، ناسیاوێکیش دەکوژرێ٠

**لەبارەی هاوسەرگیری وژیانی خێزانی :**

هەرلەگەڵ سەرهەڵدانی مرۆڤ ومرۆڤایەتی ئەوەسونەتی ژیانەهەمووکوڕێك دەبێ ژن بێنێ وهەمووکچێکیش دەبێ شووبکات٠(ك) دەڵێ : بێگومان ژنهێنان وشوکردن سوننەتی ژیانەزۆربەی خەڵك پێی هەڵدەستێت هەمووکەسێکیش لەم تاقیکردنەوەیەسەرکەوتوونابێت بەبڕوای من سەرکەوتن وسەرنەکەوتن لەژیانی هاوسەریدا لەسەر هۆکاروەستاوە٠(ش) دەڵێ : کەفائەزۆرگرینگە ، ئەوکوڕەی بەنیازی هاوسەرگیرییە ئایائاستی بژێوی ژیانی چۆنە؟ بڕوانامەی چییە؟ بۆچوونەکانی چۆنە؟ هەوڵ بدات ئافرەتێکی لەئاست خۆی بدۆزێتەوە ئەگەرلەسەداسەدیش یەك نەبن ، لەسەداحەفتاکەفائەلەنێوانیانداهەبێ٠(ھ)دەڵێ : حەزدەکەم کوڕەکەدڵپیس نەبێت وڕەزیل نەبێ ولەکاتی خۆی بگەڕێتەوەماڵەوە٠(ك)دەڵێ:ئاستی ڕۆشەنبیری وەك خۆم بێ ، چونکەئەگەرژن ومێردبیرکردنەوەیان وەك یەك نەبووکێشەی کۆمەڵایەتی لێ دەکەوێتەوە٠(خ) دەڵێ : حەزدەکەم ڕەوشتێکی بەرزومرۆڤێکی ئاینپەروەروکراوەبێت٠(س)دەڵێ : حەزدەکەم هاوبیروهاوتەمەن بین٠(ش)دەڵێ: لەسەردەمی ئێستاکەپیاووئافرەت ژیانی هاوسەری پێکدەینن وشەی قەفەزبەکاردەینن لەڕادیۆوتەلەفزیۆنەکان٠ئێمەدەزانین وشەی قەفەزبۆسجنکردن بەکاردێ بۆمرۆڤ یان باڵندە واتاقەفەزبۆئازاردان بەکاردێ من هیوادارم لەجیاتی دەستەواژەی قەفەزی زێڕین دونیای زێڕین بەکاربهێندرێت٠(ب ك) لەبارەی درێژبوونەوەی ماوەی دەستگیرانداری دەڵێ : ماوەی درێژبوونەوەی دەستگیرانداری زۆرجارسەرکەوتوونەبووە٠(ش ئە با)دەڵێ : ئەم گەنجانەی کەدەچنەهەندەران هاوسەرگیری لەگەڵ ئەهلی کتاب وەك جولەکەودیان دەکەن دروستە ، بەڵام ئەوژنانەی کەموشریکن وەك ژنانی یابان وکۆری وسینی کەئەهلی کتاب نین هەروەهاهیندی کەزۆربەیان سیخن گرێبەستی هاوسەرگیرییان بەهیچ جۆرێك دروست نییە هەتانەبنەموسوڵمان٠هەروەهاهەندێ لەزانایان بۆچونیان وایە ئەگەرچی هاوسەرایەتی ئەهلی کتاب دروستە ، بەڵام مەکرۆهە واتاپەسندنییە ونەکرێ باشترە ، بەڵام بەهەرجۆرێك بێ بەنسبەت ئەهلی کتاب زانایان چەندمەرجێکیان داناوە لەوانەدەبێ ئەوژنەی ئەهلی کتاب کەموسوڵمان دەیەوێ هاوسەرگیری لەگەڵ بکات داوێن پاك بێ ، چونکەلەوسەردەمەداژنانی وڵاتانی ڕۆژئاوازۆرینەیان زیناکەروداوێنپیسن لەگەڵ کوڕانی تریان بواردووە ، بەڵام ئەوانەی لەناوموسوڵمانان دەژین زۆرینەیان زیناکەروداوێن پیس نین٠(م ع م) دەڵێ : لەکۆتایی سەدەی

ڕابردووهاوسەرگیری (مسیار) لەسعودیەوئیماڕاتی عەرەبی هاتەکایەوە ئەمەش لەترسی هاوسەرەکانیان نەیان دەتوتنی ژنی تربێنن بۆیەپەنایان بۆئەم جۆرەهاوسەرگیرییەبرد ، وەهیندێکی تربازرگان بوون بۆکاری کڕین وفرۆشتن ڕوویان لەدەرەوەدەکرد ماوەیەك لەوڵاتان دەمانەوە لەماڵ وهاوسەرەکانیان دووردەکەوتنەوە ئیدی هەرلەم وڵاتانەئەم جۆرەهاوسەرگیرییەیان دابین دەکرد کاتێ بۆوڵاتی خۆشیان دەگەڕانەوەجێیان دەهێشتن بەدوایی٠یەکێك لەمەرجەکانی ئەم جۆرەهاوسەرگیرییە نەفەقەلەئارادانییە تەنیابۆسەرجێیی کردنەوهیچی تر ، خاڵێکی ترپیاوەکەئافرەتەکەناباتەوەماڵی خۆی ، چونکەئەگەربیباتەوەهاوسەرەکەی قبول ناکات وکێشەدروست دەبێت٠سەبارەت بەوەی کەجێگاوڕێگای ئافرەتەکەلەکوێ دەبێت ؟ ئەگەربلێین پیاوەکەدەوڵەمەندەوجێگاوڕێگای بۆدابین دەکات ئێ خۆنابێ ئافرەتەکەتەنیابێ ، ئەگەرلای کەس وکارەکەی بێ هەرلەشوێنەکەی خۆی کێ نەفسی قبول دەکات کەجگەلەمارییەکەی جێگاوڕێگاوپێداویستییەکان هەرلەسەرخۆیان بێ یاخودئەگەرزاواجارجارە وەکومیوان خۆی بکابەژوورا٠ئەگەرلەڕووی ئاینییەوەسەیری ئەم جۆرەهاسەرگیرییەبکەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەوالەڕووی ئاینی ئیسلامەوەهیچ بنچینەوبنەمایەکی نییەولەسەردەمی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) نەبووەولەقورئانی پیرۆزیشدائاماژەی بۆنەکراوە تەنیالەم دوابیانەهاتۆتەکایەوە ، وەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ : (یامعشر الشباب من استطاع منکم الباءة فلیتزوج ومن لم یستطیع فعلیە بالصوم فأنە لە وجاء) رواە البخاري٠ واتا : (ئەی کۆمەڵی گەنجان ، ئەگەردەتوانن ژن بێنن ، وەئەگەرتوانای ژنهێنانی نییەپێویستەبەڕۆژووبێ ، چونکەبەڕۆژووبونەکەی ئارەزووی ژنهێنانی دەشکێنێ) جالێرەداپرسیارێك دێتەپێشەوە ئەگەرمسیارحەلالەبۆچی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)نەیفەرمووهاوسەرگیری مسیاربکەن (چونکەئەرك وتەکالیفی گەلێ کەمە) ؟ (م) دەڵێ : هاوسەرگیری پڕۆسەیەکی گەورەوپیرۆزە هەرئەوەنییەکەهەرکچێك دوای مارەبڕین ئەلقەلەدەست دەکات وزێڕی بۆدەکرێ ، بەڵکوئەرکی ئافرەت لەمەودواگوێڕایەڵی مێردەکەی وخزمەتکردن وپاکڕاگرتنی ماڵ وئامادەکردنی ژەمەکانی نانخواردن لەکاتی خۆی وبەڕێك وپێکی٠(ك) دەڵێ : خۆشەویستی مرۆڤ بۆکۆرپەکەی شتێکی خواکردە ، دیارەمنداڵیش بێ هاوسەرگیری نابێ ، خوای گەورەدەفەرموێ : (وزکریا اذنادی ربە رب لاتذرني فردا وأنت خیر الوارثین فاستجبنا لە ووهبنالە یحیی ) الانبیاء : ٨٩ - ٩٠ واتا : (زکریاکەهاواری بردەبەرپەروەردگاری خۆی ووتی : پەروەردگارم هەربەتەنیام مەهێڵەوە پەروەردگارم تۆباشترین کەسێکی کەهەردەمێنی نزامان لێ قبولکردویەحیامان پێبەخشی)٠(م)لەبارەی تەبیعەت دەڵێ : خەڵکێکی زۆرپێیان وایەتەبیعەت نەگۆڕەوئەوکەسەتاکومردن

لەسەرئەوتەبیعەتەدەمینێ وناتوانێ بیگۆڕێوەکودەڵێن : (تەبیعەت دەرمانی نییە) ، تەبیعەتیش ڕاستەوخۆکاریگەری هەیەلەسەرژیانی هاوسەری ، بەلاَم بەهەوڵدان وخۆڕاهێنان دەتوانی بیگۆڕی٠(ك) دەڵێ : هەمووشتێك هەوڵدان نییە ، جاچ هاوسەرگیری بێ یان هەرشتێکی تربێ ، چونکەمەرج نیەمرۆڤ هەرشتێك هەولی بۆدابیگاتێ وبەدەستی بێنێ ، چونکەهەمووشتێك لەم دنیایەداقسمەت ونسیبە ، هەوڵدانیش ، چونکەهەرشتێك خوانەیکات نابێت٠(ك) دەڵێ : هاوسەرگیری پەیوەندییەکی پیرۆزە ، بەلاَم زۆرجاردەبێتەمایەی پەشیمانی بەتایبەتی ئەوهاوسەرگیرییەی سەرکەوتن بەدەست نەهێنێت٠(ئە ك) دەڵێ : کاتێك پیاوبەهاوسەرەکەی دەڵێ : چێشتەکەت خۆشەیان خۆشترین چێشتەئافرەتەکەپێی دڵخۆش دەبێت ، هەرگیزبیرلەوەناکاتەوە کەپیاوەکەی درۆی لەگەڵدادەکات٠(ز) دەڵێ : کاتێك پیاوبەهاوسەرەکەی دەڵێ : ئەمڕۆزۆربیرتم کرد ئافرەتەکەپێی دڵخۆش دەبێت٠(ئە) دەڵێ : ڕۆژگارهەمووڕاستی وناڕاستی قسەی پیاوەکان بۆهاوسەرەکانیان بەدیاردەخات ، چونکەسەرەتای هاوسەرگیری پیاوەکەقسەکانی خۆی لەبێژینگ دەدات ، ئینجادەیکات ، بەلاَم زۆری پێناچێت لەم دەوربینینەبێزاردەبێت ودەکەوێتەباری ڕاستییەوە٠(ل) دەڵێ : پرۆسەی هاوسەرگیری یەکێکەلەگۆڕانکارییەگرینگەکانی ژیانی هەمووکەسێك بۆیەپێویستەبەرلەمارەکردن باسی چەندخاڵێك بکرێت :-

١ – پێویستەلەبارەی ڕۆژی گواستنەوەبدوێ٠

(ڕ) دەڵێ : ئێمەبەبنەماڵەزۆرئارەزوومان لەدەهۆڵ وزوڕنایە لێبدرێت بەرلەوەی بووك لەماڵی دایکی دەربچێت دایکم وتی : هەردەبێ دەهۆڵ وزوڕنابهێنن بۆیەئاگاداری ماڵی زاوام کردەوە کەخواستی دایکمە ئەم داوایەی جێبەجێ بکەن لەڕۆژی گواستنەوەدا ، کەچی ڕۆژی گواستنەوە کاتێ ئۆتۆمبیل هاتن ولەکۆلاَن ڕاوەستان دەهۆڵ وزوڕنایان نەهێنا بۆیەدایکم سوێندی خوارد وتی : بەخوابووك ناچێتەدەرەوە لەوماڵە تادەهۆڵ وزوڕنانەهێنن ، ئینجاکچەکەمتان دەدەمێ ، زاواش زۆرتوڕەبوو ناچارخوشکەکەم چوولەگەڵ ماڵی زاوا دەهۆڵ وزوڕنایان دۆزییەوە وهێنایان ، کێشەیەکی زۆرگەورەبوولەدڵی خۆمداوتم : ئێستازاواهەرلێرەبەجل وبەرگی بوکێنییەوەتەلاقم دەدات ، چونکەپورێکم بەهەمان شێوە لەڕۆژی گواستنەوە داوای دەهۆڵ وزوڕنایان کردبووتەلاق درا٠(ئە م)یش دەڵێ:لەڕۆژی گواستنەوەم زاواهاواری کرد بۆچی ئەم جل وبەرگەڕووتەت هێناوە ، سینگی هەمووبەدەرەوەیە؟

٢ – پێویستەخاوەن قسەوبڕیاری خۆی بێت٠

(ب ن) دەڵێ : لەڕۆژی گواستنەوەبووەشەڕوکێشەیەکی گەورە ، چونکەگوتمانەماڵی زاواتاقم نوستن بکڕە ، ئەویش وتی : بەسەرچاو٠پاشان نەیکڕیبوو ، تەنهاکانتۆرێکی کڕیبووەنیش

زۆرتوڕەبووم لەزاواهەرچەندەخزمی خۆمان بوو گوتم : چۆن خاوەن گفتی خۆت نەبووی ؟!
ئەمجاپلكی گوتی : باشەبۆی دەكڕین ، كەچی هەمووی تەنهابەڵێنێكی زاری بووهیچی ترنا٠(د) دەڵێ : من ڕەچاوی زێڕلەوكەسەناكەم كەدەبێتەهاوسەری ژیانم ، كەسێكم دەوێت لەگەڵم باش بێت وبەختەوەرم بكات بابەتەنەكەزێڕم هەبێت كەژیانم ئاسوودەنەبێت٠(ف)دەڵێ : ئەگەریەكێك بێتەخوازبێنیم دەڵێم چەندت لەتواناداهەیەبۆم بكە٠(چ) دەڵێ : لەسەرمارەكردن دایكم وتی : (٥٠٠) پێنجسەدمسقال پاشەكی دابنێن ، چونكەخوشكەكەی تریشم مارەیی پاشەكی (٥٠٠) پێنجسەدمسقالە بۆیەلەڕۆژی مارەكردنم بووە شەڕوكێشە ، كەس وكاری زاوامشتومڕیان بوووتیان نابێت ، بەلأم دەستگیرانم منی بەدڵ بوو دەیوت :
كێشەنییە! لەبارەی هاوسەرگیری لەگەڵ كوڕی گوندنشین یان كچی گوندنشین ، (ك یا)دەڵێ:من هیچ جیاوازی ئەوتۆنابینم ، چونكەئێستازۆربەی گوندەكانیش ئاووكارەباوڕێگاوبانی هەیە بەتایبەتی ئەوانەی لەشارنزیكن ، بەلأم هەمووكچی شارنشینێك لەگوندناحەوێتەوە٠(ل ح) دەڵێ : پێم شتێكی ئاساییەئەگەرشووبەكوڕێكی لادێ بكەم ، ئەگەرئاووكارەباوخزمەتگوزاری تێدابێ وهەست بەكەموكوڕی نەكەم ، من دەڵێم : ئەگەركوڕەكەشیاوبێ ولادێكەهەمووخزمەتگوزارییەكی هەبێ ، بەڵێ ئامادەم شووبەكوڕێكی دانیشتووی لادێ بكەم٠(ژ) دەڵێ: نەخێرئامادەنیم شووبەكوڕێكی لادێ بكەم ، چونكەكچێك كەهەمووژیانی لەشاربەسەربردبێ مەحالەبتوانێ خۆی بگونجێنێ لەگەڵ گوند دا ، دەڵێم گوندمەبەستم كوڕەكەنییە مەبەستم حالی گوندە٠(ك) دەڵێ : زۆرئاساییەمن شووبەكوڕێكی شاربكەم ، ئێمەلەبەخێوكردن وپەروەردەكردنی منداڵ وكابانی نێوماڵ زۆرباشترین لەكچەشارییەكان ، ڕێزم بۆكچی شارهەیە كەزۆربەیان هەرخەریكی مۆدیل ومۆدیلكارین٠(د ت) دەڵێ : كچی گوند گورج وگۆلتروباشترە لەزۆر ڕووەوە٠(م س) دەڵێ : ئەگەرلەوهۆیانەبكۆڵینەوە كەدەبێتەهۆی تێكدانی نێوان ژن ومێرد ، هەمووهۆیەك هۆیەكی وانییە ببێتەمایەی تەلاق ولێكجودابوونەوە٠(س) دەڵێ : زۆرجارئافرەت ماڵ دەكات بەدۆزەخ ، ژیانی پیاوهەراسان دەكات ، شەڕی دایك وباوك بەدەنگی بەرزبەرامبەرمنداڵەكانیان هەستكردنی منداڵەكانیانەبەترس ولەرز٠كەئافرەت زمانی وەك شمشێردەردەكات بەبێ هۆشەڕدەكات ، بەبۆڵەبۆڵ ناودڵی پیاوەكەی دەخوات ناچارەئەوپیاوەهەڵبێت وماڵەكەی بۆبەجێ بێڵێ لێرەدائافرەت دەبێ ڕێزلەپیاوەكەی بگرێ هەرچەندەئەگەرپیاوەكەی هەڵەی كرد ، بەهێمنی مامەڵەی لەگەڵدابكات بەسەبروئارام بی وهاوبەشی بكات لەتاڵی وشیرینی٠(ك) دەڵێ : ژنهێنان وەرەقەی یانسیبە٠(ك) دەڵێ : كەشووم كرد تەنیاداوای ئەلقەیەكم كرد٠(م) دەڵێ : پێشینان وتوویانە : (نەپێڵاوی تەنگ ، نەماڵی بەجەنگ) واتا پیلاوی تەنگ قاچت ئازاردەداوماڵیش كەشەڕوناخۆشی تێدابێ دڵت

ئازاردەدات٠(ك ع) دەڵێ : لێبوردن هەڵسوکەوتێکی شارستانییە ، هەموومرۆڤێکیش هەڵدەکات بەتایبەتی ئەگەرئەوکەسەهاوژینت بێ ، لێبوردەیی گەورەترین چارەسەرە بۆگێروگرفتی نێوان ژن ومێرد٠(م) دەڵێ : کەللەڕەقی ولووتبەرزی ژنەکەم شیرازەی ماڵەکەمانی تێکدا هەرچەندە مناڵیشمان هەیە پێویستیان بەهەردووکمانە (دایك وباوك) ، بەڵام بیری لەبەرژەوەندی مناڵەکان نەکردەوە هەرگیزئامۆژگاری خزمانیش سوودی نەبوو ، ئەنجام منداڵەکانی گلدایەوە بۆخۆی ومنیش ژنم هێنا٠(ف) دەڵێ : لێبوردن هەرگیزلەمرۆڤ کەم ناکاتەوە ، وەئەوەی لەخەڵکی ببورێ هەست بەکامەرانی دەکات بەتایبەتی مێرد کەهاودەمی ژیانتە٠(س) دەڵێ : هەرچەندە بەخۆشەویستی ژنم هێنا ، بەڵام ژیانمان تاسەرنەبوو ، خێزانەکەم بیری لەخوێندنی زیاترکرد بەدوای شەهادەی بەرزگەڕا ، منی پشتگوێ خست وماڵی بەڕەللا کرد٠٠دایکی دەهات ئیش وکاری ناوماڵی بەڕێوەدەبرد ، نەڕۆژونەدوو ئەم حالەتەبێزاری کردم هەرچەندە ئامۆژگاریم کرد سوودی نەبوو بەلووتبەرزی مامەڵەی لەگەڵ دەکردم ئەنجام تێکچوونی شیرازەی ماڵمان٠(م ب) دەڵێ : چۆنیەتی ئەنجامدانی زەواج وشێوەی هەڵبژاردن وخوازبینی لەکۆمەڵێکەوە بۆکۆمەڵێکی تردەگۆڕێ ، بەڵام لەلای زۆربەی میللەتانی دنیاعادەت وایە ، کەکوڕکچ هەڵدەبژێرێت وخوازبینی دەکات ، بەڵام لەهەندێك شوێنی ترئافرەتان دەستنیشانی هاوسەری خۆیان دەکەن ، وەك لەلای هەندێتیرەوهۆزی ئەفریقیاوچین وهیندییەسوورەکان باوە٠لەناوموسوڵمانان بەگشتی ومیللەتی ئێمە بەتایبەتی ئافرەت داواکراوەوپیاویش داواکەرە ، ئەم شێوەیەش جوانتروشیاوترە هەرچەندە ئاینیش قەدەغەی نەکردووە ، کەکچ خۆی پێشکەش بکات٠دایکمان خەدیجە (خوالێی ڕازیبێ) مەعلوومە کاتێك ڕەوشت بەرزی پێغەمبەری دیت خۆی ناردی بۆئەوەی بیخوازێت ئەم بەڵگەیەش ئەوەدەسەلمێنێت کەئیسلام ڕێگەی لەوەنەگرتووە کەئافرەت دەستنیشانی هاوسەری خۆی بکات ، هەروەها حەزرەتی شوعەیب (سەلامی خوای لێبێ) فەرموویە حەزرەتی موسا : من دەمەوێت یەك لەم دووکچانەی خۆمت لێ مارەبکەم ، وەکولەسوڕەتی(القصص) ئایەتی (٢٧)داهاتووە٠بەڵام ئەوەندە هەیە ئەگەرکچەکەکەس وکاری دەست پێشخەربوون بۆبەشوودانی پێویستە ئەم کارە لەگەڵ کەسانێك دابکەن کەڕێزلەم هەڵوێستەبگرن نەك لەداهاتوو بەچاوێکی کەم تەماشای بووکەکەیان بکەن وبیکەنە خاڵێکی لاوازونێگەتیف کەس وکاری کوڕەکەش لەئاست ئەم چاکەیەدابن٠خاتوو (مافیس هیدیرینگستۆن) مامۆستای زانکۆی ڤێرجینیا لەبارەی تەلاق وهەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری دەڵێ : مەرج نییە لەهەموحالەتێکدا دیاردەی تەلاق وجیابوونەوە شتێکی خراپ بێت بەتایبەتی ئەگەرلەنێوئەوخێزانەدا بەئەندازەیەکی زۆرکێشەوگیروگرفت وناکۆکی وئاژاوەی تێدابێت٠(هـ ح) دەڵێ : بەڕای من کچ دوای تەواوکردنی خوێندن شوبکات

باشترە لەوەی لەکاتی خوێندن شوبکات ، من لەگەڵ ئەوەدام کچ خوێندنی خۆی تەواوبکات ئینجابیرلەپێکهێنانی خێزان بکاتەوە ، چونکە هەموومان دەزانین ئافرەت کەشوبکات منداڵی دەبێ وتووشی ئەرکی بەخێوکردنی منداڵ دەبێ ئەمەش خۆی لەخۆی دا گرفتێکی گەورەیە بۆئافرەت ، جگەلەمە دەوامەکەشی بەڕێك وپێکی پێناکرێت لەخوێندنەکەشی بەتەواوی سەرناکەوێت ، بەڵکوتەنیادەردەچێت٠بەلأم (ھ) دەڵێ : مێردکردن ڕێگالەتەواوکردنی خوێندن ناگرێت ، هەروەهاکچ لەلای ئێمە کەگەیشتە تەمەنی (٣٠)سی ساڵی پێی دەڵێن : قەیرە کچ٠بەڵکوزۆرئاساییە دەتوانێ لەهەمان کاتدا مێردبکاوبشخوێنێ زۆرجاران ئافرەت مێردی کردووە دەشخوێنێ زۆریش هەبوونە زیاتریان خوێندووەوبڕوانامەی ماستەرودکتۆراشیان بەدە ستهێناوە٠(س م) دەڵێ : گومان لەوەدا نییە کەئاسوودەیی وبەختەوەری خێزان بەندە بەڕاددەی پێکەوە گونجان ولەیەکگەیشتنی ژن ومێردوڕێزلەیەکترگرتنیان٠لێرەدا بوونی هەستی خۆشەویستی بەرامبەربەیەك کۆڵەگەیەکی سەرەکی ئەوڕێزگرتنە پێکدێنێ کەگیروگرفتی ناوخێزان ئەگەربەردەوام بێ تەشەنە دەسەنێ وئاکامی زۆرخراپی لێ دەکەوێتەوە ، یەکێك لەئاکامانەش تەلاقە ئەم ئاکامەش کاریگەری زۆرخراپ وسلبی هەیە لەسەرئایندەی منداڵەکانیان٠(ڕ) دەڵێ : تەمەنم (٣٦) سی وشەش ساڵە تاپۆلی شەشەمی سەرەتاییم خوێند ، دواترلەبەرداب ونەریتی کۆمەلأیەتی باوکم منی لەقوتابخانە دەرهێنا ، پاشانیش شووم کردوپێنج منداڵم هەیە ئێستاش پاش ئەوەی (٢٣)بیست وسێ ساڵ وازم لەخوێندن هێنا گەڕامەوە قوتابخانە وهاوسەرەکەشم ڕێگرنەبوو٠(م) دەڵێ : هاوسەرگیری سەرکەوتوو پەیوەستە بەچەند هۆکارێکەوە لەوانە :-

١ — هاوشێوەیی حەزەکان وشێوازی بیرکردنەوە بۆنموونە چەند لەبارەی هزرەوە جیاوازی بیروڕاوهاوبیروڕایی هەیە؟ئایاهەردووکیان ئەهلی کتێب وباس وخواستن ؟

٢ — باوەڕی ئاینی ومەزهەبی بۆنموونە یەکێکیان موتتەقی ومولتەزیم بێت ئەوی تریا ن دوورلەدین بێت ناکۆکی دروست دەکات٠

٣ — هاوشێوەیی ئاستی خوێندن٠کچێك خاوەن خوێندن وبڕوانامەی بەرزبێت ، ئەگەر شوبکات بەکوڕێك خوێندەوارییەکی کەمی هەبێ ئەواناگونجێن٠

٤ — زۆرقسەکردنی ئافرەت وبێدەنگی پیاو٠

(خ) دەڵێ : پێکهێنانی ژیانی هاوسەری لەلایەن کوڕوکچ پیرۆزەولەڕووی ئاینیشەوە بەنیوەی دین دادەنرێت٠(ئە) دەڵێ : بەڕای من کەسەکەگرینگترە لەماڵ وسامان ، مەرجەکانی من لەهەڵبژاردنی هاوسەری ژیان ، کوڕێکی باش بێت لەڕووی ئەخلاقی وڕۆشنبیری٠(پ) دەڵێ : زۆرجارخانەوادە کۆسپ دەخەنە بەردەم شووکردنی کچەکانیان داوای زێڕی زۆردەکەن دەڵێن :

کچی فلاَن ئەوەندە زێڕی بۆکراوە دەبیٚ کچی ئێمەش ئەوەندەی بۆبکرێت دیارە ئەمەش چاولێکەرییە من ئەوەبەشتێکی زۆرهەڵەدەزانم دەبیٚ داواکارییەکانیان بەپێی ئیمکانیاتی کوڕەکەبیٚ ، بەڕای من زێڕوپارە ئەوەندە گرینگ نییە گرینگ کەسەکەخۆیەتی ، ئەگەرکچێك قەناعەتی تەواوی بەکوڕێك هەبیٚ من دڵنیام نەداوای زێڕی زۆرونەئۆتۆمبیل ونەخانووی جیاش دەکات٠(ك) دەڵیٚ : ئەگەرکورئیمکانییەتی هەبیٚ ئەوەخۆی حەزدەکات داواکارییەکانی کچەکە جێبەجیٚ بکات ، بەلاَم ئەگەرنەیبووچی بکات ؟ (س) دەڵیٚ : پێموایە مرۆڤی بێدەنگ جوانترین مرۆڤ ، دەڵیٚ : دەستەخوشکێکم بەهۆی زمان شڕی وزۆرقسەکردن بووە هۆکاری شەڕوئاژاوە لەگەڵ مێردەکەی پاشان دادگاولێکجیابوونەوەیان٠ئاماژە بەوەش دەکات کە بێدەنگی لەڕاددەبەدەری هەندێك لەپیاوان کوشندەوبێمانایە دەڵیٚ : پیاوی زۆربێدەنگ وژنی زۆربلیٚ کو شندەن بۆژیانی هاوسەری٠پزیشکێك دەڵیٚ : زۆربەی خێزان کەهاوسەرگیری لەگەڵ خزم دا دەکەن کارێکی باش نییە ، چونکە زۆرنەخۆشی هەن کەبۆماوەیی دەگوازرێنەوە ئەمەش زیاترلەهاوسەرانی خزم دا ڕوودەدات بەتایبەتی نەخۆشی تالاَسیما٠(ب) ئاماژە بەچەندلایەنێك دەکات کەلەکەسی بەرامبەری دا هەبیٚ وەك ڕۆشنبیربێت تاڕاددەیەك جوان بێت ، ڕێزی لیٚ بگریٚ ، بتوانێت ژیانی بەڕێوەببات ، ڕەوشتی بەرزبێت ، پەیڕەوی ئاینی ئیسلام بکات٠(خ) ئەوکەسەی خەونی پێوە دەبینێت خوێندەواربێت ، بیروبۆچوونەکانی لێیەوە نزیك بێت ودڵپیس وڕەزیل نەبێت٠(ك) دەڵیٚ : بەنابەدڵی شوکردن وژنهێنان مانای لەبەرچاونەگرتنی ئەوڕاستییەیە کەمرۆڤ بەئازادی لەدایکبووە حەقی خۆیەتی کەهەڵبژاردنی شەریکی ژیانیشی بەبڕیاری خۆی بیٚ٠(ب)دەڵیٚ : مەرج نیە تەواوی ژیانی ژن ومێردایەتی هەرتەنیاخۆشی وپێکەوە هەڵکردن بیٚ هەندیٚ جارناکۆکی وشەڕی بچووکی نێوان هاوسەران دەبیٚ٠(س) دەڵیٚ : بەبڕوای من گرینگ هاوشانی بوونی کوڕوکچەکەیە لەجۆری بیرکردنەوە کوڕێك بابڕوانامەی زانکۆشی هەبیٚ ، بەلاَم کاتێك بیرکردنەوەیەکی دواکەوتووانەی هەەبیٚ ، بەلاَم بەشێوەیەکی گشتی کەسی خاوە ن بڕوانامە ئاستێکی ڕۆشنبیری بەرزتری هەیە ، بەلاَم ناشکریٚ هەمووکەسێکی خاوەن بڕوانامە ڕۆشنبیربێت وشارستانیانە هەڵسوکەوت بکات٠(ل) دەڵیٚ : بڕوانامە نەك هەرگرینگە بەڵکوپێویستیشەوزەروریشە بۆئەوکەسەی دەبێتە هاوسەری ژیانت٠(هـ) دەڵیٚ : هەندیٚ کەس هەن بەسروشتی خۆیان ڕەزیل ودڵپیسن وەکو دەشڵێن : تەبیعەت دەرمانی نییە ، ئەوکەسانە بەهیچ شتێك ناگۆڕێن ، لەماوەی دەستگیرانی دا بۆم دەرکەوت کە دەستگیرانەکەم ڕەزیل ودڵپیسە ، ئەگەرماوەی دەستگیرانی نەبایە نەمدە زانی کە دەشیگواستمەوە دڵنیابووم تەلاقم وەردەگرت٠(د) دەڵیٚ : ماوەی دەستگیرانداری دەرفەتێکی زێڕینە بۆیەکترناسین٠جاری واش هەیە هەندیٚ لەکچان ولەکوڕان لەماوەی دە ستگیرانی دا

بەکەسایەتییەکی دیکەی دوورلە واقیعی خۆیان هەڵسوکەوت دەکەن تاشتەکەببی٠(ف) داوای تەلاقدانی ژنەکەی بۆدادگابەرزکردبووەوە ، هۆی داواکردنی تەلاقەکەی : ((ژنەکەم ڕووبەڕووم دەوەستێتەوە بەقسەم ناکات ، زمانی زبروپەلە ، چی پێ بڵێم پێم دەڵێتەوە ، شتێك پێی بڵێم مەیکە ئەگەرقەناعەتی پێنەبێ هەردەیکات٠))

(ش) دەڵێ : هۆکاری ئابوری ڕۆڵێکی ڕاستەوخۆی هەیە لەتێکچوونی شیرازەی زۆرخێزان بۆنموونە فەرمانبەرباری ئابوری زۆرکزبێ کرێی خانوی پێنەدرێ ، پارەی موەلیدەی کارەبای پێنەدرێ ، زۆرکوڕوکچ لەبەرزۆری داواکاری کچەکە و کەمی توانای کوڕەکە لێکجیابوونەتەوە یاخود ژن ومێردێك ، کەلەماڵی باوکی کوڕەکە نیشتەجێ بوونە ژنەکەنەی توانیوە لەگەڵ ماڵی باوکی پیاوەکەی هەڵبکات کوڕەکەش نەی توانیوە خانوی سەربەخۆی بۆبگرێ دواجارلێکجیابونەتەوە٠هۆکاری تریش هەیە بێجگەلە هۆکاری ئابوری ئەویش کاریگەری مۆبایل وخراپ بەکارهێنانیەتی ، جاری وایە خراپ بەکارهێنانەکەلەلایەن پیاوەکەوەیە جاری واش هەیە لەلایەن ژنەکەوەیە٠هۆیەکی تریش جیاوازی ئاستی ڕۆشنبیری ، هەروەهاجیاوازی تەمەن وجۆری بیرکردنەوە ، چارەسەریش بەلای من دابینکردنی شوێنی نیشتەجێ بوون وقەدەغەکردنی مۆبایلی دەنگ وڕەنگ٠ (ف) دەڵێ : کاتێك داواکاریم هات بنەماڵەکەم داوای (١٥٠)سەدوپەنجامسقال زێڕیان کردبەلاَم من ڕازی نەبووم بەوبڕەزۆرە ، چونکە دەمزانی کوڕەکە توانای کڕینی ئەوهەمووزێڕەی نییە٠هەرچەندە بنەماڵەکەمان ڕازی نەبوون دەیانووت : تۆنرخی خۆت نازانی ئەوزێڕە ژیانت دەپارێزێ لەداهاتوودا ، بەلاَم من هیچ گوێم بەقسەی ئەوان نەدەدا٠ سەبارەت بەبڕی مارەیی (د ب) دەڵێ : ئاینی ئیسلام ڕێژەی مارەیی دەست نیشان نەکردووە ، بەڵکوتەنیائاماژەی بەوەکردووە ، کەپێویستە ڕێژەکەی کەم بێ٠ئەو(١٩)نۆزدە مسقالەش بەڕای هەندێك لەزانایان ئەگەرلە(٢٠)بیست مسقال زیاتربێ ئەواپێویستەزەکات بدات ، بەلاَم هەندێ لەزانایانیش بەتایبەتی ئیمام (ئەبوحەنیفە) ئاماژەی بەوەداوە ، کەمارەیی زەکاتی لەسەرنییە ، بەڵکووەك قەرزێکی مردوو وەهایە تالەلای پیاوەکەیە تائەوقەرزە ژنەکە وەریدەگرێت ، بەلاَم ئیمامی شافیعی زەکاتی لەسەرمارەیی بەفەرزداناوە ، کەبۆهەرمسقالێك نیومسقالی داناوە٠ ئاماژە بەوەش دەدات هیچ کاتێك مارەیی زۆرئایندەی کچەکان دابین ناکات ونابێتەهۆی پاراستنی ژیانی ئافرەت ، بەڵکوتاکەڕێگەی زامنی ئایندەی ئافرەت هەڵبژاردنی کەسی شیاوە بۆئافرەت٠ئافرەتێك دەڵێ : ماوەی بیست وچوارساڵ دەبێت ژیانی هاوسەریم پێکهێناوە٠هاوسەرەکەم هیچ شەوێك لەماڵە وە نەبوو شەوانە تادرەنگانێك لەدەرەوەبوویاری قوماری دەکرد ، هیچ کاتێك خاوەن دینارێك نەبوو ، شەوێك لەیاری قوماردۆڕاندبووی پارەی هیچ پێنەمابوو ، دواتروتبووی ئەوجارە یاری دەکەم ، ئەگەردۆڕاندم ژنەکەی خۆمت پێدەدەم!

ئەوكات لەيارييەكەسەركەوتوونەبووبوومنى دۆڕاندبوو لەيارى قوماركردن ، ئەوژنە دەڵێ : كاتێ كەزانيم هاوسەرەكەم لەقومارمنى دۆڕاندووە ڕۆيشتم بەجێمهێشت وبۆماوەى پانزە ساڵان تاكومرد ئينجاگەڕامەوە لاى منداڵەكانم٠(ئا) دەڵێ : زۆربايەخ بەهاوسەرەكەم دەدەم كاتێك كەدەچێتە دەرەوە جلەكانى بۆئامادە دەكەم ، تاخۆى ئامادە دەكات پێڵاوەكانيشى بۆبۆياغ دەكەم وەكوگوڵێكى جوان ئامادەى دەكەم نەك تەنيابۆجلەكانى دەرەوەى بايەخى پێ بدەى بۆماڵەوەش بايەخى پێ بدەى جلەكانى ماڵەوەى بەجوانى بۆدابنێى٠(نا) دەڵێ: من وەكوئافرەتێكى خاوەن هاوسەرحەزدەكەم كەهاوسەرەكەم ڕێك دەركەوێ وجلى ڕێك وپێك لەبەربكات هاوسەرەكەم زۆرحەزبەجل ناكات بۆيەخۆم هەوڵى لەگەڵ دەدەم بۆئەوەى حەزلەجل بكات وزووزووجلى نوێ بكڕێ٠لەوڕۆژەوە منى هێناوە تاكوئێستا زۆرگۆڕاوە پێشترحەزى لەجلى ڕەساسى دەكرد بۆئەوەى پيسى پێوەديارنەبێت ، بەلاّم ئێستاگۆڕاوە هەرڕۆژەوجۆرە جلێك وڕەنگێك لەبەردەكات وحەزبەجلى ڕێك وپێك دەكات٠(ئا) دەڵێ : هاوسەرەكەم حەزدەكات هەمووكات چاكەت وپانتۆڵ لەبەربكەم ، چونكە كەسايەتيم پێ دەبەخشى ، من لەوكاتەوەى ژيانى هاوسەريم پێكهێناوە لەڕووى جل وبەرگەوە گۆڕانكارييەكى زۆرم بەسەرداهاتووە٠(ف) دەڵێ : لەسەرهەموودايك وباو كێك پێويستە پێش ئەوەى منداڵەكانيان ژيانى هاوسەرى پێكبێنن ئامۆژگارييان بكەن ، كەچۆن ڕێزلەهاوسەرى خۆيان بگرن وچۆن ماڵ بەڕێوەببەن ، چونكە ئەگەروانەبێت ئەواپڕۆسەى هاو سەرگيرييەكە سەرناكەوێت٠(ئا) دەڵێ : پێش ئەوەى ژيانى هاوسەرى پێكبهێنم هەمووكات دا يكم ئامۆژگارى دەكردم كاتێك شووم كرد چۆن ڕێزلەهاوسەرەكەم بگرم وخزمەتى بكەم ولە قسەى دەرنەچم وخيانەتى لێ نەكەم٠ئێستاش هەمووقسەكانى دايكمم جێ بەجێ كردووەوژيانم زۆرخۆشە٠(هـ) دەڵێ : پێش ئەوەى ژيانى هاوسەرى پێكبهێنم دايكم وباوكم هەمووكات پێيان د ەوتم نابێت ئەوهەڵسوكەوتەى ئێستاهەتە ئەوكات هەتبێ دەبێ ڕێزلەهاوسەرەكەت بگرى وماڵى بۆدابين بكەى٠(خ) دەڵێ : پێش ئەوەى پڕۆسەى هاوسەرگيرى بكەم هەمووكات دايكم ئامۆژگارى دەكردم پێى دەوتم : دەبێت ڕێزى هاوسەرەكەى خۆم بگرم وبۆخۆمى ڕابكێشم وبايەخ بەخۆم بدەم ، كاتێك هاوسەرەكەم گەڕايەوەماڵ خۆمى بۆجوان بكەم وخواردنى خۆشى بۆئامادەبكەم ، چونكە دەيووت : پياوئەوشتانەى لەخێزانەكەى خۆش دەوێت٠(ئا) دەڵێ : ئێستاژيانم زۆر جياوازە ئەوكات ڕۆژانە بەدڵى خۆم دەگەڕامەوە ماڵ هەمووكات دايك وباوكم پێيان دەوتم ژن بێنى دەبێت ئێواران زووبگەڕێيتەوە ماڵ ، هەفتانە هاوسەرەكەت ببەيەدەرەوە ، ژيانم زۆرخۆ شە٠(ف) دەڵێ : زۆربەى پياوان لەقۆناغى دەستگيرانى دا زياتربەڵێنەكان جێ بەجێ دەكات بۆئەوەى كچەكە ڕازى بێت ژيانى هاوسەرى لەگەڵ پێكبێنێت ، بەلاّم كاتێك ژيانى هاوسەرى لە گەڵ پێكهێنا ئەوكات كەمتربەڵێنەكان جێ بەجێ دەكات٠(چ) دەڵێ : پياوانێك هەن لەدەرەوە بە

جۆرێك ولەماڵەوە بەجۆرێکی دیکە ڕەفتاردەکەن بەتایبەتی هەڵسوکەوتی پیاولەگەڵ ژنەکەی بەجۆرێکە لەدەرەوەش بەجۆرێکی دیکەیە٠لەماڵەوە هەرگیزکاتێك دانانێت بۆچوونە دەرەوە ، بەڵام ئامادەییان تێدایە بۆکچێك زۆربەی کاتەکانیان تەرخان بکەن وپێکەوە بچنە ڕێستورا نتێك نان بخۆن٠بەڵام ئەگەرژنەکەی داوای لێ بکات دەڵێت : کاتم نییە٠(ڕ) یش دەڵێت : ژنا نیش هەمان ئیزدیواجیەتیان هەیە بۆنموونە : زۆربەی ژنان کاتێك لەدەرەوە دەیانبینی ئە وەندە ماکیاژی کردییە نایناسییەوە وخۆیان دەرازێننەوە ، بەڵام لەماڵەوە بەم شێوەیەنین٠ (ب) دەڵێ : ناپاکی هاوسەری تەنیابریتی نییەلەناپاکی ئەخلاق ، بەڵکوهەندێ لایەنی دیکە شی هەیە بۆنموونە ئاشکراکردنی نهێنی هاوسەرەکەی ، هەروەهاخۆڕازاندنەوە بۆکەسێکی دیکە جگەلەهاوسەرەکەی ، بەڵام ناپاکی ئەخلاق لەوناپاکیانەیە بەخشینی مەحالە٠ (ه) دەڵێ : پیو یستەگۆڕانکاری لەژیانی هاوسەری دا بکرێت وەك هەفتانە چوونەدەرەوە بەمەبەستی گەشت و سەردانی خزم وکەس وبایەخدان بەخواستەکانی یەکتری٠(ف) دەڵێ : بۆپیاونەهاتووە بەناوی هاریکاری خێزانەکەیەوە هەندێ کاربکات کەلەسروشتی پیاوناوەشێتەوە واباوبووە لای ئێمە کە پیاوئەرکی کارکردن لەدەرەوە لەئەستۆدابێ بەرامبەربەوە ئافرەتیش پەروەردەکردنی منداڵ و ڕاپەڕاندنی کارەکانی ناوماڵی لەئەستۆدابێ لەبەرئەوە پیاوچۆن دەتوانێ سەرباری ئەوماندووبو ونەی کەلەدەرەوە تووشی دەبێ بێتەوە لەماڵیش کاربکات٠دەتوانرێ لەحالەتی تایبەتی دا وەکو نەخۆش کەوتن تاڕاددەیەك یارمەتی ژنەکەی بدات ، بەڵام لەحالەتی ئاسایی ڕۆژانە وەکوبەرنا مە لەگەڵ ئەوەدانیم ، بەشێك لەئافرەتانیش پێیان عەیبە پیاوکاری ناوماڵ بکات ، پێموایە ئە گەرئافرەت لەدەرەوە کاری کرد ئەوکاتە شتێکی سروشتییە کەپیاولەماڵەوە بەڕاددەی پێویست هاوکاری ژنەکەی بکات مادەم ئەویش یارمەتی مێردەکەی دەدات لەدەرەوە ماندووە ، بەڵام ئە ویش نەك هەمووجۆرەکارێك وەکوچێشت لێنان وخواردن ئامادەکردن٠(ئە) دەڵێ : تائێستاپێنج شەش داخوازیم کردووە چوومە داخوازی کچێك یەکێك لەداواکارییەکانی باوکی ئەوەبوو ، کە خانوێکی سەربەخۆبۆکچەکەی بکرم٠(ئا) دەڵێ : زۆربەی ئێواران کەدەگەڕێمەوە ماڵەوە خێزانە کەم ئەوەندە بایەخ بەمن نادات ئەوەندە بەتەلەفۆن قسەلەگەڵ دایك وخوشکی دەکات منیش تو وڕەدەبم دەبێتەهۆی شەڕلەنێوانمان هەرقسەیەك دەکەم وەڵامم دەداتەوە منیش ناچارم دەنگی لەسەربەرزبکەمەوە٠(ك) دەڵێ : مەرج نییەهاوسەرگیری ئاسودەیی بەدواوە بێ ، چونکە هاوسە ری خراپ ژیان تاڵ دەکات ، (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (من سعادة ابن ادم ثلاثة ، ومن شقوة ابن ادم ثلاثة ، من سعادة ابن ادم : المراة الصالحة ، والمسكن الصالح ، وا لمركب الصالح ، ومن شقوة ابن ادم : المراة السوء ، والمسكن السوء ، والمركب السوء ) أخرجه أحمد واتا( ئەوانەی مرۆڤ خۆشبەخت دەکەن سێ شتن ، بەهەمان شێوە سێ شت ژیا

ن تالّ دەكەن ، ئەوانەی مرۆڤ خۆشبەخت دەكەن : ئافرەتێكی چاك وخانوێكی چاك وپێرۆیە كی چاك وئەوانەی مرۆڤ تووشی بەدبەختی دەكەن : ئافرەتێكی خراپ وخانوێكی خراپ و پێرۆیەكی خراپ وشڕ)٠(د) دەڵێ : مێردكردن لەڕێگای دەلاردیاردەیەكی ناشارستانییە ، چونكە ئێستا ئافرەت دێتەدەرەوە كاردەكات ودەخوێنێ هیچ پێویستی بەوە نییە دەلارنیشانی خەڵكی بدات٠هەروەهادەلارهەموومەبەست وئامانجی پارەیە ، بۆیەئەوئامادەیە بە هەموو شێوەیەك كچێك وكوڕێك ڕازی بكات تەنیابۆمەبەستی پارە ، سەدان نموونەشمان لەوبارەیەوەهەیە ئەو كەسانەی بەوجۆرەژیانی هاوسەرییان پێكهێناوە دوای ماوەیەكی كەم ژیانیان لێ تێكچووە٠بەلاّم (ش) دەڵێ : ڕێژەیەكی زۆری ئافرەتانی ئێمە زۆربەی كاتەكانیان لەچوارچێوەی ماڵە بۆیە پە یوەندی كۆمەلاّیەتییان كەمە٠لەبەرئەوەزۆرئاساییە ئەگەرهەوڵ بدات لەڕێگای دەلارەوە مێرد بكات ، چونكە ئەوئافرەتەی كەپێی دەوترێ (دەلار) پەیوەندییەكی كۆمەلاّیەتی فراوانی هەیە خەڵكێكی زۆردەناسێت كچەكەوكوڕەكەش دەتوانن لەیەكدی بپرسن بۆیە بوونی دەلارشتێكی ئیجابی وچاكە بۆئەوەی كێشەی قەیرەكچی هەندێك كەمتربێتەوە٠(ل) دەڵێ : كاتێك پیاوێكی خاوەن منداڵ هاوسەرەكەی دەمرێت كۆمەڵێك منداڵی لەپاش بەجێ دەمینێ ئەوكاتە ژنێكی تر دەینێ ، كەپێی دەوترێ زڕدایك ، كەزۆرجاردەبێتەدڕندەیەك سۆزوخۆشەویستی نانوێنێ لەبەرا مبەرئەومنداڵانە هەردەم خۆیان لێ تووڕەدەكات وجنێویان پێدەدات وپەروەردەیان ناكات٠وەك د ایكێكی ڕاستەقینە هیچ كات بەویژدانەوە مامەڵەیان لەگەڵ ناكات و بایەخیان پێنادات وفەرامۆ شیان دەكات وبەتوندی مامەڵەیان لەگەڵ دەكات وبەرقەوەلێیان دەڕوانێ ئاگای لێ نییە چی بكە ن وچۆن بژین ولەبرسان بمرن وپیس وپۆخڵ بن ونەخۆش بن٠(ه) دەڵێ : من ئەوجۆرە هاوسە رگیرییە ڕەت دەكەمەوە ، كەلەڕێگەی ئینتەرنێتەوە هاوسەرەكەت هەڵبژێری وەبەباشی نازانم ، لەبەرئەوەی لەگەڵ باری كۆمەلاّیەتی ئێمەداناگونجێ٠(ز) دەڵێ : بەشێك لەكێشەكان بەهۆی ئەو ەوەیە كوڕوكچ بەیەكترڕازی نین خواخوای كێشەیەتی ، چونكەبەدڵی خۆی نییە٠(ب) دەڵێ : پە یمانی هاوسەرگیری بۆئەوەدەبەسترێت، كەبۆهەمیشەئەودووكەسە بەیەكەوە بمێننەوە ئاشكراشە جیابوونەوە زیانبەخشە بۆهەردوولا ، هەروەهاكاریگەری لەسەرئەندامانی تری خێزانیش هەیە بەتایبەتی منداڵ٠(ح) یەكێكەلەوئافرەتانەی لەهاوسەرەكەی جیابۆتەوە وخاوەنی دوومنداڵە ، د ەڵێت : لەسەرەتای ژیانی هاوسەرێتیمان دا لەگەڵ هاوسەرەكەم هیچ كێشەیەكمان نەبوو ، ژیانما ن زۆرخۆش بوو بەلاّم دوایی هاوسەرەكەم ساردبوبووەوەبەڕۆژدەچووبۆدوكان تاوەكودرەنگانێكی شەونەدەهاتەوەماڵەوە٠هۆكاری ساردبوونەوەی مێردەكەمم بۆڕوون بۆوە ، دەڵێت شەوبووهاوسە رەكەم لەگەرماوبووخۆی دەشووشت لەبیری چووبوومۆبایلەكەی لەگەڵ خۆی بەرێتەژوورەوە كا تێك تەماشام كردنامەیەكی بۆهاتبووبەم شێوەیە : (بەرخۆڵەگیان ئەم شەوبەتەنیالەماڵەوەم ،

ئەوان ڕۆیشتوون بۆ(   ) دەتوانیت بێیت بۆماڵەوە؟) ، كە نامەكەم خوێندەوە ژمارەكەشم لای خۆم نووسی وكێشەكەم لای ماڵی باوكم باس كرد ، بەلاّم ئەوئینكاری دەكرد كەهیچ پەیوەندی لەگەڵ ئەوكچەداهەبێ بۆیەناچاربووم بەدزی هاوسەرەكەم تەلەفۆن بۆئەوكچەبكەم كەپەیوەند ی لەگەڵ دا هەبوو ، كچەكەزۆربەئاسایی وەلاّمی دامەوە وپێی وتم : من ناوم (ت)ە لە وەزارەتی (    )فەرمانبەرم بەڵێ نزیكەی شەش مانگە پەیوەندیمان هەیە وبڕیاریشی داوەبمهێنێت ، كە ئێوارەهاوسەرەكەم گەڕایەوە ماڵەوە بووبە شەڕمان و زۆری لێدام وچوومەوەماڵی باوكم٠ (ئا) د ەڵێ : زۆرجاركچان باجی تاوانی باوكیان دەدەنەوە ، چونكە بڕواناكەم كوڕێك هاوسەرگیری لەگە ڵ كچێك بكات كەباوكی پیاوكوژبێت ، ئەگەركچەكەش هیچ كێشەیەكی نەبێت و ڕێك وپێكیش بێت٠(ن) دەڵێ : ئافرەتمان هەیەبەدەست خراپەی كەس وكاری دەناڵێنێت  ،  زۆرجارهەڵدەكەو ێت منداڵی زۆرڕەوشتبەرزلەخێزانی خراپ هەڵدەكەوێت باوك یان برا یان دایك یان خوشك تاوا نێك ئەنجام دەدات كەسێكی ترباجی تاوانەكەی دەدات٠(ڕ) دەڵێت : ئەگەرخوشكێك هەڵەبكات ، خوشكێكی تری هەبێت پێ دەشكێت وباجی هەڵەی ئەوان دەدات بۆنموونە كچێك ڕەدووكەوتبوو خوشكەكەی تری تەلاق درا٠(ك) دەڵێ : زۆرجارپیاوان لەگفتووگۆی نێوان خۆیان دا بەهاوسەرە كانیان دەڵێن : منداڵ كەمەبەستیان هاوسەرەكانیانە بۆئەوەی ناوی هاوسەرەكانیان نەبەن بەتا یبەتی ئەگەرپیاوی بێگانەی تێدابێت واجوانترە بەوشێوەیەناوی بێنێت٠(م) دەڵێ : بەرلەپرۆسە ی هاوسەرگیری ئەم پرسیارانەلەهاوبەشی ژیانی ئایندەت بكە :- ئایاحەزدەكەی چەندمنداڵمان هەبێت ؟ ئایادەتەوێت هاوسەرەكەت وازلەكارەكەی نەهێنێت ودەوام بكات ؟ لەكاتی توڕەبوون دا چ ڕەفتارێك ئەنجام دەدەی ؟ ئایابۆنموونە جنێودەدەی ؟ شت ڕادەوەشێنی ؟ قسەم لەگەڵ ناكەی ؟ قسەكردن لەسەرمووچە ئایاتۆبەتەنیا خەرجی ماڵەكەدابین دەكەی یان بەهەردووكمان ؟

(د) دەڵێ : كاتێ مێردەكەم بەڵێنی ئەوەی پێدام ، كەلەسەرخوێندن بەردەوام بم دواتر پەشیمان بۆوە بۆیە منیش تۆرام لەسەرئەوحەقەی خۆم ئەوەبوونەڕۆیشتمەوەلای تاڕازی بووبچمەوە بخو ێنم٠(گ) دەڵێ : ئەوژنەی ڕێزی مێردەكەی لابێ ، لای منداڵەكانی نەیشكێنێتەوە وڕێزی بگرێت منداڵەكانیشی ڕێزی دەگرن٠یاخود ئەگەرمنداڵەكەیان لاساربێت جنێوبەباوكی دەدات دەڵێ : ئە گەرباوكت چاك بوایە تۆش چاك دەبووی٠زۆرجارئەگەرمێردەكەی توندوتیژنەبێت ژنەكە دەسە لاّتی هەبێ بەسەرمێردەكەی لەبەرچاوی منداڵەكانی جنێوبەمێردەكەی دەدات وای لێدێت مندا ڵەكانیش جنێوبەباوكیان دەدەن یان لە باوكیان دەدەن ،  تاوای لێدێت ئەم خێزانە بچووك ڕێز ی گەورە ناگرێت و هۆكاری ئەم ڕێزنەگرتنەش ژنەكە تاوانبارە ، بەلاّم جاری وا هەیە پیاویش جنێو بەكەس و كاری ژنەكەی دەدات ئەمەش هەڵەیە وای لێدێت شەرم لەنێوانیان دا نامێنێت ژیانەكە دەبێتەدۆزەخ وهەمووڕۆژێك شەڕوجنێولەنێوان ژن ومێرد دا ڕوودەدات وهەریەك لەبە

رچاوی کەس وکاریان یەکتری تاوانباردەکەن٠(ن) دەڵێ : زۆرجارزاواناچارە گواستنەوەدوابخات و
ەك تەواوبوونی خانوویان تەواوکردنی خوێندن ، کەدەبێتەهۆی ئەوەی ماوەی دەستگیراندارییە
کەدرێژبکرێتەوە٠(ك) دەڵێ : پەندێکی عەرەبی هەیە دەڵێ : (من شب علی شیء شاب علیه)
واتا : (لەسەرچ لێ ڕابهێنرێ لەسەرئەوە گەورە دەبێ) بۆنموونە ئەگەردایکەکە بەرامبەرمێردی
توندوتیژبێ ، کچەکەش لەسەرئەوە ڕادێت وڕێزی هاوسەری خۆی ناگرێت٠(ش) دەڵێ : ئەوەی
زۆرگرینگە جیاوازی تەمەن لەنێوان پیاووئافرەت نابێت لە (٥)پێنج ساڵ زیاتربێ ، چونکەلەوا
نەیەلەڕووی بیروبۆچوون وهەڵسوکەوتەوە کێشەدروست بێ٠(س) دەڵێ : پێویستە کچ ڕەفتاری
مێیینانەبێت وهێمن ولەسەرخۆبێت نەك ڕەفتاری نێرینانەبێت بۆئەوەی ئەوپیاوە هەست بکا
ت ڕەگەزێکی جیاوازی هەیە ، هەروەهالەخۆشی وناخۆشی دا پشتیوانی بێت٠(س) دەڵێ : هۆی
هەڵبژاردنی ئافرەتی مامۆستادەگەڕێتەوە بۆهۆکاری کات ، چونکەپیشەی مامۆستایەتی کاتێکی
کەمی پێویستە ڕۆژانە تەنها (٣ — ٤) کاتژمێرە ، ئەویش یان بەیانیان یان ئێواران سەرەڕای سێ
چوارمانگی پشووی هاوین ، کەدەوام ناکات ولەماڵەوەدادەنیشێت بەتایبەتی ئەگەرلەقوتابخانەیە
کی نزیك ماڵی خۆی بێت٠بۆیەدەرفەتی شوکردنی مامۆستازیاترە وەك لەپیشەکانی دیکە٠(ئە)
دەڵێ : ئەگەریەکێکیان پێشتربەدەستگیران بووە لەسەری پێویستەلەهاوسەرەکەی نەشارێتەوە ،
چونکەئەوانەهەرئاشکرادەبن بۆیەباشترە لەیەکدی ببیستن نەك لەیەکێکی دیکە ، چونکە ئەگەر
لەزاری یەکێکی دیکەببیستن متمانەیان بەیەکدی نامینێت ، هەروەهائەگەرژنەکەویستی یارمە
تی ماڵی باوکی بدات پێش مارەبڕین مێردەکەی لێ ئاگاداربکاتەوە٠(ك) دەڵێ : من لەگەڵ ئەوەدا
نیم پیاومووچەی مانگانەکەی هەمووی لەبن دەستی ژنەکەی دابنێ ، پاشان لەبەری بپاڕێتەوە
ڕۆژانەی بداتێ من لەگەڵ ئەوەدانیم ژن وەزیری دارایی ماڵ بێت٠(ش) دەڵێ : ژنهێنان بەنهێنی
ئافرەت تێدازەرەرمەندە ، چونکەهیچ بەڵگەنامەیەکی یاسایی لەبەردەست دانییە تاداوای مافەکا
نی بکات٠(ش) دەڵێ : دەبێ پێش هەمووشتێك ڕەوشتی ئەوکەسە بزانێ نەك تەنها خودیئەوکە
سە ، بەڵکوخێزانی ئەوکەسەش وتایەفەکەشیان٠ (ه) دەڵێ : من حەوت ساڵەژنم هێناوە ژنەکەم
بەقسەم ناکات وهیچ حیسابێکم بۆناکات زۆرکاردەگاتەئەوئاستەی کەوازی لێ بێنم ، بەڵام لەبەر
منداڵەکانم ناچارم تەحەممولی ئەووەزعەبکەم٠(ن) دەڵێ : مووچەی من لە مووچەی پیاوەکەم
زیاترە ، ئێمەهەمووهەوڵ وکۆششێکمان بۆبەخێوکردن ودابینکردنی ژیانی منداڵەکانمانە ، بۆیە
مووچەی هەریەکێکمان لەوی دیکەمان زیاتربێ هیچ لەمەسەلەکەناگۆڕێ٠(ك) دەڵێ : خێزان گر
ینگی خۆی هەیە نابێت نهێنییەکانی بچێتەدەرەوە ، چونکەهەرکاتێك نهێنییەکانی خێزان چوو
ەدەرەوە بنەماکانی بەردەوام بوونی خێزان لاوازدەبێت ، هەروەهاهیچ شتێك وەك قسەهێنان و

بردن گرفت بۆخێزان دروست ناکات٠(زەینەب غەزالی) دەڵێ : لەوکێشانەی ڕووبەڕووی خێزان دەبێتەوە گومان ودڵپیسییە لەنێوان ژن ومێرد دا ، کەهۆی ناخۆشی وشێواندنی ماڵە ، کەزۆرنەگبەتی بەدواوەیە٠هەروەهادەڵێ : لێرەدا هۆکاری زۆرهەن بۆئەوەی هاوسەرگیری بەهرە مەند نەبێ ، لەنێوئەوهۆکارانەش جیاوازی تەمەنە جاری واهەیە جیاوازی تەمەن لەبیست ساڵ تێدەپەڕێ دەگاتە سی تاچل ساڵیش ، جاری واش هەیەتەمەنی ژنەکەلەپیاوەکە گەورەترە بەچە ند ساڵێك٠جیاوازی تەمەن زۆر هۆکاری ناخۆشی لێ دەکەوێتەوە ، بۆم دەرکەوتووە جیاوازی تە مەن ئاساییە نێوان پێنج تادەساڵان ، چونکە کچ زوترلەکوڕ پێدەگات٠دەبینین پیاووژنێك هەرد ووکیان (٥٠ )پەنجا ساڵن ، بەڵام پیاوەکەزۆرلەژنەکەباشتردەمینێ بۆیەجیاوازی تەمەن لەپرۆسە ی هاوسەرگیری دا دەبێ لەبەرچاوبگیرێ٠مانای ئەوەش وانییە بڵێین هەرهاوسەرگیرییەك جیاوا زی تەمەنی تێدالەبەرچاونەگیرێ تێکشکاوە ، زۆرمان هەیە جیاوازی تەمەنیشیان زۆرە ژیانیان پڕەلەخۆشی وبەختەوەری٠هەروەها دەڵێ : کەسێ دەبینین دووجارهاوسەرگیری بکاتەوە لەگەڵ کێشەوبەرپرسیارییەتی زۆرڕووبەڕوودەبێتەوە مەبەستم منداڵەکانە چ هی پیاولەژنی یەکەمی چ هی ژن لەئەوەل مێردی ، چونکە منداڵ بەهەتیوی دەژی لەژێردەستی زڕدایك یان زڕباوك ، دوورلەسۆزی دایك وباوك ولەژێرسێبەری هەست بەزوڵم کردن٠(گ) دەڵێ : ئافرەت کەگەیشتە تەمەنی خۆی شووبکات باشە مانەوەی ئافرەت زیان دەبەخشێ ، پاشان دایك وباوك کەکچ دەدە ن بەشوو هەوڵ بدەن بڕوبیانووبەکوڕەکە نەگرن وەك ئاڵتوونی زۆرومارەیی زۆر ، چونکە ئەمە ڕێگاگرتنەلەشووکردن ، لەکۆتایی دا هیوادارم هەرچی ژن و مێردە ژیانیان وەکو ژیانی ئێمەبە ختیاربی٠(ع) دەڵێ : پێکەوەنانی خێزان کارێکی هێندە ئاسان نییە ، چونکە ژیانی هاوسەری بۆ ڕۆژێك ودووان نییە ئەوەی پەلەبکات دوچاری هەڵەدەبێت٠(ك) دەڵێ : خیانەتی هاوسەرگیری هەرگیزدرێژە ناکێشێت زووبێ یان درەنگ هەرئاشکرادەبێ ئیتربەخوێنڕژان بێت یان بەتەلاقدا ن و وێرانبوونی خێزانەکە٠لەژیانی خێزانی دا خواردن وژەمە خۆراکییەکان تەوەرێکی سەرەکی ژیانەولەڕاددەبەدەربایەخی پێدەدرێ٠(م) دەڵێ : هەندێ پیاوهەن هەمووجۆرە خواردنێك دەخۆ ن ودەڵێن بەزیادبی بێگومان ئەوانە بۆژیانی هاوسەری گونجاوترن٠(س) دەڵێ : لەبەرئەوەی ژیا ن ئەوەندە زەحمەت بووە بەتەنیاکەسێك ناتوانێت بژێوی ماڵێك دابین بکات لەم کاتەدا ، کەزۆر ینەی گەنجان خانوویان نییە ودەبێت کرێی خانووبدەن لەبەرئەوە ئەوکەسەی دەبێت بەهاوسە رت ئەگەرمووچەخۆربێت باشترە٠بەڵام جاری واهەیە کەسەکە خۆی کاسبکارە بەدوای ئافرەتێك دەگەڕێ ، کەمامۆستابێت٠

**هۆكارەكانی قەیرەیی :**

**قەیرە بەوەدەوترێت كەتەمەنی شووكردنی تێپەڕبووەوشووی نەكردووە ودرەنگ كەوتووە لەزە واج ، كە (٣٥)یان (٤٠) ساڵی پێیدەوترێ قەیرە٠**

**١ – خەونی گەورەی كچەكە وەكو خانووی سەربەخۆوزێڕی زۆروئۆتۆمبیل٠**

**٢ – ڕەتكردنەوەی چەندین داواكاری هەریەكەولەبەرهۆیەك٠**

**٣ – پەیوەندی بەستن لەگەڵ كوڕان ، زۆرجاروابووە كوڕەكە بۆخۆی ژنێكی دیكەی هێناوەوكچەكەش قسەی لەدواكراوەوناوبانگی خراپ ڕۆیشتووەوكەس نەی ویستووە٠بۆیەگرێدا نی پەیوەندی كەلەكۆتایی سەرنەكەوتوون دەبێتەهۆی ناوزڕانی كچەكە ئەویش بەزۆری لەكۆ لیژوپەیمانگاكان ڕوودەدات لەوانەیە ئەوناوزڕانەدوای تەواوبوونی كۆلیژیش هەرلەدوی بێت و كوڕانی ترنەچنەداخوازی٠**

**٤ – كۆچكردن بەرەوهەندەران زۆربەی ئەوانەی دەڕۆن سەڵتن ، وایكردووە ڕێژەی كوڕان كەمتر بێ لەچاوكچان٠**

**٥ – هەندێ بنەماڵە كچەكانیان نادەن بەكەسێك كەلەئاستی بنەماڵەكەیان نەبێت لەڕووی دەوڵە مەندی یاخودبەناوبانگی بنەماڵەكەیان٠**

**٦ – نەدانی كچان بەكوڕانی دوورلەخزم وعەشیرەت هۆكارێكی دیكەیە كەكچان بمێننەوە٠**

**٧ – كێشەی نەبوونی وهەژاری بەتایبەتی لاوێك كەدەرچووی زانكۆیە ناتوانێت خەرجی خۆی و خێزان ومنداڵی بەڕێوەبەرێ٠**

**٨ – داواكردنی پارەوزێڕی زۆرلەلایەن هەندێك خێزانەوە٠**

**(ف) دەڵێ : پاشەكی زۆروادەكات پیاوبەهەمووهەڵسوكەوتەكانی خێزانەكەی ڕازی بێت نەتوانێت دەستی لێ هەڵگرێت تەنانەت ئەگەرهەمووڕۆژێك گیروگرفتی بۆدروست بكات وژیانیشی لێ تاڵ بكات٠(س) دەڵێ : من وەكوكچێك كەواشووم نەكردووە داواكردنی زێڕی زۆربەشتێكی بێمانادەزانم ، بەڵام داواكردنی ماڵی بەجیابەگرینگتردەزانم ، كەهۆكاری سەربەستی ئافرەتە ، خشڵ وزێڕبەلای منەوە ئافرەت ئاسوودە ناكات ، بەڵام ماڵی جیابەپێچەوانەوە ئاسوودەت دەكات٠(ك) دەڵێ : ئەوەی لەژیانی خێزانی دا گرینگەخۆشحالییە ، ئەگەرنانی ڕەقت هەبێ بیخۆی گرینگ نییە ، بەڵام بەئارامی بژی٠(گ)دەڵێ : هەندێ لەخێزانە كان هەربەمنداڵی كچەكانیان دەدەن بەشوو بۆئەوەی تووشی كێشەنەبن٠ چاولێكەریش دەوردە بینێ بۆنموونە : كاتێك كچێك خزمێك یان هاوڕێیەكی شوودەكات ئەویش حەزدەكات شووبكات ماڵ وحالی خۆی هەبێت وئاڵتوونی بۆبكڕێت٠(ف) دەڵێ : من باوكم نەماوەوئاستی بژێوی ژیانما ن باش نەبوو بۆیەمن لەتەمەنی چواردەساڵی شووم كرد تابچمەماڵی خۆم وژیانێكی خۆشترببە**

سەر٠(ش)دەڵێ: زەحمەتە شوکردن لەوتەمەنەسەرکەوتن بەدەست بهێنێت ، چونکەهاوسەرگیری بەرپرسیارییەتییە٠(ڕ) دەڵێ : ئامێرەکانی گەیاندن ڕاستەوخۆکاریگەری لەسەرلەسەرکەمکردنە وەی پەیوەندی نێوان هاوسەران دروست دەکات٠ (ل) دەڵێ : دایك وباوك دووکەسی زۆرگرینگن لەژیانی منداڵ بەتایبەتی لەژیانی قوتابی دا ، ئینجا ئەگەردایك وباوك بەردەوام دەنگیان لێوە بێ دەبێتەهۆی دڵتەنگی وخەم وخەفەت بۆمنداڵەقوتابییەکان و کاریگەری زۆرخراپی دەبێت بۆدەروونی قوتابییەکەودەبێتە هۆی دواکەوتنی خوێندن٠ (س) دەڵێ : چونکەزۆرخەڵکی حە سودهەیە لێت تێکدەدەن بۆیە من حەزدەکەم زووبگوازرێمەوە٠ (ئا) دەڵێ : ئەگەرکارێکی زەرو ری نەبێت وەك خانوودروستکردن وخوێندن تەواوکردن لەبەرچی دەستگیراندارى زۆربخایەنێ؟
٩ – خزمەتکردنی دایك وباوکی پەککەوتە کەکارێکی مرۆڤایەتییە زۆرجارڕێ لەکچەکەدەگرێت شووبکات ووای لێدەکات بکەوێتەناوتەمەنەوە٠
١٠ – بەئاسانی سەفەرکردن بۆدەرەوەی وڵات وڕابواردن لەوێ کەوالەوگەنجەدەکات خۆی بەدوور بگرێت لەپێکهێنانی خێزان٠

## ئایاکێ زەرەرمەندە لەنەهێشتنی فرەژنی (زۆرژنی) پیاویان ئافرەت ؟

فرەژنی ئەوەیە کەپیاولەیەك کات دا لەژنێکی زیاتری هەبێت٠ ئاینی ئیسلامیش ڕێی داوە بە مەرجی دادپەروەری لەهەرێمی کوردستان کاتێك پیاودەیەوێت ژنی دووەم مارەبکات پێویستە ژنی یەکەمی ڕازینامەیەکی نوسراولەپێش دادگا ئیمزابکات ، تا پیاوەکە بە شێوەیەکی یاسایی ئەم کارە ئەنجام بدات٠زانایانی سایکۆلۆجی وای دەبینن کەفرەژنی ئارەزوێکی خۆڕسکەلای پیا وان٠

هۆکاری ئەوەی ئافرەتانی ئەم دنیایە ناڕازین بەفرەژنی وحەزناکەن مێردەکانیان ژنیان بەسەر بێنێ لەبەرچەند هۆیەکە ، یەکەم دەترسن پیاوەکانیان دادپەروەرنەبن ومافیان پێشێل بکەن٠ دووەم : ژنی دووەم ومنداڵەکانی بەشداردەبن لەداهات ومیرات٠هەروەهازۆربەی ئەوپیاوانەی ڕە خنەلەفرەژنی دەگرن (هەموو نا) خۆیان ئیکتیفابەیەك ژن ناکەن ولەژێرەوە پەیوەندییان بەژ نی ترەوەهەیە ، پاشان ئایاکێ لەفرەژنی (زۆرژنی) سوودمەندەوکێ زەرەرمەندە ؟ زانراوە کەڕێژەی ئافرەتان لەپیاوان زیاترە بۆیە هەردەبێ پیاوزیادلەیەك ژن بێنێ بۆئەوەی هەمووژنێك هەڵی شووکردنی هەبێت ، چونکەئەوانەی هەڵی شووکردنیان نابێ دەبێت تاماون دان بەخۆیان دابگرن وپەڕاگەندەبن ، چونکەخۆدایك وباوك هەربۆمنداڵەکانیان نامینێن ، پاشان هەرژن نییە مێرد بەپیاوی خێزانداردەکات ؟ کەواتەزەرەرمەند لە نەهێشتنی فرەژنی

بەپلەی یەکەم ئافرەتە ئینجاپیاو٠ئەگەربلێین پیاو ناتوانێت عەدالەت بکات ئەمەش دیسان دەستی ژنی تێدایە ، کەمێردەکەی هان دەدات ستەم لەهەوێکەی بکات٠

"هیرۆدۆت"دەڵێ : ((فرەژنی زانرابوولەلای زۆربەی گەلانی کۆن وەك فارسەکان وزۆربەی گەلان وکۆمەڵگاکانی تریش بەهەمان شێوەپەیڕەکراوە لەوانە : فیرعەونییەکان وهندۆس وبابلییەکان وئاشورییەکان وچینییەکان وگەلانی تریش کەلەوسەردەمانەداژیاون))حەزرەتی ئیبراهییم (علیه السلام)دووژنی هەبووە(سارەوهاجەرە)٠داودپێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێ)ژمارەیەکی زۆرژنی هەبوو٠هەروەهاسولەیمان کوڕی داود(سەلامی خوایان لێ بێ)بەهەمان شێوەفرەژنییان پەیڕەوکردووە کەواتەئەم نەریتەلەکۆنەوەهەرهەبووە٠وەکاتێ ئاینی ئیسلام دەرکەوت سنوری بۆفرەژنی دانا ، کەپێش ئەوکات سنوردارنەبوو٠

(ف)دەڵێ : ئەگەرئافرەتێك بەسالاًچوبوو ، کورپێی ڕازی نەبووتەنیاپیاوی خاوەن ژن پێی ڕازی بوو ستەم نییەرێگری لێ بکرێ شووبکا؟ (گ)دەڵێ: ئەگەرهاتووئافرەتەکەناشز(گوێناڕایەڵ) بووئەوکات پیاوبۆی هەیەلەژنێك زیاتربهێنێ٠

(ك) دەڵێ : فرەژنی لایەنی سلبیشی هەیە ، لویسی چواردەم دەڵێ : زۆرلام ئاسانترە ، کەهەمووئەوروپا لەگەڵ یەکداکۆبکەمەوە لەوەی کەدووئافرەت لەگەڵ یەکدابگونجێنم٠(ن ئە) دەڵێ: ئەگەربەفرەژنی کێشەی قەیرەکچی چارەسەرببێ هەنگاوێکی باشە٠(س)دەڵێ:(( ئەوحەلا لەی کەخوا(جل جلالە) زۆررقی لێ دەبێتەوە تەلاقە ، وەئەوحەلالەی کەئافرەت زۆرڕقی لێ دە بێتەوە فرەژنییە٠))زۆرکچ هەیەدەگاتەتەمەنێکی گەورە هێشتاشووی نەکردووە کەپیاوێکی بە ژن داوای لێ دەکات شووی پێ بکات ئایامافی خۆی نییە وەك هەمووئافرەتێکی دی ببێ بەدایك ؟ (ئا) دەڵێ : من پیاوێك دەناسم لەبەرژنی دووەمی ژنی یەکەمی بەرەڵلاکردووە ، کۆمەڵێك مندا ڵیشی بەرەڵلاکردووە٠(ت) دەڵێ : جاری وایە ژن زۆرخراپ دەبێ لەگەڵ پیاوەکەی ئەوپیاوەناچا ردەبێ ڕێگایەك بگرێ وەك ژنهێنان٠(ش) دەڵێ : من سەربەهەوێ شووم کرد ، چونکە کەمێ چو ومەساڵەوەترسی ئەوەم لێ نیشت ، ئەگەرچەندساڵێکی دی ئاوابمێنمەوە دەبێ کەزی سپی بهۆنمە وە کەس پێم ڕازی نابێ هەرچەندە ئێستامن وژنی گەورە لەگەڵ یەك باشین دیارە ئەگەرپیاو ڕ ێ بەژن نەداوجیاوازیش نەخاتەبەینیانەوە ژن خراپ نابێ من وژنی گەورە یەك سفرە کۆی کر دوینەتەوە بێ یەك ناچینەهیچ شوێنێك ، تەنیاشوێنی خەوتنمان جیایە٠

**لەبارەی دەسەڵاتی ئافرەت بەسەرپیاودا :**

**هەندێك لەپیاوان بەتەواوی دەكەونە دەست ژن وەزۆرلاوازدەردەكەون ، ژنەكانیان لەسەرهەموو شت لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەكەن٠بەپێی ئامارێك كەلەساڵی (٢٠١٣)دا بلاْوكراوەتەوە (٢٧)بیست وحەوت حالەتی دەركردنی پیاوانی بەتەمەن لەماڵەكانیان هەبووە٠هەندێ لەئافرەتان دەیانەوێ پیاوەكانیان لەهەمووبڕیارێك دا مل بدات بۆداواكارییەكانیان ، هەندێكیشیان پێیان خۆش نییە هاوسەرەكانیان كەسایەتییەكی لاوازیان هەبێت٠ (ش) دەڵێ : من ئامادەنیم لەگەڵ كەسێك هاو سەرگیری بكەم كەكەسایەتییەكی لاوازی هەبێت تەنانەت لەبەرامبەرمنیش دا ، چونكە ئافرەتی ئاسایی حەزدەكات هەمیشەهاوسەرەكەی لەخۆی بەهێزتربێت وچاونەترس بێت لەبڕیاردان نە ك واهەست بكات كەخۆی بەهێزترە لەمێردەكەی ، حەزدەكات پارێزگاری لێ بكات نەك نەتوانێ بچوكترین ناڕەزایی دەربڕێ بەرامبەربڕیاری ژنەكەی٠**

**كاتێك پیاولەژنی خۆی بترسێ ، ئەوترسەبەوجۆرەنییەكەلەلێدانی ئافرەت بترسێ ، بەڵكوترس ئەوەیەكەهەندێ پیاولەزمانی خێزانەكەیان دەترسن ، بۆنموونەكابرالەنێومەجلیس ولەنێوماڵ ناوێرێ قسەیەك بكات نەوەك خێزانەكەی پێچەوانەی ئەوبدوێت ، ئەوكات پیاوەكەئارەقەی شەرمەزاری دایدەگرێت٠ئەگەرئافرەت لەسەرگوێڕایەلی ڕانەهێنرێ ئەواكەسێكی یاخی لێدەردەچێ ، هیچ ئامۆژگاری وفەرمان وەرناگرێ جابۆیەدەبێتەسەرچاوەی ئەزیەت وئازارلەبڕی ئەوەی سەرچاوەی خۆشی بێ٠(ك) دەڵێ : لەوانەیەچەندهۆكارێك وابكات ئافرەت قسەی خۆی زاڵبكات یەكێك لەوانەسروشتی ئافرەتەكە ، ئەنجامی ئەوەش كاردەكاتەسەرمنداڵەكانیشیان منداڵەكانیش بەچاوی كەم تەماشای باوكیان دەكەن٠(ش) دەڵێ : پیاوی بەستەزمان ناتوانێ بڵێ ئەمەبالێرەدانەبێ بیخەئەولاوەیان ئەمەمەكەوئەوەبكە یاخودپیاوی ڕۆشەنبیری واهەیەقسەمەتی توشی بەتوشی ئافرەتێكی دواكەوتووی نەزان بووە٠(خ ئە) دەڵێ : تەمەنم پەنجاساڵە ، شەش مانگەژنی دووەمم هێناوە ئێستابەئاسودەیی دەژیم ، هۆی هێنانی ژنی دووەمم دەگەڕێتەوەبۆعینادی ولەیەكنەگەیشتن لەگەڵ ژنی یەكەمم٠ دەڵێ : زیاترلە(٣١)ساڵ لەگەڵ ژنی یەكەمم ژیام نازانم چ ژیانێك بوو؟! چۆن بەرگەی ئەوهەمووئازارەم گرت ، لەماڵەوەدەبوایەهەمووشت قسەی ئەوبوایە تەنانەت وای كردبووكەمنداڵەكانیش لایەنگری دایكیان بن ، لەمنی كردبوونەدوژمن ، كەدوای گەورەبوونی منداڵەكان خێزانەكەخراپتردەبێ بۆیەتاكەڕێگاچارەی ئەوژنانە هێنانی ژنی دووەمە٠(ك) دەڵێ : نەگونجان لەگەڵ یەكتری ، هەروەهاجیاوازی ئاستی ڕۆشەنبیری نێوان هەردوولا ولەیەكنەگەیشتنیان وبەرزی باری ئابوریش وادەكات كەپیاوبیرلەهێنانی ژنی دووەم بكاتەوە ، هەروەهاكەمتەخەمی ژنەكەوهەڵسوكەوتی ناژنانە٠(س) دەڵێ : هەندێك جاربەشێك لەپیاوان بەدەست ژنەكانیان**

لێیان دەدرێ وژیانیان لێ بۆتە دۆزەخ ، لەگەڕەکی (  ) ژنێك دوای ئەوەی چاك لەمێردەکەی دەدات ، ئەوجالەسەرپەیژەکانی ماڵێ فڕێی دەداتە خوارەوە کابرالەدووجێیان سەری دەشکێ٠

## لەبارەی خۆکوشتن :

دیاردەی خۆکوشتن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە ، زۆربەی هەرەزۆری کۆمەڵگاکانی جیهان بەدە ستییەوەدەناڵێنن لەکێشەمەترسیدارەکانی ئەم سەدەیەدەژمێردرێت٠"کارل منجر"پێناسەی خۆ کوشتن دەکات کەبریتییەلەوەی کوشتنی مرۆڤێکەبەدەستی خۆی٠خۆکوشتن لەکاتێکداڕوودەدات ، کەمرۆڤ نائومێد دەبێت وناتوانێت خۆی لەکێشەکان دەربازبکات وپەنادەباتەخۆکوشتن٠خۆکو شتنیش بەچەندجۆرێکە :-

یەکەم – خۆسوتاندن :

ئەم جۆرەخۆکوشتنەزیاترلەناوئافرەتان باوە٠

دووەم – حەب خواردن :

ئەم جۆرەیان بەپلەی دووەم دێت ، کەئافرەتان پەنای بۆدەبەن٠

سێیەم – خۆفڕێدان لەشوێنی بەرز :

ئەم جۆرەیان هەردوورەگەزی نێرومێ دەگرێتەوە٠

چوارەم – خۆکوشتن بەچەك :

ئەم جۆرەیان زیاترپیاوان پەنای بۆدەبەن٠

خۆکوشتن بریتییەلەوەی کەسێك دەستی بچێتەخوێنی خۆی ٠٠٠لەقورئانی پیرۆزیشداخوای گەورەئەمرمان پێدەکات بەنەکردنی (ولا تقتلواأنفسكم ان الله كان بكم رحيما ومن يفعل ذلك عدوانا وظلما فسوف نصليه نارا) النساء : ٢٩

لەزمانی کوردیداوشەی خۆکوشتن لەدووکەرت پێکهاتووە : (خۆ ، کوشتن)واتابەخۆی خۆی کوشت ، نەك بەدەستی کەسێکی تر٠(د ن) دەڵێ : خۆکوشتن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی کۆنەوتایبەت نییەبەکۆمەڵگەیەکەوە ، بەڵکولەدێرزەمانەوە لەنێوزۆربەی کۆمەڵگاکان زۆریان کەم هەبووە٠هۆکارەکانیشی زۆرن لەوانە : زۆربوونی گیروگرفتی کۆمەڵایەتی ، باری ئابوری٠لەیاسای سزادانی عیراقی تەنیاسزای ئەوکەسانەدەدرێ کەهانیداوەولەپشت خۆکوشتنەکەبووە ئەوەلەڕووی یاسایی ، بەڵام لەڕووی ئاینییەوە لەشەریعەتی ئیسلامداخۆکوشتن حەرامە ، لەئاینی ئیسلامداگیانی مرۆڤ ئەمانەتە خودا(جل جلاله) خاوەنیەتی وئەوکەسەی ئەوکارەدەکات لێپرسینەوەی قورسی لەسەرەلەڕۆژی دواییدا٠بەڕای من

خۆکوشتن زۆرترسناکترەلەکوشتنی کەسێکی دیکە ، چونکەئەوکەسەی کەسێك دەکوژێت دوایی لەوانەیەپەشیمان بێتەوە ،بەلاَم ئەوکەسەی خۆی دەکوژێت بواری پەشیمان بوونەوەوتەوبەی لەدەست چووە٠(ك) دەڵێ : مرۆڤ هەرچەندەتووشی ئازاروسەختی بێت بۆی نییەخۆی بکوژێت ولەکێشەوگیروگرفتەکانی ژیان رابکات ، بەڵکودەبێ بەرگەی سەختییەکانی ژیان بگرێت وهەوڵ بدات بەسەرکێشەدازاڵ بێت ، بەوپێیەی ژیان خۆشی وناخۆشییە ، ئازاروسەختی ، هەروەکوخوای تەعالالەسورەتی (البلد) ئایەتی (٤) دەفەرموێ : (ولقدخلقناالانسان فی کبد)٠بۆکەمکردنەوەونەهێشتنی ئەم دیاردەیە : چارەسەری کێشەکۆمەلاَیەتییەکان وچاککردنی باری ئابوری وبەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی ژیانیان،هەروەهاپێویستەبایەخدان بەباوەڕی ئاینی گەشەی پێبدرێت٠

گۆڤاری وەبەرهێنان ژمارە (٤) ی ساڵی (٢٠١٥) بلاَویکرۆتەوەبازرگانێکی دانیشتووی شاریسلێمانی بەهۆی ئەوەی لەکارەکەی شکستی هێنابوو ، بەهۆی کێشەی داراییەوەلەنێوئۆتۆمبیلەکەی خۆی دا فیشەکێك دەنێت بەسەری خۆیەوە دوای گەیاندنی بۆنەخۆشخانە گیان لەدەست دەدات٠ئەوبازرگانەبەهۆی کێشەی داراییەوەمایەپووچ بووبوودوای ئەوەی تووشی زەرەرێکی زۆرهاتبووکەوتبووەژێرقەرزەوە توانای دانەوەی پارەی خەڵکی نەبووبەهۆی زیانی داراییەوەخۆی کوشتووە٠چەندبازرگانێکی تریش بەهۆی گوشاری دەرونییەوەهەوڵی خۆکوشتنیان داوە٠(م)یەکێکەلەوانەی کەخەریکی کاری بازرگانی بووە دوای ئەوەی (٢٠٠)دووسەدهەزاردۆلارپارەی ئەوکەسانەی دەکەوێتەلای کەکاریان لەگەڵ کردووە دەکەوێتەژێرگوشارێکی زۆروتوانای دانەوەی قەرزەکانی نابێت بۆیەفیشەکێك دەنێت بەسەری خۆیەوەبەلاَم هەوڵی خۆکوشتنەکەی سەرناگرێت لەئەنجامداچاوێکی لەدەست دەدات ودەڵێ:ئێستادەزانم هەمووسەروەتی دنیاچاوم چاکناکاتەوە بۆیەزۆرپەشیمانم لەوکارەی کەکردوومە٠ (س م) کەخەریکی کاری بەڵێندەرایەتییە کۆمپانیایەکی تایبەت بەچاککردنەوەی رێگاوبانی هەیە هەچەندەجارێك تووشی شکستی گەورەبووە ، بەلاَم دەستبەرداری کارەکەی نەبووە دەڵێ : ئەوانەی تووشی شکست دەبن دەبێت خۆڕاگربن ، چونکەخێزانەکانیان لەدوای خۆیان مەینەتی دەچێژن٠(ئا) دەڵێ : مرۆڤ مادەم بجولێتەوە تووشی زەرەروقازانج دەبێ زەرەریش بەسەردوولقی سەرەکی دابەش دەبێت ، یەکەمیان زەرەری گیانی ، دووەمیان زەرەری ئابووری٠بۆنموونە : فلاَنەکەس بەسەیارە وەرگەڕا ، خۆی زامداربوو ، واتازەرەری گیانی پێکەوت ، بەلاَم کەئۆتۆمبیلەکەی لەزۆرلاوە شکاوەوقۆپاوەتەوە واتازەرەری ئابووری لێکەوت ، بۆیە وتراوە : (زەرەرلەنیوەی بگەڕێتەوە قازانجە)٠داستانی گلگامێش بۆمان دەگێڕێتەوە کەچۆن گلگامێش لەدوای مردنی ئەنکیدۆی هاوڕێی لەترسی مردن ئۆقرەی لێ برا ، بەلاَم چی

دەربارەی ئەوکەسە بڵێین کەدەرگای ژیان لەخۆی دادەخات وپێشوازی هەڵبژاردنی مردن بکات ؟! دیارە لەولاَتەپیشەسازییەکاندا ڕووداوی خۆکوشتن یان لەناوبردنی خودزۆرزیاترە وەك لەولاَتەکانی تردا بۆیەدەبینین پەیوەندی نێوان دیاردەی خۆکوشتن وپێشکەوتنی تەکنەلۆژیا ڕاستەوانەدەگۆڕێ ، چونکەپێشکەوتنی پیشەسازی کارێکی زۆرلەپەیوەندییەکۆمەلاَیەتییەکان دەکات٠دیاردەیەکی ترلەولاَتەئەوڕوپییەکان دەبینرێ ئەویش ئەوکەسانەی کەخۆیان دەکوژن زۆربەیان لەچینی دەوڵەمەندەکانن ، بۆنموونەلاوێکی ئەمریکی خۆی کوشتووە نامەیەکی لەپاش خۆی بەجێهێشتووە تێیدانوسیویەتی : ((من لاوێکی لەش ساغم هیچ کەم وکوڕییەکم نییە ، پارەیەکی زۆریشم هەیە کەوابوو بۆچی بژیم ؟!))٠هەندێ هۆکاری خۆکوشتن هەیە زۆرنابەجێیە ، کردارێکی شێتانەیە ، بۆنموونە : فوتابییەکی یابانی تەمەن (١٣)ساڵ لەنهۆمی چواردە خۆی فڕێداوەتەخوارەوە ، ئەم کچەنامەیەکی بەجێهێشتووە تێیدا نوسیویەتی : ((دایە ٠٠ بابە٠٠ بمبوورن بڕوام بەژیان نەماوە ، لەبەرئەوەی لەوانەی ماتماتیك نمرەیەکی بەرزم دەستگیرنەبوو ماڵئاوا))٠

خۆکوشتن لەناوڕیزی ئەدیبەکاندا :-

ئەوئەدیب وشاعیرانەی خۆیان کوشتووە زۆرن ، "فرجین ۆلف"پاش ئەوەی تووشی بێز ارییەکی سامناك بوو خۆی خنکاند٠"هارت کرین" خۆی خستەناودەریای کاریبی یەوە٠

ناودارەکانی جیهان لەوانەی خۆیان کوشتووە :-

"مارك ئەنتۆنی" سەرۆکی ڕۆمانیاو خۆشەویستی "کیلۆپاترا" ژەهری خوارد ، دوابەدو ای ئەویش کیلۆپاتراخۆی کوشت٠

"ڕۆزلف" ی پاشای نەمساو"ماریا"ی خۆشەویستی خۆیان کوشت٠

"هیتلەر"ی نازی لەکاتی ڕوخانیا گوللەیەکی بەسەری خۆیەوەناوخۆی کوشت٠

"ڕاندل کاویل" شاعیری ئەمریکی خۆی کوشت٠

"یاسوناری کاواباتا"ی نوسەری یابانی٠

"کلایست"ی شاعیری ئەڵمانی٠

"سادق هیدایەت"ی چیرۆکنووسی ئێرانی٠

نیگارکێشی ناودار "ڤان کۆخ"٠

نوسەری شانۆیی ئەڵمانی "تۆلر"٠

"یوکیومیشیما"ی ڕۆماننوس٠

"سارەکین" خانمەشانۆنووسی بەریتانی٠

گۆڤاری گولآن لەژمارە (٤٠٨)ی ساڵی (٢٠٠٢) بڵاویکردۆتەوە ، کەتاوەکوئێستا(٣٣٦)سێصەدوسی و شەش کەس لەسەرتاوەری (ئیڤڵ) خۆیان هەڵداوەتەخوارەوەوخۆیان کوشتووە٠دەوڵەمەندترین کەس کەلەسەرئەم تاوەرە خۆی کوشتووە ناوی (ژان ماری کلانتیریك)بووە لەڤاتی سێیەمی تاوەرەکە خۆی هەڵداوەتەخوارەوەوخۆی کوشتووە ، ئەم خاتوونەدەوڵەمەندەش کێشەوگرفتی خێزانی هەبووە٠لەشارۆچکەی ڕواندزیش ساڵی (١٩٨٩) کچێك بەهۆی ئەوەی ماڵیان دەبنە بەربەست لەبەردەم خۆی وخۆشەویستەکەی لەسەر(خەرەند) خۆی فڕێداوەتەخوارێ٠هەرلەڕواندزلەساڵی (١٩٩٧) بەهۆی هەمان کێشە خۆی فڕێداوەتە خوارێ ، بەلآم نامرێ٠

خۆکوژییش گوناهەکەی گەورەترە، چونکەکاریگەری تەنهالەسەرئەوکەسەنابێت ، بەڵکوماڵی چەندین کەس خراپ دەکات وچەندین کەس لەگەڵ خۆی ڕاپێچی مەرگ دەکات ، ئەوەی تۆزێك ئاگاداری ئاینی ئیسلام بێت دەزانێت ئەوکارە حەرامە٠هەروەهالەکارەحەرامەکان خۆکوشتن بەهۆی بێکاری نموونەی ئەم بابەتە کوڕەدەرچوویکی زانکۆ،کەکاری عارەبانچی بوو تەڕەی دەفرۆشت وەکوکاردانەوەیەك بەرامبەربەپۆلیس خۆی سووتاندلەتونس ، دواتربووەهۆی هەژانی جەماوەری ، هەروەهالەدوای خۆسووتاندنی دەرچووی کۆلیژ (محمدبن عزیز) ، کەعارەبانچی بوو تەڕەی دەفرۆشت چەندڕۆژێك دوای ئەمە گەنجێکی میسڕی لەبەردەم پەرلەمانی ولآتەکەی خۆی سووتاند٠دوابەدوای ئەمەش گەنجێکی جەزائری لەداخی ئەوەی کەدانامەزرێ خۆی سووتاند٠

## گەڕانەوەی سیستەمی یەکڕەنگی بۆزانکۆباشەیان خراپ ؟

زانکۆئەوناوەندە زانستییەیە تێیدامرۆڤ پسپۆڕی لەبوارێکدا وەردەگرێت وقوتابی خەونی پێوە دەبینێت ، بەتایبەتی لەلەقۆناغی ئامادەیی دا قوتابی زۆربەپەرۆشی زانکۆیە دەڵێ ئاخۆکەی ئەوڕۆژە دێت ببمەقوتابی زانکۆ٠

سەبارەت بەسیستەمی یەك جل وبەرگی ئایائەم سیستەمە هیچ گرفتێکی قوتابیان چارەسەردەکات ؟ دیارەئەوشێوازەلەبەشێکی زانکۆکانی جیهان پەیڕەوی لێ دەکرێ٠لەهیندێك لەزانکۆکانی جیهان ئەم سیستەمەبەبیانووی نەهێشتنی جیاوازی لەنێوان قوتابیان ، وەك نیشانەیەکیش بۆجیاکردنەوەی قوتابی لەکەسێکی ئاسایی پەیڕەودەکرێ٠بەلآم لەهەندێك لەولآتانی کەنداوبەجل وبەرگی جلداشەدەوام دەکەن٠بێگومان سیستەمی یەك جل وبەرگی شتێکی جوانە ، بەلآم ئەوەبەومانایەنییەکەجیاوازی لەنێوان هەژارودەوڵەمەندناهێڵێ چونکەقوتابی دەوڵەمەنددەتوانێ بەزۆرڕەنگ وشێوازی دی خۆیان دەرخەن ولەهەژارەکان جیاببنەوە٠لەم پێشبڕکێ ڕووکەشییەداکچان لایەنی سەرەکین ، چونکەسروشتی ئافرەت وکچ خۆی وایەحەزلەخۆدەرخستن وخۆجوانکردن دەکات٠( )دەڵێ : کەسەردانی کۆلیژەکان دەکەی

وادەزانی چوویەسەیری پیشانگایەکی خستنەڕووی جل وبەرگ ، جل وبەرگی سەیروجۆراوجۆرت بەرچاودەکەوێ کەچی بەداخەوەئەگەرکۆڕێکی ڕۆشەنبیری سازبکرێ بەدەگمەن یەك دووکچت بەرچاودەکەوێ بەشداری بکەن٠بەهەرحال گەڕانەوەی جل وبەرگی یەکگرتووبۆزانکۆشتێکی باشە ، چونکەزانکۆشوێنی زانست ورۆشەنبیرییەنەك ململانێی چینایەتی وخۆدەرخستن٠(ھ) دەڵێ : پلەی دەوڵەمەندوھەژارتاڕاددەیەك دادەپۆشێت ، ھەروەھابەجل وبەرگ قوتابی جیادەبێتەوە لەغەیرە قوتابی وخەڵکی ناقوتابی دەناسرێتەوە لەکۆلیژوپەیمانگاکان٠(س ش) دەڵێ : بەڕای من کارێکی باشە جلی یەکڕەنگی بگەڕێتەوە ، چونکە جۆرە جیاوازییەك دەبێت لەنێوان قوتابی ومامۆستا ، ڕاستە کەقوتابی زانکۆئازادییەکی زیاتری دەوێ ، بەلاَم بەڕای من واباشترە جلی یەکڕەنگ لەبەربکرێ ، ئیجابییەتی جلی یەکڕەنگ ئەوەیە کەئەوقوتابییەدەتوانێ بەیەك دوودەستە جل ساڵەکەی بەڕێ بکات٠ (ك)دەڵێ : ئاشکرایەکەوایەکپۆشی بۆھەرکۆمەڵەیەك شتێکی جوان وسەرنجڕاکێشە ، ئەم کۆمەڵەیە لەکۆ مەڵەکانی ترجیادەکاتەوە بۆنموونە دووتیپ کەیاری دەکەن ھەرتیپەوجۆرە ڕەنگێك دەپۆشێت ئەمەبۆجیاکردنەوەوناسینەوەیانە ، کەدەبینین قوتابی کراسی سپی و پانتۆڵ یان تەنوڕەی ڕە ساسی (خۆڵەمێشی) پۆشیوە ئەمانە قوتابی قۆناغی بنەڕەتین بەھەمان شێوە ، کەقوتابیەك یا ن کۆمەڵە قوتابییەك دەبینین کەکراسی شین وپانتۆڵ یان تەنوڕەی نیلییان لەبەرکردووە دەزا نین ئەمانە قوتابی قۆناغی ئامادەیین ، کەواتەجلەکانیان ناونیشان وناسنامەوھۆکاری جیاکرد نەوەیانە٠

## ئافرەت ولێخوڕینی ئۆتۆمبیل :

بابەتی لێخوڕینی ئۆتۆمبیل لەلایەن ئافرەتانەوە ڕەنگەھەندێك مشتومڕی لەسەربێ٠(ك)دەڵێ : ئاساییەلەناوشاردائافرەت بەبێ مەحرەم شوفێری بکات ، بەلاَم بۆدەرەوەی شارپێویستەپیاوی مەحرەمی لەگەڵدابێت٠ئاماژەبەوەش دەکات پێویستەئافرەت شوفێری بزانێ بۆنموونەئەگەرباوکی نەخۆش بێ بیگەیەنێتەنەخۆشخانە٠(س م)شوفێرێکی ئافرەتەدەڵێ : زۆرجارلەلایەن شوفێرانی پیاوشێوازی شکاندنەوەوپێشبڕکێ لەگەڵماندابەکاردەینن ئەمەش دەبێتەھۆی لەدەست دەرچوونی ئۆتۆمبیلەکان وکارەساتی لێ دەکەوێتەوە بۆیەھیوادارم یاساکانی ھاتووچۆلەئاست ئەم دیاردانەتوندوتیژبن٠(س) دەڵێ : ئەمڕۆئافرەتان ئۆتۆمبیلی خۆیان ھەیە ئەرکێکی گرینگیان لەکۆڵ براومێردوکەس وکاریان کردۆتەوە٠(ش) دەڵێ: ئافرەتان لەکاتی لێخو ڕینی ئۆتۆمبیل دا لەپیاوان ھێمنترن٠زۆرکەم شوفێری ئافرەت سەرپێچی یاساکانی ھاتووچۆدە کات٠(س) دەڵێ : پێویستە ئافرەت وەك پێویستییەك سەیری ئۆتۆمبیل بکات نەك چاولێکەری

بۆنموونه زۆرێك لەوژنانەی ئۆتۆمبیلییان هەیە لێم پرسیون بۆئۆتۆمبیلت کڕیوه ؟ وتوویەتی : من چیم لەم ژنانە کەمترە ، کەئۆتۆمبیلی خۆیان هەیە؟!

## هۆکارەکانی زۆربوونی ڕووداوی ئۆتۆمبیل :

ڕووداوی هاتووچۆیەکێکە لەهۆکارەکانی مردن وسالآنە ڕێژەیەکی زۆرهاولآتیان بەهۆیەوە دەمر ن وگیان لەدەست دەدەن وکەم ئەندام دەبن٠

(ھ)دەڵێ : فاکتەری زۆربوونی ڕووداوی ئۆتۆمبیل دەگەڕێتەوەبۆخێرایی وپابەندنەبوونی شوفێربەیاساکانی هاتووچۆوبەکارهێنانی مۆبایل کەدەبتەهۆی سەرقالکردنی شوفێروبێ ئاگاکردنی تووشی کارەسات دەبێت ، هەروەهاناتەواوی ئۆتۆمبیلەکانیش هۆکارێکی ترە٠(پ ح)دەڵێ : هەبوونی ژمارەیەکی زۆری ئۆتۆمبیل هەمیشەفاکتەرێك بووەبۆقەرەباڵغی وڕووداوی هاتووچۆ٠(ش) دەڵێ : هەندێ لەشوفێران هەیانە هێواش لێ دەخوڕێ ، هەشیانەئەوەندەپەلەیە هەرچەند نەفەری ناوپاسەکەیە توشی ترس ودڵەڕاوکێ دەبێ٠(ك) دەڵێ:ماتۆڕەکان یاسای هاتووچۆپەیڕەوناکەن و گوێ بەچراکانی هاتووچۆوخەتەکانی پەڕینەوەنادەن ، ئەم مەسەلەیەش ترسناکەوگیانی هاولآتییان دەخاتەمەترسییەوە وپێویستی بەچارەسەرکردن هەیە ، چارەش لای پۆلیسی هاتووچۆیە ئاگای لەسەلامەتی خەڵك بێ٠(ل) دەڵێ:ڕۆژانەچەندان کارەساتی مردن وزەرەرمەندبوون و وەرگەڕانی ئۆتۆمبیل ڕوودەدەن ئەمەش زیاتربەهۆی نەبوونی پلان دانان وچڕی دانیشتوانی شارەکان٠(ف)دەڵێ : ڕووداوەکانی ئۆتۆمبیل بوونەتەهۆی ئەوەی خەڵکێکی زۆرپەککەوتەبن یان ئەندامێکی جەستەیان لەدەست بدەن٠(ك) دەڵێ : لەهەندێك شوێن ترافیك لایت دانەنراوە بۆیەڕەنگەچەندین ڕووداوی هاتوچۆلەوشوێنانەڕووبدات هەرچەندە پۆلیسێکی هاتوچۆش لەم شوێنانەدادەنرێت ، بەلآم هێشتا نابێتە بەدیلی ترافیك لایت٠(ب) دەڵێ : کاتێك هاولآتی دەیەوێت لەشەقامێك بپەڕێتەوە دەبێت (٥ — ١٠) دەقیقە چاوەڕێ بێت ئینجادەتوانێ بپەڕێتەوە ، چونکە زۆربەخێرایی ئۆتۆمبیلەکان تێدەپەڕن وزۆربەکەمی بواری پەڕینەوەی هاولآتیان دەدەن٠ئاشکرایە وەك چۆن سەرجەم شەقامەکان بۆهاتووچۆی ئۆتۆمبیل تەرخانکراوە بەهەمان شێوە بەپێی یاساکانی هاتووچۆی هەموودنیا شوێنی پەڕینەوە کەبەهێلی سپی نیشان دەکرێت تالەکاتی پێویست هاولآتیان بەبێ مەترسی بپەڕنەوە٠(س) دەڵێ : ئەگەرئۆتۆمبیلی فرۆك بێتەناوبازاڕەکانەوە جادەوشەقامەکان چۆل دەبن وقەرەبالەغی نامینێ وەهاتووچۆبەئەسپ چۆن کۆتایی هات ئۆتۆ

مبیلەکانیش ئاوالەبیردەچنەوە ، ئەم ئۆتۆمبیلە هاتۆتەبەرهەم ئۆتۆمبیلی فڕۆك بەجۆرێك دروستکراوە کەوەکو(کۆپتەر) دەتوانێ ستوونی (عەموودی) بەرەوئاسمان بفڕێ وبەرەوزەوی بێتەخوارێ هەربۆیە لەمەولانابێ گەراجەکان لەژێرزەمین دابن دەبێ لەسەربانەکان وجێگابەرزەکان بن٠دکتۆر (مۆلێر) کەداهێنەری ئەمجۆرە ئۆتۆمبیلەیە وماموستای خانەنشینی زانکۆی کالیفۆڕنیایە دەڵێ : ببینەبەرچاوتان کەچۆن ئۆتۆمبیلی فڕۆك هەمووجیهان دەگرێتەوە وگرفتی ترافیك وڕێگا گیران نامینێ ، ئەگەرئەم ئۆتۆمبیلە بلاّوبێتەوە ، زانایەك دەڵێ : ئۆتۆمبیلی فڕۆك هەرئەونەخشە دەگێڕێ کەئۆتۆمبیلەکان لەئاست ئەسپەکان گێڕایان٠(ب) دەڵێ : ئەوهەموونوسراووتابلۆیانەی کەلەسەردیواروشەقامەکان هەڵواسراون لەوانەیە ببێتە هۆکارێك خەڵك تاپۆن (دەعم) بکات٠ (ت) دەڵێ : لەناوئۆتۆمبیل شوێنی تەنیشت شوفێرواتا (سوکان) ترسناکە بۆیە لایەنی هاتووچۆ زیاترجەخت دەکەنەوە سەربەستانی (پشتێنی ئەمان)لەم شوێنە ، هەروەها شوێنی شوفێر ، چونکە لەپێشەوەیە زیاتربە(سوکان)دەکەوێت٠بەپێی ئامارێکی پۆلیسی هاتووچۆ لەساڵی (٢٠١٧)دا (٤٤١٠) ڕووداوی ها تووچۆڕوویانداوە بەوهۆیەوە (٦٨٩)کەس گیانیان لەدەست داوەو(٧٢٤٩)کەسیش لەسەرجەم شارە کانی هەرێم برینداربوون٠(ن) دەڵێ : هەموومان دەزانین کەئۆتۆمبیل یەکێکەلەهۆکارەگرینگە کانی خۆشگوزەرانی ژیانی مرۆڤ بەتایبەتی لەکاتی پێویست وتەنگانەدا بۆنموونە کاتێك لەنیوە شەودا یەکێك نەخۆش دەکەوێت بۆگەیاندنی نەخۆشەکە بۆنزیکترین نەخۆشخانەچەندپێویست بەبوونی ئەوئامێرەدەکات٠(پ) دەڵێ : هۆکارێکی ڕووداوەکانی ئۆتۆمبیل بریتییەلەسەرخۆشبوو نی شوفێرەکان٠(ش)دەڵێ : پێویستە پلان هەبێت بۆهاتنەناوەوەی ئۆتۆمبیل بەهۆی بەرزبوونە وەی ئاستی بژێوی هاوڵاتیان بەبێ گوێدانە هیچ شتێك دەستیان داوەتە کڕینی ئۆتۆمبیل٠(ڕ) د ەڵێ : زۆرجارلەبەرقەرەباڵغی بەدووجارلەترافیك دەرنەچووم٠سەرچاوەیەك دەڵێ : لەماوەی (٩)نۆمانگ دا (٤٢٠) چوارسەدوبیست کەس لەهەولێروسلێمانی ودهۆك بەڕووداوی هاتووچۆگیا نیان لەدەست داوە ، ئەمە جگەلەبرینداربوون و کەمئەندام بوون و زیانی ئابوری٠ ئامارێکی ڕ ێکخراوی تەندروستی جیهانی ، دەڵێت : ساڵانە بەهۆی ڕووداوەکانی هاتووچۆ (١٥) پانزە ملیۆن هاوڵاتی برینداردەبن و (٥) پێنج ملیۆن هاوڵاتی دیکەش گیان لەدەست دەدات٠

**ئەمنی قەومی چییە ؟**

**چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی یاخودئاسایشی نیشتیمانی بۆیەکەمجارلەلایەن ئەمریکاوەبەکارهاتووە٠وەك زاراوەلەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە لەکاتی دامەزراندنی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتیمانی ئەمریکالەساڵی (١٩٤٧)٠ئاسایشی نیشتیمانی واتاڕزگاربوون لەمەترسییەکان لەبوارەجیاجیاکاندا لەوانە :-**

**یەکەم – مەترسییەسیاسییەکان**

**دووەم – مەترسییەئابورییەکان**

**سێیەم – مەترسییەکلتورییەکان**

**چوارەم – مەترسییەکۆمەڵایەتییەکان:وەك ئەومەترسییانەی کەشیرازەی خێزان تێکدەدەن٠**

**پێنجەم – مەترسییەتەنروستییەکان : وەك ئایدزوخواردەمەنی ئێکسپایەر٠**

**شەشەم – مەترسییەژینگەییەکان : وەك کەمبوونەوەی ڕووبەری سەوزایی٠**

**سەیران وگەشت وگوزار :**

**ساڵانەلەگەڵ نزیکبوونەوەی وەرزی بەهاردیاردەی ڕووکردنەسەیرانگاکان وهاوینەهەوارەکان بەڕێژەیەکی بەرچاوزیاد دەکات ، ئەمەش بەهۆی گۆڕانی کەش وهەواوبەرقەراربوونی ئەمن وئاسایش وزۆری شوێن وباشبوونی ئاستی بژێوی خەڵك ، بۆیەپێویستەگەشتیارئاگاداربێت وچەندخاڵێك ڕەچاوبکات :-**

**١ – هەڵبژاردنی شوێنی گونجاوولەبار ، مەرج نییەئەوشوێنەناسراوبێت٠**

**٢ – ڕاگرتنی پاکوخاوێنی٠**

**٣ – ئاگاداربوونی منداڵ کەسەریان لەسەیارەدەرنەهێنن ، کەچەندین کارەساتی ناخۆشی لێکەوتۆتەوە٠**

**(ب پ) دەڵێ : هەرلەگەڵ هاتنی وەرزی بەهارلەناوگەلی کوردواباوە دەست دەکەن بەسەیرانکردن وگەشت وگوزاربەتایبەتی ڕۆژانی هەینی خانەوادەکان خۆیان ئامادەدەکەن بۆدەرچوون٠سروشتی مرۆڤ وایەکەلەبەهاردالەگەڵ بینینی دیمەنەجوانەکانی سروشت دڵخۆش دەبێت وهەست بەئاسوودەیی دەکات٠لایەنی دەروونیش بۆتەندروستی مرۆڤ بەسوودە٠بەڵام ئایابەشێوەیەکی تەندروست سەیران دەکرێت ؟ بۆنموونەمرۆڤ لەبەهاردابۆئاسوودەبوونی مێشك وئارامبوونەوەوپشودان دەچێت بۆدەرەوەی شارولەقەرەباڵغی خۆی دووردەخاتەوەبۆئەوەی چەندکاتژمێرێك ژیانێکی ئارام بباتەسەر٠سەیرانکردن بۆئەوەیەمرۆڤ بیرلەدەسەڵاتی خوای**

گەورەبکاتەوە بزانێ چۆن دوای ئەم بەھارەجارێکی تررەنگەکان دەگۆڕێن ولەپایزداگەڵاکان دەوەرن ، لەدوای سەرماوبەفروبارانی زستان جارێکی ترگژوگیاسەوزدەبنەوە٠بەڵام ئێمەبەشێوەیەکی تەندروست سەیران ناکەین بۆنموونە لەیەکەم ڕۆژی نەورۆزداھەرھەمووی بەیەکەوەدەچنەدەرەوە وڕێگاوبانەکان داخراون وھەمووی سەری بەدوای یەك ناوە ئۆتۆمبیلەکان بەپێش یەك دەکەون وەك تەنھائەوڕۆژەھەبێت ڕۆژی ترنەبێت ھەرئەوشوێنەھەبێت وشوێنی ترنەبێت ، ھەربەم ھۆیەشەوە چەندین ڕووداوی ھاتوچۆڕوودەدات ، جائەم قەرەبالغییەچەندین شتی تری لێ دەبێتەوەبۆنموونە کوڕگەل بەدەوری خەڵکدادەسوڕێنەوە بەم ھۆیەشەوەناکۆکی دەکەوێتەنێوان خێزانەکان٠ھەروەھادەنگی تیپی مۆسیقاوتەسجیلی سەیارەخەڵکی ھەراسان دەکات٠ گرینگترین شت ھەرکەسێك کەدەچێتەسەیران بابیرلەوەبکاتەوەئەگەرکەسێك لەئەندامانی خانەوادەکەی پێویستی بە(توالیت)بووچی دەکات ؟ لەسەیرانداھەندێ کەس بەوپەڕی لەخۆبایی ودەرچوون لەیاساکانی ھاتووچۆسەیارەلێ دەخوڕێت ، بەتایبەتی ماتۆڕسکیلەکان بەدەنگی ماتۆڕەکانیان خەڵکیان بێزارکردووە٠دیاردەیەکی ترھەندێ کەس لەسەیراندادەست دەکەن بەخواردنەوەی مەی٠دیاردەیەکی تربەجێھێشتنی پاشماوەی خواردن وحەفازەی منداڵان٠کەواتەسەیران لای ئێمەبریتییەلەماندووبوون وتوڕەبوون وە٠٠٠ھتد٠

## فۆلکلۆرچییە ؟

(سیرولیام جۆن تۆماس)ی شوێنەوارناسی بەریتانی یەکەمجارزاراوەی فۆلکلۆری بۆبابەتەکانی کەلەپوورلەساڵی (١٨٤٨م)بەکارھێناوە٠وشەی فۆلکلۆرلەنوسینی کوردیشدا یەکەمجارلەلایەن خوالێخۆشبێ (مارف بەرزنجی)لەساڵی (١٩٥٨)لەژمارە(٢)ی گۆڤاری شەفەق لەژێرناونیشانی (کوردوفۆلکلۆر)بلاَوکردۆتەوە٠بەشێکی کەلتوری میللەت کەزارەکی فۆلکلۆرە : پەندی پێشینان ، مەتەڵ ، ھۆنراوە ، چیرۆك ، داستان و٠٠٠ھتد دەگرێتەوە٠بەشێکی دیکەش نازارەکییەوەك:شایی وھەڵپەرکێ ونەخش ونیگارورداب ونەریت وچێشتی میللی وپیشەدەستییەکانی وەك : کلاَش وگۆرەوی وساوارکوتان و٠٠٠ھتد دەگرێتەوە٠ئەدەبی فۆلکلۆریش ئەدەبێکەدەماودەم وپشتاوپشت بلاَوبۆتەوەوناوی دانەرەکانی بزربووەوەك پەندی پێشینان ومەتەڵ وداستان وئەفسانە وھۆنراوەی میللی وچیرۆك و٠٠٠ھتد٠نەبوونی یان کەمی ھۆیەکانی کات بەسەربردن ، کۆبوونەوەی خەڵك لەدەوری ئاگردان ھۆکاری باش بووە بۆگێڕانەوەی ئەدەبی سەرزاری ، مەکسیم گۆرکی دەڵێ : ((بناغەی ئەدەب فۆلکلۆرە))٠

**چەندنموونەیەك لەسەرمەتەڵ :-**

**١ – ئەم لادیوارئەولادیوار ، تێیدایەسەگێکی هار ؟ (زمان)**

**٢ – ئەڕواپێی نییە ، هاوارئەکازمانی نییە ، فرمێسك ئەڕێژێ چاوی نییە ؟(هەورەبروسك وباران)**

**٣ – سەری ئەبڕی وبۆی دەگری ؟ (پیاز)**

**٤ – بنوی گایە ، هەستی چیایە ؟ (ڕەشماڵ)**

**٥ – بەقەدهەنارێکە ، پڕبەماڵێکە ؟ (چرا)**

**٦ – هەتابیبڕی درێژدەبێ ؟ (جۆگەلە)**

**٧ – کراسی کەسکە ، گۆشتی سوورە ، هێسکی ڕەشە ؟ (شوتی)**

**٨ – دە دەی لێ بڕوات دە دەمینێتەوە ؟ (پەنجەوانە)**

**٩ – بەهاوین وبەزستان ، لێی دەدەن کۆڵە مستان ؟ (هەویر)**

**سودەکانی مەتەڵ :-**

**١ – ڕۆڵێکی گرینگ لەزاخاودانی مێشکدادەبینێ وهانی بیرکردنەوەدەدات۰**

**٢ – پرسیاروتاقیکردنەوەیەکە ، زیرەکی وهۆشیاری وبیرتیژی کەسەکان دەردەخات۰**

**٣ – ئەوکەسەی مەتەڵەکەهەڵدەینێ هەست بەخۆشی وسەرکەوتنێك دەکات ولەلایەنی دەرونیشەوەباوەڕی بەخۆی پتەوتردەبێ۰**

**٤ – لەجیاتی تەلەفزیۆن وسەتەلایتی هەنووکە ، شانبەشانی چیرۆك وداستان ئامرازی کات بەسەربردن بووە۰**

**پەندی پێشینان :**

**قسەیەکی کورتەمەعنایەکی بەرزی تێدایە ، خاوەنەکەی دیارنییە۰**

**چەندنمونەیەك :**

**١ – (من دەڵێم نێرە ئەودەڵێ : بیدۆشە) ئەوپەندەواتای ئەوەیە کەبەکەسێك دەوترێ کەواداوای شتێك بکات مومکین نەبێ ، چونکە نێرگوانی نییە تاکوشیربدات ئەمەش گێلی ئەوکەسە پیشان دەدات۰**

**٢ – (ژنی شەرمن شارێك دەینی ، پیاوی شەرمن شانەیەك نایني)شەرم بەومانایەناکاتی قسەکر دن ڕەنگی سوورهەڵدەگەڕێ وزاری تێك دەئاڵێ ، چونکەئەم حالەتەبەگرفتەکی دەروونی دادەنر ێ۰**

**لەبارەی نەریتی حەفتیانە :**

ئاشکرایەهەرکۆمەڵگایەك داب ونەریتی خۆی هەیەبۆئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری٠لەکۆمەڵگەی کوردیدا ژن وژنخوازی سەرەتابەخوازبینی وئینجامارەبڕی وپاشان گواستنەوە بەحەفتیانەش کەتایبەتەبەژنان کۆتایی دێ٠مەبەست لەحەفتیانە بردنی دیاری یان پارەیەبۆبووك وزاوا ، وەك کۆمەکی ویارمەتی بۆپڕکردنەوەی پێداویستییەکان٠هەرچەندەوەك نەریتێك لەنێوان خێزانەدەوڵەمەندەکانیش پەیڕەوی لێ دەکرێ٠حەفتیانەش لەماڵی زاوائەنجام دەدرێ لەحەفتەمین ڕۆژی گواستنەوەی بووك بۆماڵی زاوا٠ژنانی کەس وکاری بووك دەچنەماڵی زاوا ، ژنانی ئەوانیش لەوێ لەوێ ئامادەدەبن٠دوای ئەوەی شیرینی وچوکلێت وچەرەزات دەخۆن لەکۆتاییدادووژنی ماڵی زاوایەکێکیان کیسەیەکی بەتاڵ هەڵدەگرێ ، ئەوی تریشیان دەفتەروقەلەمێك بۆوەرگرتن ونوسینی پارەکان ، ئەوەی نەشتوانێ لەوێ ئامادەبێ پارەکەلەگەڵ کەسێکی نزیکی خۆی دەنێرێ٠حەفتیانەجیاوازی چینایەتی ورقابەری وململانێ دروست دەکات لەوانەیەهەندێ کەسیش بەویستی دڵی خۆیان نەیدەنوباری ئابوریشیان خراپ بێ ، بەڵکوبەسەریانداسەپاوەوشەرم دەکەن بەشداری نەکەن٠ (ف ع)دەڵێ : حەفتیانەدیاردەیەکی ناشیرینە ، ئێمەبەش بەحالی خۆمان حەفتیانەناکەین پێمان حەرامە،ئەوەی بیەوێت دیاری بۆیەکێك ببات هەردەیبات ئەگەرحەفتیانەش نەکرێت ، بەڵام ئەگەرکرائەوەدەبێتەئیجباری وناچاردەبی بچیت٠(ڕ ع)دەڵێ:بەڕای من شتێکی باش نییە ، زۆربەیان لەشەرمی ئەوەی نەریتێکەدەبێ بچن پارەی کەم یان دیاری بچووك خۆی بەکەم دەزانێ لەچاودەوروبەرەکەی ژنانیش دەکەونەململانێی یەکتر ، هەروەهادەڵێ:ئەگەرئەوکەسەبرات یان خزمێکت یان هاوڕێیەکی نزیکت بێ وەبزانی پێویستی بەیارمەتی هەیەئەوەزۆرئاساییەدەتوانی یارمەتی بدەیت ، کارێکی زۆرباشیشە٠(ش م)دەڵێ : بەڕاستی حەفتیانەزۆرناخۆشەوناکۆکی دروست دەکات ، چونکەئافرەتی واهەیەبۆخۆدەرخستن ولەڕقی ئەویترزۆرترین پارەدادەنێ ، ئەویتریش ئەوتوانایەی نییە وخەفەت دەخوات وشەرم لەخۆی دەکاتەوە هەرلەبەرئەمەشەزۆرجارکێشەی خێزانی لێکەوتۆتەوە٠(ش)دەڵێ:من ماوەیەك لەبەغداژیاوم ئەونەریتەلەنێوعەرەبانیشداهەیە (سەبعە)ی پێدەڵێن ، بووك وزاوالەوڕۆژەداپارەیەکی باشیان بۆکۆدەبێتەوەزۆرکەم وکورتییان پڕدەکاتەوە ، بەڕای من پارەباشترە ، چونکەتۆنازانی پێویستییان بەچییە پارەکەدەتوانن خۆیان شتێکی باشی پێبکرن٠(ئو) دەڵێ : پارەکەبۆبووك وزاواباشە ، بەڵام بەشێوازی ئیجباری نەبێ ڕۆژێکی دیاریکراونەبێ ئەوڕۆژەنەکەیەبۆنەیەکی ڕەسمی٠

**لەبارەی دەستبلاوی :**

**دەستبلاوی بریتییەلەزیادەڕۆیی وبەفیڕۆدانی خواردن وخواردنەوەوجل وبەرگ وکەل وپەلی ناو ماڵ٠ئاینی ئیسلامیش کۆمەلگەی مرۆڤایەتی بانگهێشت کردووە بۆدەستگرتنەوەومامناوەندی لە خەرج ومەسرەف ، هەروەها ڕژدی وڕەزیلیشی حەرامکردووە٠ ڕۆڵی گرینگی ئافرەتانیش لەسەر پەرشتی کردنی ئابوری ماڵدا دەردەکەوێ ، چونکەئافرەت ئەگەرماڵداربێ دەتوانێ بەشێك لەدە ستکەوت وداهاتی خێزانەکەی پاشەکەوت بکات٠**

**ئارەزووی شت کڕین وزێدە مەسرەف کردن ، کەزۆرجارکێشەکانی ناوخێزان لەنێوان ژن ومێردپەیدادەبێت بەتایبەتی ئارەزووی بێئەندازەی ژنان لەشت کڕین وزێدەمەسرە فکردن٠بەتایبەتی ئەگەرپیاوەکە فەرمانبەربێت ، فەرمانبەریش مووچەکەی دیاریکراوە جائەگەرکرێچیش بێت ئەواوەزعی خراپتریش دەبێت٠بۆئەوەی مرۆڤ بتوانێت ماڵ ومنداڵی بەخێوبکات دەبێ بەگوێرەی داهاتی خۆی خەرجی بکات ناشبێ خەرجییەکان لەداهاتی مانگانەی زیاتربێت ، بەڵکودەبێت کەمتربێت ئەگیناتووشی قەرزاری دەبێت ، قەرزەکەی پێنادرێتەوەوتووشی کێشەدەبێت٠بەتایبەتی زۆرئافرەت هەیە بێ شومارپارە خەرج دەکەن لەشتی ناپێویست خەرجی دەکەن وەکو شوشەوات٠ڕیکلامی ڕادیۆوتەلەفزیۆنەکانیش هۆیەکی کاریگەرە بۆهاندانی ئافرەتان بۆشت کڕین ، بێگومان بچێتە هەردوکانێکیش بێ کڕینی کۆمەڵێك شتی ناپێویست نایەنەدەرەوە٠زۆربەی پیاوانیش بەدەست زێدەمەسرەفکردنی ژنەکانیان گیریان خواردووە ، چەندین جاربۆتەشەڕوناخۆشی لەنێوانیان ، ژنیش هەیەبەکاریگەری چاولێکەری وخۆبادان شتی بێسوودوناپێویست دەکڕێت ، چونکە فلان وفیسارئەوشتەی کڕیوە ئەویش دەیانکڕێ ژنیش هەیەهەربەسروشتی خۆی دەستبلاوە پارەی لاگیرنابێ٠(ش ع) دەڵێ : لەکۆنەوە کورد گوتوویەتی : (ئاووئاوەدانی) دیارە ئاوهۆی مانەوەی مرۆڤە لەسەرئەم هەسارەیە ، کەبەنەبوونی ئەم سامانە کۆتایی بەهەمووزیندەوەرێك دێ٠ئێمە کاتێك بەشکانی بۆڕی یان هەرهۆیەکی دیکە تووشی بێ ئاوی دەبین هەراسانی ڕوومان تێدەکات وئەوجالەگەورەیی بوونی ئاودەگەین ، کەتاچەندئاوبۆژیان پێویستە ، بەلام بێ گوێدانە ئەوگەنجینەیە ئاوێکی یەکجارزۆربەخۆڕایی دەڕژێت بێئەوەی تۆزقالێك هەست وبەزەییمان بجولێت هەرکاتێکیش وشکایی هێرشی بۆشوێنێك هێنا تەنانەت ئاژەڵیش ئەوشوێنەبەجێ دێلێ٠**

**(چ ف) دەڵێ : کەسانێکی زۆرهەن لەگەڕەکەکان دا بەلوعە(شێرە)یان لەسەربۆڕییەکاندادانەناوە ، شەووڕۆژئاوی ئەومالانەبەهەدەردەچێت٠(ش ئە)دەڵێ : ژمارەی لەچکەکانم لەژمارەنایەن٠**

**ئامۆژگاری بۆپاشەکەوت کردن :**

١ – وزەی کارەبازۆرسەرف نەکەین ، چونکەپارەی کارەبابەشێکی بودجەی خێزانی دەبات تەنیائەوژوورەگەرم یان ساردبکەین کەلێی دادەنیشین٠
٢ – ئەوجۆرەگڵۆپانەبەکاربێنین کەکەمترکارەباسەرف دەکەن٠
٣ – هەرژوورێکی بەکارنەیەت گڵۆپی لێ پێنەکرێ٠
٤ – ماوەیەك لەدامودەزگاوقوتابخانەکان دیاردەی مەشروع تەشەنەی کردبوو ، مەشروع بریتی یەلەوەی چەندکەسێك ڕێکدەکەون ، کەهەریەکەولەلای خۆی بڕەپارەیەك لەلای یەکێك لەبەشد اربووانی مەشروعەکە دایبنێن بۆئەوەی وەك براگەورەیەك سەرپەرشتی مەشروعەکەبکات وەك ڕاکێشانی تیروپشك لەنێوانیان داتاوەکوهەمووما‌نگێك بەشێوەیەکی ڕێك وپێك پارەی مەشروعە کەبەریەکێکیان بکەوێت وتادواکەس پارەکەی وەردەگرێت وکۆتایی بەپرۆسەکەدێت٠ بوونی مە شروع ئەوەیە پارەی کۆکراوەی مەشروع بڕەپارەیەکی زۆرە،کەئەوەی بەری دەکەوێت دەتوانێت شت بۆخۆی بکڕێت وەکوکڕینی کەل وپەل وپێداویستی ناوماڵ ، بەلاَم گرفتی مەشروع ئەوەیە کەپارەی مەشروع وەکوقەرزێك وایە،پاشان دەبێ هەمووما‌نگێك لەکاتی دیاریکراوی خۆی بیگێڕ یتەوە بۆیەواچاکترە ئەوپارەیەی لەمەشروع دایدەنێین هەرلەلای خۆمان گڵی بدەینەوە ، هەروە هامەشروع بۆئەوکەسانەباشە کەمووچەیەکی باشیان هەیە دەتوانن مانگانەبڕەپارەیەك پاشەکە وت بکەن٠
(چ) دەڵێ : گۆڕینی کەل وپەل تائەوئەندازەیە گرینگە ، ئەگەرلەکارکەوتووبن یاخود پێویستییەکی زۆرت پێ هەبێت ، بەلاَم ئێستالەپێویست چۆتەدەرەوە وەك مۆدیلێکی لێ هاتووە٠هەمووتاکێك حەزی لەگۆڕانکاری وشتی تازەیە ، بەلاَم بەمەرجێك کاریگەری لەسەربەڕێوەبردن وخەرجییەکانی خێزان نەبێت٠بەلاَم ئێستاکەل وپەلەکان بەرلەوەی لەکاربکەون دەیگۆڕن تەنانەت زۆرجاربەمۆدیلکردن گەیشتۆتە خانوو وسەیارە ش بەتایبەتی تێکدانی خانوو زۆرترین داهاتی دەوێت ئەمەش دەگەڕێتەوەبۆلاسایی کردنەوەوچاولێکەری ، ئەگەرهەرکەسێك لەسەرمۆدیل بڕوات زیان بەلایەنی ئابووری خۆی وخێزانەکەی دەگەیەنێت٠
(ش) دەڵێ : هەرچەندە ئەوهەمووشتەسەردەمیانە پەیدابووە بۆئەوەی منداڵ لەناوبخەوێت ، بەلاَم من هەشت منداڵم لەناویەك لانك گەورە کردووە واتا بۆهەرهەشت منداڵەکەم تەنیایەك لانکم بەکارهێناوە بۆنموونە کاتێك منداڵێکم دەبوو تادووساڵ لەناولانکم دەخەواند دوایی لانکە کەم هەڵدەگرتەوە ، تامنداڵێکی ترم دەبوو بەم شێوەیە بۆ هەرهەشتیان تەنیا یەك لانکم بەکار هێناوە٠هەرچەندە لەڕووی پزیشکییەوە دەڵێن : لەڕووی جوانییەوە لانك سەری منداڵ ناشیرین دەکات ، پشتی سەری پان دەکات یان کاتێك دایك منداڵەکەی دەبەستێتەوە زۆرجارتوندی دەبە ستێتەوە نایەڵێت خوێن بەباشی هاتووچۆبکات وبگاتەقاچەکانی منداڵەکە ، بەلاَم (ژ) دەڵێ :

ئێمەلەناولانك دا گەورە كراوین بەبێ ئەوەی هیچ عەیبێكمان هەبێ٠

**ڕەزیلی :**

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (وأي داء أدوأ من البخل) واتا : (چ دەردێك لە(ڕەزیلی) خراپترە ؟ )

ڕەزیلی یەكێكە لەوئاكاروسیفەتەخراپانەی كەلەمرۆڤێك دابوونی هەبێت بەتایبەتی ئەگەرئەوكەسە خێزانداربێت٠(ڤ) دەڵێ : ئەگەرپیاوڕەزیل بوو دەستی ناچێتە ئەوپارەیەی بۆخۆشی خەرجی دەكات بۆئاسودەیی خۆی بەكاری بهێنێت ، ئێمەی ئافرەت لەكاتی پرۆسەی هاوسەرگیری یەكێك لەمەرجەكانمان ئەوەیە نابێ ئەوپیاوە ڕەزیل بێ٠(ت) دەڵێ : كەسانێك هەن لەبەر ڕەزیلی زگی خۆیان ومالٚ ومنداڵیان برسی دەكەن ولەخۆشی ژیان بێ بەش دەبن ، پارەت هەبێ نەیخۆی ، نەتبێ ، ئەنجامی هەردوكیان هەرنەخواردنەكەیە ، ئەوجۆرەكەسانەهەربەهەژارحیسابن٠(د) دەڵێ : كۆمەڵێك هۆكارهەن وادەكەن پیاو ڕەزیل بێ ، لەوانە : بارودۆخی خێزان وسەختی ژیان٠خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی ڕژدی وڕەزیلی دەكات ولەگەڵ دەستبلاٚوی : (ولاتجعل يدك مغلولة الى عنقك ولاتبسطهاكل البسط فتقعد ملوما محسورا) الاسراء : ٢٩

ڕەزیلی بۆپیاوخراپترە ، چونكەپیاودارایی ماڵی بەدەستەوەیە ، كەسی ڕەزیل پارەی هەیە ودڵی نایێ خەرجی بكا ، بەڵكوحەزدەكات هەرلەسەریەكی دابنێ٠

**ئافاتی تەنهایی پیاووژن (خەلوەت) :**

لەئاینی ئیسلامدابەڕەهایی تەنهایی ژن وپیاوێكی نامەحرەم حەرامكراوە٠خەڵوەت ئەوەیەكەژن وپیاوێكی نامەحرەم بەبێ بوونی سێیەمێك لەشوێنێكی خاڵی ودوورلەچاوپێكەوەكۆببنەوە ، خەڵوەت هیچ كاتێك ڕێگەی پێنەدراوە ، چونكەكۆبوونەوەلەچۆلیداغەریزەزیاتردەبزوێت٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی : ((لايخلون رجل باءمرأة الاكان الشيطان ثالثهما)) رواه أحمدوالترمذی والحاكم واتا : ((ئەگەرپیاوێك لەگەڵ ژنێكدابەتەنهاكۆبوونەوە ، شەیتان دەبێتەسێیەمیان))٠چونكەلەم كاتانەدامرۆڤ دڵنیاترەوشەیتان ئاسانترخەتەرەدروست دەكات٠ژوانیش دوورلەچاوی خەڵكی دەبەسترا ، كچەكە شوێنی بۆكوڕەكە دیاری دەكرد ، شوێنەكانیش دوورلەچاوی خەڵكی بوو٠(ك) دەڵێ : ڕۆژێكیان كەسمان لەماڵەوەنەبوولەدەرگادرا منیش دەرگام كردەوە كوڕی خاڵەكەم بوو هاتەژوورەوە هەواڵی دایكم وئەوانەی پرسی منیش و

تم : لەماڵەوەنین ، تۆزێك بێدەنگ بوو وتی : (ك) من زۆرهیلاكم تۆزێك دەخەوم منیش وتم : بخەوە هەندێك جل هەیەدەیشۆم جلەكانم شوشت ووامزانی خەوتووە ویستم خۆم بشۆم لەناكاو دەرگای حەمامەكەكراوە دەبینم (ك)ە منیش خێرادەرگاكەم پێوەدا (ك)وتی : نەمزانی تۆیت و تت : جل دەشۆم٠دەرگای حەمامەكەمان دانەدەخرا كاتێك خەریكی سەرشوشتن بووم (ك)هاتەژ وورەوە وباوەشی پێداكردم ودەستدرێژی كردەسەرم ولە(     ) خستم٠دواترهیچ ڕێگاچارەیەك نەبووناچارئاگرم بەردایەجەستە ، (ك) ٦٧٪ ی جەستەی سووتاوە وهیوای ژیانی زۆركەمە ، ( ك) دەڵێ : ئەوەماوەی چوارمانگە ماڵەوەشمان هۆكاری خۆسوتاندنەكەم نازانن٠

ئافرەت وهاتووچۆكردن بەتەكسی :

(ئا) دەڵێ : لەڕاستی دا پێم باش نییە سواری تەكسی بم ، چونكە نازانم شوفێرەكە چ جۆرە كە سێكە وڕەوشتی چۆنە ، هەربۆیەبەپاص هاتووچۆدەكەم بۆهەرشوێنێ بچم٠(د) دەڵێ : ژن دەتوا نێت بەرلەوەی دەست لەتەكسی بەرزبكاتەوە سەیری دەم وچاوی شوفێرەكەبكات هەرلەدوورەوە دیارە ، پاشان ئەگەرشوفێرەكە هەرقسەیەكی كرد ژنەكە وەلامی نەداتەوە یاخود بەتوندی وەلا می بداتەوە٠كچێك دەڵێت شوفێرێك باقییەكەی دامەوەوپارچە كاغەزێكی بچووكی لەگەڵ پارە كەپێدام وناوی خۆی وژمارەمۆبایلەكەی تێدابوو٠(س) دەڵێ : گشت شوفێرەكان وەك یەك نین هەیانەلەگەڵی سواردەبی تەسجیل دەكوژێنێتەوە وتادەتگەینێتە شوێنی مەبەست هیچ قسەیە ك ناكەن ، هەندێكیشیان سەد پرسیارت لێدەكەن : ئەرێ لەكوێ دەخوێنی ؟ كارت چییە ؟ ما ڵت لەكوێیە ؟ بۆیە لەبەرئەوشتانە بەپاص هاتووچۆبكەی باشترە٠

زێڕ :

زێڕلەزمانی كوردی دا (ئاڵتوون) و(زەر)یشی پێ دەوترێ ، لەزۆركۆنەوەئادەمیزادپەی بەدۆزینەوەوبەكارهێنانی زێڕبردووە ، زێڕهەرگیزڕەنگ هەڵناهێنێ وڕەنگی ناگۆڕێ وئافرەت خۆی پێ دەڕازێنیتەوەوجوانی زێڕەكەوجوانی ئافرەتەكەئاوێتەی یەك دەبن٠

خۆجوانكردن وحەزكردن لەخشل وجوانی لەسروشتی ئافرەت دایە٠زێڕكەئاڵتوونیشی پێ دەڵێن ئافرەتان بۆخۆجوانكردن وخۆڕازاندنەوەبەكاری دەینن ، جگەلەوەش خەڵكانی دەوڵەمەندبۆڕۆژی ڕەش هەڵیدەگرن٠لەئاینی ئیسلامدازێڕبۆپیاوان حەرامەلەڕووی زانستیشەوەسەلمێندراوە كەزێڕخرۆكەی سپی لەپیاوان بێ هێزوكەم دەكات٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (احل الذهب والحرير لأناث أمتي وحرم على ذكورها)رواه

النسائي وأمام أحمد٠ واتا : (ئالتوون وئاوريشم بۆئافرەتانى ئوممەتم حەلال كراوە ، لەسەرپياوانيش حەرام كراوە) نەسائى وئيمام ئەحمەد گێڕاويانەتەوە٠هەروەهازۆرلەفەرمايشتەكانى پێخەمبەر(درودى خواى لەسەربێ) بۆنموونە كردويەتييەقەرەبووى خوێنى كوشتنى بەهەڵە ، فەرموويەتى : (وعلى أهل الذهب ألف دينار) واتا : (لەسەرئەوەى زێرى هەيەهەزاردينار) واتا هەزارمسقال زێڕبدات لەجياتى خوێنى كوژراوەكە٠لەكاتى هاتنى ئيسلام خەڵك پارەى زێڕوزيويان بەكاردەهێنا٠زۆرلەحوكمەكان پەيوەندى بەزێڕوزيوهەيەهەروەهازەكات زێڕوزيوى وەكوپارەداناوە ، فەرموويەتى:(وفي كل عشرين مثقالانصف مثقال) واتا : (لەهەربيست ميسقالێك ، نيوميسقال زەكاتى لێ دەكەوێ) هەروەهافەرموويەتى : (ليس فيمادون خمس أواق صدقة) واتا : (كەمترلەپێنج حوقەزيوزەكات نييە)٠ (ڕ) دەڵێ : من لەوكەسانەنيم كەزێڕێكى زۆرداوابكەم ، بەلأم لەبەرتانەى خەڵكى دەبێ زێڕى بۆبكرێت٠(ك) دەڵێ : من واى بۆدەچم كەئافرەت كاتێ داواى زێڕى زۆردەكات مەبەستى بەستنەوەى هاوسەرەكەيەتى٠(م) لەبارەى عەيارى زێڕەوەدەڵێ : ئەگەربتەوێ بۆنموونەعەيار(٢١) دروست بكەى تۆدەبێ (٢١) گرام زێڕلەگەڵ سێ گرام مس يان زيوتێكەڵ بكەى بۆئەوەى ببێتەعەيار(٢١)٠لەبارەى پارەى كاغەزەوە ، چينييەكان يەكەم گەل بوون پارەى كاغەزيان دروست كرد ، لەپاش هەزارساڵ ئەوروپييەكان دەستيان بەدروستكردن وبەكارهێنانى پارەى كاغەزكرد٠پاشان لەنێوزۆرگەلان ئەم پارەتازەيە تەشەنەى كرد ، چونكەزۆرسووك بوو٠بانقى (استۆكهۆڵمى سويسرا) يەكەم بانقەپارەى كاغەزى لەساڵى (١٦٦١) داچاپ كرد وبلأوكردەوە٠وشەى (بانك) لەوشەى (بانكۆ)ى ئيتاڵييەوەهاتووە ، كەبەواتاى ئەوڕەفەبەكاردەهێنرێ كەجۆرەكانى پارەى لەسەردادەنرا٠تائێستادۆلارى ئەمريكى بەيەكەمين پارەى جيهانى دەژمێردرێ لەكارى گۆڕينەوەى پارە لەولأتانى جيهان٠

**لەبارەى دڵپيسى :**

دڵپيسى واتاگومانكردنى كوێرانە لەخوشك ودايك وهاوسەر بێئەوەى هيچ بەڵگەيەكى بۆئەم مە بەستەهەبێت بەردەوام لەترس ودڵەڕاوكێ دەژيت وادەزانێت بەتايبەتى هاوسەرەكەى ناپاكى لە گەڵدادەكات٠

(ئا)دەڵێ : من وەكوكچێك تائێستاكارێكى وام نەكردووە لەماڵەوەدڵيان لێم پيس بێت هەركارێكى كردبێتم پرسم پێيان كردووە ، بەبێ ڕەزامەندى ئەوان هيچ كارێك ناكەم٠(س ع)دەڵێ : من دڵم لەخێزانەكەم پيسە ، لەبەرئەوەى زۆرشت دەكات پرسم پێناكات ياخودكارێك كەپێم ناخۆشەلەدژى من دەيكات ، زۆرجاركاردەگاتەئەوەى بەشەڕبێين٠(ش) دەڵێ : من

وەكوكچێكی خاوەن دەستگیران دڵم لەدەستگیرانەكەم پیس نییە ، بەلأم پێم ناخۆشەقسەلەگەڵ كچان بكات بەدەست خۆم نییە٠دڵپیسی دووجۆرە ، یەكێكیان ئەوحالەتەیە ، كەگومان لەكەسی بەرامبەردەكریٚ ، بەلأم بنەمای هەیە ، چونكەڕەفتاریان قسەیان شتێكی بینراو لەسەربناغەیە ك دڵپیسی لەكەسی بەرامبەردەكریٚ ئەمەش ناكرێت بەنەخۆشی ناوببرێت ، چونكە ئەوئافرەتە شتێك دەكات مێردەكەی دڵپیسی لیٚ بكات٠جۆری دووەمیان ئەوەیە بیٚ بناغەیە گومان لەهەموو شتێك دەكات بەبیٚ ئەوەی هیچ شتێك لەئارادابیٚ٠زۆرجاردڵپیسی هۆكاروپاڵنەرە بۆ ئەنجامدانی تاوان ، پیاوێك دوای تێپەڕبوونی شەش مانگ بەسەرهاوسەرگیرییەكەی ژنەكەی خۆی دەكوژیٚ ، پاشان بەنیازی خۆدەربازكردن جەستەی دەسوتێنیٚ٠ئەم پیاوەلەژنی یەكەمی (١٠) دە ساڵ لە گەڵی مابۆوە هیچ منداڵی نەبوو ، ژنەكە چۆتەلای پزیشك و پیٚی وتووە كەم وكوڕییەكە لە تۆ یەلەمن نییە كاتێك ژنی دووەمی بۆ دڵشادكردنی مێردەكەی خەبەری دەداتیٚ كە ، سكی هەیە دەبیتەباوك ، چونكەلەژنی یەكەمی دە ساڵ لەگەڵی بووە منداڵی نەبووە ئەوپیاوە شێت وهاردە بیٚ وتووشی گومان دەبیٚ ، ئەو پیاوە كە بەهۆی ناكۆكی و گرفتەبەردەوامەكانی لەژنی یەكەمی جودابۆتەوە ژنێكی تری هێناوە ، كەكچێكی باش وخاوەن بڕوانامەی دبلۆمیش بووە پاش تێپەڕ بوونی شەش مانگ ڕۆژێك زۆربەخۆشییەوە پیٚی وتووە سكم هەیە ئەویش بەوهەواڵە شێت وها ردەبیٚ ، چونكە هەمیشەئەوەلەبیری دابووە ، كەژنی یەكەمی پیٚی دەوت : هۆكاری منداڵ نەبوو نەكە تۆی ، بۆیەیەكسەردەست لەخنخنۆكەی دەنیٚ تاتەواودەبیٚ ، چونكەگومانی هەبووە كەئەو سكە لەوبیٚ ، پاشان دەبەیەك نەوتیش بەجەستەی دادەكات ودەیسوتێنیٚ ، بەلأم دوای دەستگیر كردن لەلایەن پۆلیس پشكنینیان بۆكردووە دەركەوتووە كەهیچ كەم وكوڕییەكی نییە٠

خوێندنەوە :

"فڕانسیس بیكۆن" دەڵیٚ : ((تاقیكردنەوەی بیست ساڵ ژیان بەیەك ساڵ خوێندنەوە بەدەست دێت))٠

(س ك) دەڵیٚ: بەڕاستی من ئارامم نییەكتێبێك بخوێنمەوەبەتایبەتی كتێبەئەستوورەكان٠(یا ع) دەڵیٚ : زۆربەی نوسەرەناودارەكانی دونیابەردەوام خەریكی خوێندنەوەبوون٠(ڕ ع)دەڵیٚ : كەمی خوێندنەوەی لاوان دەگەڕێتەوەبۆئەوەی لاوان خۆیان بەمۆبایل وشتی بێسوودخەریك دەكەن٠(هـ ڕ)دەڵیٚ : بەبۆچوونی من هۆكارەكەكەسییە ، چونكەگەنج ئەگەربیەوێت خۆی پێبگەیەنیٚ كەس ناتوانیٚ ڕیٚی لێبگریٚ٠(ڕ)دەڵیٚ : خوێندنەوەزۆرشتی فێركردم لەوانەش فراوانبوونی ئاستی ڕۆشەنبیریم٠(ك)دەڵیٚ:خوێندنەوەیەكێك لەخۆراكەسەرەكیەكانی هزروبیرە

، من بەهۆی خوێندنەوەوەتوانیم ئاستی ڕۆشەنبیریم بەرزبکەم٠(ن)دەڵێ :خوێندنەوەبۆعەقلە ، دەبێ بڵێین گەورەترین فێرگەی ژیانە وخۆشترین خۆراکی هزرە٠(ف)دەڵێ :خوێندنەوەبریتییەلەزانکۆیەکی ڕۆشەنبیری کەهەمووتاکێك دەتوانێ لێیەوەفێربێ وخۆی پێبگەیەنێ٠(ل ھ) دەڵێ : قورئانی پیرۆزشاکارترین کتێبەوژیانی پێخەمبەرانیش (علیهم السلام) بەسوودترین کتێبەکەزۆرسوودم لێ بینیوە٠(ب ب) دەڵێ : بەرزی ئاستی ڕۆشەنبیری بەندەبەخوێندنەوەی کتێب ، تاکی ولأتانی پێشکەوتووبەبەردەوامی گرینگی دەدەن بەخوێندنەوەی کتێب لەنێوفرۆکەوشەمەندەفەروئۆتۆمبیل ، هەروەهالەباخچەوشوێنەگشتییەکان هیچ کات تاکی ئەوولأتانەکاتی زێڕینی خۆیان بەئەنتەرنێت وفەیسبوك ومۆبایل وئەوشتەلەعنەتییانەبەفیڕۆنادەن٠(م ز) دەڵێ : من پێم وایەلەقوتابخانەکان گرینگییەکی تەواوبدرێت بەخوێندنەوە ، کەهەمووقوتابخانەیەك کتێبخانەی تایبەتی خۆی هەبێت ، ئاماژەبەوەدەکات کەلەولأتی بەڕازیل بەم دواییانەیاسایەك دەرچووە کەهەربەندییەك ئەگەرهاتووچەندکتێبێك بخوێنێتەوە ، ئەوابەپێی ژمارەی کتێب خوێندنەوەکەی لەماوەی بەندکردنەکەی کەم دەکرێتەوە ، وەزۆرپێویستەکتێب بۆبەندکراوەکان بۆبەندیخانەکان ببردرێت٠(ش)دەڵێ : جگەلەوانەکانم بەبەردەوامی گۆڤاروڕۆژنامەوهەفتەنامەکان دەخوێنمەوە ، بەلأم هەندێ نوسەرهەن گرینگییەکی زۆربەخوێندنەوەنادەن ، چونکەبەرهەمەکانیان کرچ وکاڵن ، هیچ ئاستێکی ڕۆشەنبیرییان لێ بەدی ناکرێ ، بۆیەمن داوایان لێ دەکەم زۆرتربخوێننەوەوکەمتربنووسن٠(ب) دەڵێ : جگەلەوانەکان حەزبەخوێندنەوەی گۆڤاروڕۆژنامەکانیش دەکەم ، تائێستاچەندین بلأوکراوەی منداڵانم خوێندۆتەوە٠(ش)دەڵێ : من هەرگیزحەزناکەم کاتم بەفیڕۆبدەم ، بەتایبەتی لەکاتی پشوەکاندا ، چونکەئەمڕۆلەهەمووسەردەمێك زیاترچاپەمەنی بەرچاودەکەوێ ، لەنێوئەم چاپەمەنییەنوێیانەشداگۆڤاروڕۆژنامەوبلأوکراوەی بەسوودهەیە ، کەدەبنەمایەی ڕۆشنبیری خوێنەر٠(ئا) دەڵێ : ئەوکاتەی دەست بەتاڵ دەبم دەخوێنمەوە٠(سنیکا)دەڵێ : ((خوێندنەوەماندوویەتی ژیان لەبیردەباتەوە)) (کارلیل)دەڵێ:(( کۆمەڵێك کتێبی چاك سوودی قوتابخانەیەکی هەیە)) (جیمس شارلی) دەڵێ : ((بەدرێژایی تەمەنم ئەوەندە خۆشی وشادیم نەبینی لەوەی کەلەناوکتێبەکانداڕام بوارد))٠(س م) دەڵێ : کتێبخانەشوێنێکی بەسوودە ، دەبێ هەمووومان هەوڵبدەین بۆدەوڵەمەندکردنی بەکتێبی باش٠ (ن) دەڵێ : کتێب چۆن دڵسۆزە بۆئێمە ، ئێمەش دەبێ دڵسۆزبین وبیپارێزین٠حەزدەکەم ئەوانەش کەکتێب لەکتێبخانە وەردەگرن باپارێزگاری لێبکەن ولەکاتی خۆیدا بیگەڕێننەوە٠(د) دەڵێ : من جارێکیان بابەتێکم پێویست بوو ، کەلەگۆڤارێکدا نوسرابوو چەندی دەمکرد ڕووم نەدەهات گۆڤارەکە بکڕم، چونکە

وێنەیەکی زۆرناشیرینی لەسەربوو٠(محەممەدجەمیل عەلی) لە کتێبەکەی دا : (تێڕوانینمان بۆ کتێب) دەڵێ : کتێب سەرەکیترین سەرچاوەی ڕۆشنبیری مرۆڤە لەجیهاندا سەنگی مەحەکی ڕۆ شنبیری وهۆشیاری گەلان٠ئەمڕۆ لەجیهان دا گرینگی پێدانی کتێب بەڕاددەیەکە لەهەندێ ولاَ ت سزای تاوانبارسووك دەکەن ئەگەرچەند کتێبێك بخوێنێتەوە٠ئاماژە بەوەدەکات لەهەشتاکانی سەدەی ڕابردوو لەکوردستان خوێندنەوەی کتێب وگرینگیدان بەکتێب زیاتربووبەبەراورد لەگە ڵ ئێستا٠دەڵێ : ئەوکات کتێب هەزاردانەی لێ چاپ بکرابایە بەزەحمەت دەست دەکەوت ، ئەوکا ت کتێب لە دووسێ هەزارتاپێنج هەزارکەمترنەبوو ، هەروەهائەوکات کتێب هەبوو ژمارەی نو سخەکانی گەیشتبووە بیست هەزار بۆنموونە (دیوانی گۆران) بیست هەزاری لێ چاپ کرا خەڵك بۆکرینی پێشەکی پارەی دەدا٠هەروەهاژمارەی سپاردن مانگێکی پێویست بوو ، چونکە لێژنەیە کی پسپۆڕهەبوو پێداچوونەوەی بۆدەکرد ، بەلاَم ئێستا بەگوێرەی یاسای (٢٤) ساڵی ١٩٩٣ هیچ کتێبێك ڕەتناکرێتەوە ئەمەش هۆکاری زۆری وبۆرییە٠ئەودەزگایانەی کتێبیان چاپ دەکرد بر یتی بوون لەوەزارەتی ڕۆشنبیری عیراق وکۆڕی زانیاری ویەکێتی نوسەران وکتێبخانەی گەلاو ێژلەسلێمانی وکتێبخانەی حەیدەری ، کەمومتازحەیدەری خاوەنی بوو ، هی دیکەش هەبوو سالاَنە پیشانگای کتێب لەلایەن (داروطنی) دەکرایەوە٠دیاردەیەك لەوسەردەمەدا هەبوو خە ڵکی کەکتێبی دەخوێندەوە بەیەکتریان دەوت ، کەفلاَن کتێب دەرچووە باس لەمەدەکات بڕۆن بیکڕن یان بەدواداچوونی بۆبکەن٠بەبڕوای ئەم نوسەرە ئەونوسەرانەی لەوسەردەمەدا کتێبە کانیان پڕفرۆش بوون بریتی بوون لە : مامۆستاعەزیزگەردی وعەزیزمەلاڕەش ومحەممەدی مەلاکەریم ومەلاعەبدولکەریمی مدرس وعبدالله حسن زادەو مستەفاسالح کەریم وهێمنی مو کریانی وعبدالله پەشێوو شوکرمستەفاو٠٠٠هتد٠هەروەهادیوانی گۆران وشێخ نوری شێخ سا لح ومەحوی ونالی کتێبی پڕفرۆشبوون٠دەڵێ : کتێبخانەی گشتی هەولێر(٠٠٠ ١٠١)کتێبی تێد ایە ئەم کتێبخانەیەلەڕێگای وەزارەتی ڕۆشنبیری کتێبی دەست دەکەوێت لەهەندێکیش بەدیا ری بۆی دێت٠سەردانیکەرانی بریتین لە گەشتی قوتابخانەکان وقوتابیانی کۆلیژبۆتوێژینەوە کانیان ٠٠٠ کاتی دەوام لەهەشتی بەیانی تاکوپێنجی ئێوارەیە٠هۆی کەمی سەردانیکردنیان دە گەڕێتەوە بۆکەمی هۆشیاری ودووری کتێبخانەکە٠لەتوێژینەوەیەکدا کە(محەممەدجەمیل عە لی) ئەنجامی داوە کە ئایاکتێب دەبێتەهۆکارێك بۆچارەسەرکردنی کێشەکان ؟ ڕێژەی ٧،٥٣٪ د ەڵێن تاڕاددەیەك٠هۆکاری زۆری بۆئەوەی تاکی کۆمەڵگاڕوولەخوێندنەوەی کتێب بکات لەوانە : وەرگرتنی زانیاری ، چارەسەرکردن وخۆپاراستن لەگرفتەکانی ژیان٠کتێب پێویستی سەرەکی ژیانە بەبەڵگەی ئەوەی خوای تەعالا کتێبی ناردووە بۆپێخەمبەران بۆڕێنمایی وچۆنییەتی ژیا نکردن تابەباشی بژین و بەدەستهێنانی ژیانێکی خۆش لەدنیایەکەی تر٠ لە توێژینەوەکەدا ڕ

ێژەی ٢،٨٤٪ دەڵێن کتێب کاریگەری هەیەلەسەردروستبوونی کەسایەتی مرۆڤ ، چونکە ئەوکەسا نەی کتێب دەخوێننەوە چەند سیفاتێکیان هەیە ، وەك : پاراوی زمان و بیرفراوانی و٠٠٠هتد لەتوێژینەوەکەدا ڕێژەی ٢،٢٤٪ نازانن کتێبخانەی گشتی شارەکەیان شوێنەکەی لەکوێیە! هەند ێ کەس ئەم بیرۆکەیان بەلاوە بیرۆکەیەکی نوێیە کەخێربکرێت بەڕێگای کتێب ، کەکتێب بۆبە ندیخانەببرێت ٤٣٪ دەڵێن بەڵێ ئامادەم هاوکاری پرۆژەیەکی وابکەم٠ نازانرێ خوێندنەوەی چە ندکتێب بەخوێنەرهەژماردەکرێت ئایا یەکێك لەساڵێکدا یەك کتێب بخوێنێتەوە بەخوێنەرهەژ ماردەکرێت ؟ هەروەهالە(٤٥)لاپەڕەبەسەرەوەبەکتێب هەژماردەکرێت ، بەرەوخوارەوەبەنامیلکە هەژماردەکرێت٠سەبارەت بەهەڵبژاردنی کتێب هی واهەیە بەگوێرەی بابەت هی واهەیە بەگوێر ەی نوسەر٠لەبارەی کاتی خوێندنەوە هەندێك بەپێی مەجال وهەرکاتێك بگونجێ٠ لەبارەی پر سیاری چ هۆکارێك هانت دەدات کتێب بخوێنیتەوە ؟ ڕێژەی ٢٧،١٠٪ گەیشتن بەئاستی کەسانی ناسراو ، ڕێژەی ٩،٣٧٪ خۆڕۆشنبیرکردن٠(ه) دەڵێ : بەحوکمی پیشەکەم وەکوماموٚستای زانکۆ دەبێ هەمیشە ، کەچوومە کتێبخانە دووجۆرە کتێب هەڵبژێرم یەکێکیان تایبەت بەپسپۆڕییە کەم بۆئەوەی لەزانستەکەم دانەبڕێم ، دووەمیان ئەو بابەتە جیاوازانەی کە هەست دەکەم پێو یستەلێیان بخوێنمەوە یان زانیاریم لەسەریان نییە٠(ت) دەڵێ : هیچ ڕۆژێك بەبێ خوێندنەوە بەڕێ ناکەم ، لای من خوێندنەوە کاتی دیاریکراوی نییە هەرکاتێ دەرفەتم هەبێ دەخوێنمەوە ئاماژە بەوەدەکات هەندێ کتێب مێشکت ماندوودەکات بەتایبەتی کتێبەفەلسەفییەکان٠هەروەها دەڵێ : سەیرە مرۆڤ زانکۆتەواوبکات نەخوێنێتەوە یان ماموٚستابێت وابزانێ تەواوپێویستی بە خوێندنەوەنییە٠ئەگەرخوێندنەوە خوێنەرنەکات بەمرۆڤێکی ڕەوشت بەرز وابزانم سوودی لە خوێندنەوەکەی نەبینیوە٠(خ) دەڵێ: بارودۆخی دژوارای لەمن کرد بتوانم بخوێنمەوە ، چونکە دڵم پێ خۆش دەبێ ، منداڵەکانیشم لەسەرهەمان ڕێچکەڕاهێناوە هەربۆیە کتێب هاوڕێیەکی د ڵسۆزی منە وزۆرسوودم لێ وەرگرتووە٠(ئا) ڕۆژانەبەبەردەوامی سێ بۆچوارکاتژمێردەخوێنێتە وە پێی وایە کەخوێندنەوە فاکتەری هۆشیاری ودروستبوونی تاکی نەوعییە٠(س) یەکێکەلەخو ێنەرە جیددییەکان ساڵانە شەست کتێب دەخوێنێتەوە لەبابەتەکانی زانستی زمان ، بیرەوەری ، ، ڕۆمان و٠٠٠هتد دەخوێنێتەوە٠ "مەسعودعەبدولخالق" ، دەڵێ :

کتێب لای من برایە ، بۆتاریکی چرایە

کەسە ، پشتە ، پەنایە

جوانترین کتێب لای من فەرموودەکانی خودایە

**ئافرەت چی دەخوێنێتەوە ؟**

**(ل)دەڵێ : من ئەوگۆڤارانەدەخوێنمەوەکەتەنهاباسی مۆدیلی جل وبەرگ وشێوازی ماکیاژلەخۆدەگرێت٠(ب)دەڵێ : تەنهائەوگۆڤارانەدەخوێنمەوەکەباسی مۆدیلاتی جل وبەرگ وماکیاژیاخودباسی ژیانی هونەرمەندان دەکات،چێژلەوبابەتانەوەردەگرم کەباسی ژیانی تایبەتی گۆرانیبێژەلوبنانییەکان دەکات٠(س)و(پ)و(ئا)سێ خوشکن ئەم کچانەتەنهاگۆڤاری ڕۆتاناوزەهرەتولخەلیج دەخوێننەوە ، ئەم سێ خوشکەئەگەررۆژنامەبەرێکەوت بکەوێتەبەردەستیان تەنهاسەیری دوالاپەڕەی دەکەن یان بورجەکان دەخوێننەوە٠بەڵام (ك)کەکچەقوتابییەکی کۆلیژی یاسایەدەڵێ : سەیری هەواڵەکانی تیڤی دەکەم تابزانم ڕووداوەکانی دەوروبەروجیهان چین ورەوشی مرۆڤایەتی لەچ ئاستێکدایە؟ (ح)ئەم کتێبفرۆشەدەڵێ : ڕۆژانەئەوکەسانەی ڕوودەکەنەکتێبخانەکەی من ، زۆربەیان لەرەگەزی نێرن ، بەڵام ئەگەرکچێك ڕووبکاتەکتێبخانەکەم پرسیاری گۆڤاری ڕۆتاناوزەهرەتولخەلیج دەکات٠(ش)دەڵێ : ژنان لەمەجلیسیش تەنیاباس لەجۆری جل وبەرگ وکەل وپەلی ناوماڵ وئەوشتانەدەکەن٠(د)دەڵێ : ژمارەیەکی زۆرلەژنان گرینگی بەراگەیاندنی نوسراونادەن ، تەنیاراگەیاندنی بینراووبیستراوئەویش زیاترگوێ لەگۆرانی وشتی لەوبابەتانەدەگرن٠**

**نوسین :**

**نوسین واپێناسەکراوە : (ئەوهەوڵەیە کەمرۆڤ داویەتی بۆپاراستنی قسە)٠(س ع) ئاماژەبەسێ جۆرە نوسین دەکات :-**

**١ – نوسنی پیاهەڵدەر (مەدحکار) : ئەم جۆرە نوسینە لەهەوڵی ئەودایە ناشیرینییەکان جوان بکات٠**

**٢ – نوسینی ڕوخێنەر : ئامانجی ئەم جۆرە نوسینە شکاندنی بەرامبەرە٠**

**٣ – نوسینی واقیعی : ئەم جۆرە نوسینە هەوڵدەدات واقع وەکوخۆی بنوسێتەوە ، لەنێو واقیع دا چی هەیە بیخاتە ڕوو وەك خۆی باش وخراپ ، جوان وناشیرین٠**

**نوسین ئەرکێکی یەکجارگەورەوپیرۆزە ، بەتایبەتی ئەوانەی نوسینەکانیان دەچێتەناخی دەروونی خوێنەرانەوە ، خوێنەران نوسینەکانیان بەپەرۆشەوەدەخوێننەوە٠(س) دەڵێ : بۆئەوەدەنووسم وەکومرۆڤێك بیروباوەڕی خۆم بەکۆمەڵ بگەیەنم وئەوەی لەژیاندافێریان بوومە ، فێری ئەوانیش بکەم٠هەروەك چۆن ئاودەبێتەهۆی پێگەیاندن ونەش ونمای ڕووەك وگیانلەبەران ، نوسینیش دەبێتەهۆی گۆڕانکاری وبەرەوپێشچوونی ژیانی کۆمەڵگا٠٠٠واتالای من**

نوسین کات بەسەربردن ودراوپەیداکردن نییە ، بەڵکووەزیفەیەکی کۆمەڵایەتی وئەرکێکی زۆرپێویستی سەرشانە٠(ع س) دەڵێ : ناتوانم نەنوسم وەك ئەوماسییەی ناتوانێ لەدەرەوەی ئاودابژی٠(س ش) دەڵێ : بۆیە دەنووسم دەمەوێ ئەوحالەتەهەڵچووە دەروونییەی تێیدا دەژیم دەربڕم٠(ك ع) دەڵێ : شێوەوزمانی نوسین زۆرگرینگە ، ئەگەرنوسین بەزمانی جنێووزبربێت زۆرزەحمەتەلایەنی بەرامبەرگوێت بۆڕابگرێت بۆیەپێویستە بەزمانێکی نەرم وجوان وشارستانیانە بیروبۆچوونی خۆمان بگەینین ، ئەگەربەم شێوەیە نەبێت دەرچوونە لەئازادی وکاریگەری خراپ بۆسەرتاك وکۆمەڵگە دروست دەکات٠

رەخنە :

یەکێك لەوبابەتانەی مرۆڤ لەژیانداروبەڕووی دەێتەوە رەخنەیە٠٠٠(د ش) دەڵێ : بەڕای من رەخنەپێداچوونەوەیەبۆکردەوەکانی مرۆڤ لەچەندکارێکی خراپ ونابەجێ ، کەلەوانەیەئەومرۆڤەهەستی پێنەکات ، جالێرەدارەخنەگرتن لەهەندێ لەوکەسانەداکارێکی باشە بۆئەوەی بتوانێت هەڵەکان دووبارەنەکاتەوە وبەدوای کاری چاك وڕاستدابگەڕێ٠(هـ ئە) دەڵێ : بەبڕوای من رەخنەگرتن ئەوڕێگایەیە ، کەدەبێتەهۆی پێشخستنی مرۆڤ ، یارمەتیشی دەدات بۆچاککردن وبەرەوپێشبردنی کاروچالاکییەکان لەبەرهەمی داهاتووی ، چونکەلەڕاستیدارەخنەدەستنیشانکردنی خاڵی لاوازلەبەرهەم وکاروچالاکییەکان ، کەواتەئەگەربەرهەمێك رەخنەی لێ نەگیرێ ئەواهەرگیزخاوەنەکەی پێش ناکەوێ لەبەرهەمی داهاتوویدا٠(ب خ) دەڵێ : رەخنەگران دووبەشن : رەخنەگری خراپ (ڕووخێنەر) ، رەخنەگری باش (بنیاتنەر)٠کەرەخنەدەگرین پێویستەلایەنی باش وخراپی دەستنیشان بکەین بۆئەوەی ئەوکەسەلایەنی خراپی چاکبکات ولایەنی باشی پەرەپێبدات ، وەهیوادارم رەخنەگران رەخنەی بنیاتنەربگرن بۆئەوەی ئەوکەسانەلەکارەکانیان ساردنەبنەوە ، هەروەك ئەحمەدی خانی (١٦٤٠ – ١٦٩٨م) (ناوی ئەحمەدکوڕی ئیلیاسە ، لەهۆزی خانییە) دەڵێت :

یارەب مەدەدەست خەڵکی ناساز

ڤی شاهیدی دڵڕوبایی تەنناز

(ئە ب) دەڵێ : رەخنەبەشێکەلەئامۆژگاری واتادەست نیشانکردنی عەیب وکەم وکوڕییەکانکاتێك ئێمەهەڵدەستین بەرەخنەگرتن لەکارێك دەبێ رەخنەکانمان بنیاتنەربێ نەك ڕووخێنەر ، بەلەبەرچاوگرتنی ئەم خاڵانەی خوارەوە :-

١ – زانستمان هەبێ دەربارەی ئەوبابەتەی رەخنەی لێ دەگرین٠

٢ – خۆمان بەدووربگرین لەدەمارگیری وهەڵچوون ، هەروەهاجنێونەدەین٠

(هـ ك) دەڵێ : کاتێ یەکێك ڕەخنەی لێ دەگیرێت ، دەبێ بەسینگێکی فراوان وەری بگرێت٠

(ك) دەڵێ : مەرجی ڕەخنەگرئەوەیە خاوەن زانیارییەکی فراوان بێت سەبارەت بەوبابەتەی ڕە خنەی لێ دەگریت ، هەروەهادەبێت لەزمانەوانی زانیارییەکی فراوانی هەبێت٠

زاراوە :

١ — ناوەکانی ڕۆژهەلأت :

ولأتانی ڕۆژئاواچەندناوێکیان بۆڕۆژهەلأت داناوە ، بەپێی سەرچاوەمێژووییەکان سەرەتای بەکارهێنانی ئەم دەستەواژانەدەگەڕێتەوەبۆسەدەی هەژدەی میلادی کاتێك بەریتانیاداگیرکاری لەناوچەکەدادەست پێکرد ، دوای ئەویش فەڕەنسالەسەدەی نۆزدەی میلادیدا٠

١ — ڕۆژهەلأتی سەروو (دوور) :

لەڕووی جوگرافییەوەزۆرلەڕۆژهەلأتی ناوەڕاست فراوانترە ، تایبەتمەندی ئەم بەشەلەوەدایەکەدەڕوانێتەهەردووئۆقیانووسی (هیندی ، هێمن)٠بەلأم ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست گرینگترین بەشەلەڕووی ئابوری وسیاسییەوە٠

٢ — ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست :

ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست گرینگترین بەشە ، تایبەتمەندییەکانی :-

١ — ڕۆژهەلأت بەڕۆژئاواوەدەبەستێتەوە٠

٢ — ناوەندی هەمووجیهانە٠

٣ — زۆردەریای تێدایە ، کەڕێڕەوێکی ستراتیژی نێودەوڵەتییان هەیەلەڕووی جوگرافییەوە٠

٤ — بەدەوڵەمەندترین بەشی جیهان دادەنرێت لەبەرزۆری سامانی نەوتی٠

٥ — دەکەوێتەنێوان هەردووڕۆژهەلأتەکەی تر٠

ڕۆژهەلأتی خواروو :

تایبەتمەندی خۆی هەیەلەڕووی جوگرافییەوە ، سنووری لەڕۆژئاوای ئەنادۆڵ ودەریای ڕەش دەست پێدەکات وکۆمەڵێك هەرێم لەخۆدەگرێت٠

٢ — تەوافوقی :

واتارێککەوتن وڕەزامەندی ، ئەمەش ڕێگەلەزۆرینەدەگرێ کەخۆی بەسەرکەمایەتیدابسەپێنێ ، چونکەیەکێك لەسلبیاتەکانی دیموکراسی زۆرینەغەدرلەکەمینەدەکات بەڕێگەی یاسایی٠

٣ — فیمینیزم :

فیمینیزم وشەیەکی فەڕەنسییە ، ڕیشەلاتینییەکەی لەوشەی (فیمینیا)وەهاتووە کەبەواتای (ژن)دێ٠هەموویاساکانی دنیالەسەر(ئەرك وماف)دامەزراوە بۆنموونە فەرمانبەرێك مافی خۆی

هەیەکەمانگانەموچەکەی وەردەگرێ ، ئەرکیشی هەیەکەبەیانییان لەکاتژمێر(٣٠، ٨)تاکو(٣٠،١) دەوام دەکات٠بۆیەهەریەکەلەپیاووئافرەتیش ئەرك ومافی خۆیان هەیە، بەلأم فیمینیستەکان هەرگیزباسی ئەرکی ئافرەت ناکەن٠ئەرکی شیردان ومندالٚ بەخێوکردن کەوتۆتەئەستۆی ئافرەت ، پیاویش بۆپەیداکردنی خواردەمەنی بۆهاوسەرومندالٚەکانی٠هەروەهایەکێك لەئەنجامەکانی ئەم بزافە بەرپاکردنی دژایەتییە لەنێوان نێرومێ کەبەردەوام ژن وپیاودژی یەك بن ودوبەرەکێ ودژایەتی لەنێوانیانداهەبێ وژن ناشز(گوێنارٚایەلٚ)بێ٠بەردەوام دەلٚێن پیاوهۆکاری هەمووکێشەیەکەوئافرەتیش فریشتەیە٠ئافرەتیان واتێگەیاندووە کەپیاوتۆی کردۆتەکوەیلەوکاری ناومالٚ بۆپیاوەکەت مەکە ، چونکەئەوەچەوساندنەوەیە٠ ئەوانەهەرکاتێك باس لەتوندوتیژی خێزانی دەکەن ئاماژەبەوەدەدەن پیاوان توندوتیژی بەرامبەربەخێزانەکانیان ئەنجام دەدەن لەکاتێکدازۆرلەپیاوان دووچاری توندوتیژی دەروونی دەبنەوەلەلایەن هاوسەرەکانیان٠(ح) دەلٚێ : جاری وایەژنان بەشەرٚەقسەوقیژەقیژئازاری دەروونی پیاوەکانیان دەدەن٠(س) دەلٚێ : لەکۆمەلگەی کوردیداتەنیابەوئارٚاستەیەیەکەپیاوبەدرٚندەکراوەوئافرەتانیش بەفریشتە ، هەروەهادەلٚێ : زۆرجارئافرەتان ساردوسرٚانەمامەلٚەلەگەلٚ هاوسەرەکانیان دەکەن لەرٚووی بایەخ پێدان وبەرٚێوەبردنی مالٚ یاخودزۆربەی کاتەکانیان بەدیارفەیسبوك وئەوشتانەبەسەردەبەن ئەمانەش فشارێکی زۆربۆسەرپیاوان دروست دەکات وجۆرێکەلەتوندوتیژی٠(با)دەلٚێ : ژنان لەرٚێگەی کردنەدەرەوەلەمالٚەوەتوندوتیژی بەرامبەربەپیاوەکانیان ئەنجام دەدەن٠

٤ – ئابوری :

(ئادەم سمث) دەلٚێ : ((زانستی ئابوری ، زانستی مالٚ وسامانە)) ، وشەی ئابوری لەزمانی عەرەبی پێی دەلٚێن : (اقتصاد) ، ئەم وشەیەتەصریفەکانی لەقورئانی پیرۆزدابەم جۆرەهاتووە :-

١ – لەسورەتی مائیدە ، ئایەتی (٩٩) دەفەرموێ : (منهم أمة مقتصدة ) واتا : (هەندێکیان دادپەروەرومامناوەندین لەبیروباوەرٚدا ، نەتوندن تاکێشەدروست بکەن ، نەبێ باکیشن ئاین لەدەست خۆیان بدەن)٠

٢ – لەسورەتی لوقماندا ، ئایەتی (١٩) دەفەرموێت : (واقصد في مشيك) واتا : (بەشێوەیەکی مامناوەندی لەرٚێدابرٚۆ ، نەزۆرلەسەرخۆ ، نەزۆرخێرا)٠ئەمەئەوەدەگەیەنێ ، کەاقتصاد تەنیا سامان نییە٠پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (من اقتصدأغناه الله ، ومن بذر أفقره الله) واتا : (ئەوەی ئیقتیصادبکات لەخەرجکردندا خوا(جل جلاله) دەولٚەمەندی دەکات ، ئەوەش دەستبلأوی بکات خوا(جل جلاله)فەقیری دەکات)٠

٥ – نشووز : (ڕاغبی ئەسفەهانی) دەڵێ : ((نشووز واتالەسەرزەوی بەرزبۆوە٠))کەبەواتای سەرپێچی وسەرکەشی ودەرچوون لەگوێڕایەڵی مێرد ، کەواتەنشووزئەوەیەفەرمانی مێردەکەی جێبەجێ نەکات٠نشووزی پیاویش ئەوەیەپشت لەژنەکەی بکات وبەخراپی مامەڵەی لەگەڵدابکات٠(والتي تخافون نشوزهن) النساء : ٣٤ ئەوەبۆئافرەت بەکارهاتووە٠(وان امرأة خافت من بعلها نشوزا ) النساء : ١٢٨ بۆپیاوبەکارهاتووە ، وشەی بەعل بۆمێردبەکارهاتووە ، چونکەوەك سەییدوگەورەوایەبۆهاوسەرەکەی٠کەواتە نشوزی ژن ئەوەیە ژن لەفەرمانی مێردەکەی دەربچێ وەك ئەوەی بەبێ پرس ماڵ بەجێبێڵێ وبڕوات بۆسەفەروگەشت وگوزارو٠٠٠هتد٠جاهەرکاتێ شتێکی واڕوویدا مێرددەبێ بەقسەی خۆش ئامۆژ گاری بکات ، ئەگەربەئامۆژگاری چارەنەکرا ئەوسامێرد دەتوانێ جێگای لێ جیابکاتەوە وپشتی تێبکاونەچێتە سەرجێگای ، ئەگەربەوەش نەهاتەسەرخەت هەرنافەرمانی دووبارەکردەوە ئەوکا ت مێرد بۆی هەیەلێی بدات بەمەبەستی تەئدیب کردن وتەمبێ کردن ، لێدانەکەش سووکە لێد ان بێ وەنابێ لەڕوخساروجێگای خەتەربدات وەنابێ لێدانێکی خوێناوی وزیانبەخش بێ، بەڵکو لەجێگای بێ مەترسی بدات ، ئەگەربەوەش چارەسەرنەکرا ئەوکات دادوەربۆهەرلایەکیان حەکە مێ دەنێرێ بۆئەوەی یەکیان بخاتەوە ناوبژیوانی بکەن ، ئەگەرهەرچارەنەکرا ئەوکات لێکجیابو ونەوە دێتەپێشەوە٠

٦ – فینۆمۆلۆجیا :

وشەیەکەبەواتای مێشك داگیرکردن دێت ، واتاکەسێك لەهیچ مەسەلەیەك خاوەنی بیروڕاوبۆچوونی خۆی نەبێت ، کەسێکی ترزاڵ بێت بەسەرمێشك وبیرکردنەوەیدا٠

٧ - پاراسایکۆلۆجیا :

پاراسایکۆلۆجی لەشتی ڕاددەبەدەردەکۆڵێتەوە٠وشەی پاراسایکۆلۆجی واتازانستێك کەقوول وفراوانتربێ لەدەروناسی ، هەندێك بەشتێکی جیاوازلەسیحروجادوودایدەنێن ، هەندێکیش بەفێڵ وجادوودایدەنێن بۆنموونە وەك : توانای جولاندنی تەنێك تەنهابەسەیرکردن وبەبێ بەکارهێنانی ماسوولکەکان٠یان بۆنموونە کەسێك توانای هەیە بەسەرئاودابڕوات یاخودبتوانێت ئەودیوی دیواربببینێت ، ئەم دیاردە سەرسوڕهێنەرانە لەژێرگوماندایە ، ئەم زانستە لای هەندێك کەس جۆرێکە لەسیحروجادو ، بەلای هەندێکی ترەوە جیاوازی لەنێوان سیحروپاراسایکۆلۆجی دا هەیە٠

٨ – ئۆکسان :

بریتییە لەسوتاندنی ئۆکسجین لەناوخانەکانی لەش دا٠

٩ — خاوەن ئیمتیاز :

خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەوگۆڤارئەوکەسەیە لەڕووی داراییەوە ڕۆژنامە یان گۆڤارەکەبەڕێوە دەبات ومەرج نییەخاوەن ئیمتیازهەرخوێندەواریشی هەبێ ، بەلاَم سەرنووسەربەپێی دەستوری نێودەوڵەتی پێویستەبەلایەنی کەمەوە بڕوانامەی بەکالۆریۆس یان دبلۆمی هەبێت جگەلەوەش دەکرێ خاوەن ئیمتیازوسەرنووسەرلەتاکەکەسێکدا کۆببنەوە واتا دەکرێ کەسێك سەرنووسەربێ ولەهەمان کاتیش خاوەن ئیمتیازبێ٠

١٠ — پرۆتۆکۆڵ :

پرۆتۆکۆڵ وشەیەکی گریکییە واتا ((پەڕەی یەکەم)) ، وەکوزاراوەش بۆئەم مەبەستانەی خوارەوە بەکارهێنراوە :-

١ — زاراوەیەکە لەیاسای نێودەوڵەتی بەمانای ڕێککەوتن وپەیمانی کاتی هاتووە بەمەرجێك بۆماوەیەکی دیاریکراوبێت٠

٢ — هەمووقسەوبیروڕاوبۆچونێك لەلایەن کەسێکەوە دەنوسرێتەوە٠

١١ — ئۆتۆکراتی :

وشەیەکی گریکی کۆنە بۆفەرمانڕەوایی تاکەکەسیی زۆرداری سەرۆکی ولاَت بەکاردەهێنرێ ، لەم جۆرە ولاَتانەدا یاسانییە ، ئەگەربەناویش هەبێ ناچێتەناوپراکتیکەوە٠

١٢ — ڕۆشنبیری :

ڕۆشنبیری بریتییە لەوکۆمەڵە زانیارییەی کەئادەمیزاد وەدەستی دەینێ لەئەنجامی خوێندنەوەوبیرکردنەوەوئەزموون وتاقیکردنەوە ، خوێندەواربێت یان نەخوێندەوار، چونکە هیچ کەسێك بێبەش نییە لەهۆش وبیروهەلۆێست وویژدان وتاقیکردنەوە٠

١٣ — سەرمایە :

پارەوشت ومەك وکالاَیە بەکاردەهێنرێت بۆمەبەستی بازرگانی٠

١٤ — شەڕی دەروونی :

مەوزوعی شەڕی دەروونی زیاترلەلایەن دەوڵەتەگەورەکان وبەتواناکانەوە بەکاردەهێنرێت بۆکارکردنە سەرئیرادەوجۆری بیرکردنەوەی گەلان و ولاَتانی دیکە٠شەڕی دەروونی شتێکی تازە داهاتوونییە ، بەڵکوزۆرکۆنە دەگێڕنەوە یەکێ لەشەڕە دەروونییەکانی پێش میلادی گرتنی شاری (مەدیەن)بووە لەساڵی (١٢٤٥پ م) کەلەلایەن (جیدون)ەوە گیرا ، گوایە چرایەکی زۆرولێدانی زۆڕناوئەوجۆرە کەرەستانەی بەشەوبەکارهێناوە بۆئەوەی هێزەکەی بەهێزێکی زۆرپیشان بدات ودوژمنی پێ بترسێنێ ، هەروەهایەکێ لەکەرەستەکانی شەڕی دەروونی شکاندنی مەعنەویاتە ، لەمێژووی ئیسلامیش دا دەگێڕنەوە دوای مردنی پێخەمبەر(درودی

خوای لەسەربێ) کافرەکان وەك شەڕێکی دەروونی دژی موسوڵمانەکان دەیانووت : ((ئیسلام کۆتایی پێهات))٠دەربارەی شەڕی دەروونی زانای بەناوبانگ (ئیبن خەلدوون) دەربارەی سەرکەوتنی هەرلەشکرێك دووهۆی دەستنیشان کردووە : هۆی یەکەم بەهێزی سوپاکەوجۆری چەکەکەی وجۆری بەکارهێنانی چەکەکە ، هۆی دووەمیشیان هۆی شاراوەیە کەئیمرۆئێمەناومان ناوە شەڕی دەروونی٠هەروەها پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : (الحرب خدعە) واتا (شەڕفێڵە)٠هەروەها جەنگیزخان لەشەڕەکاندا جاسووسەکانی دوژمنەکانی خۆیان بەکاردەهێنا قەناعەتی پێیان ئەکردن بەڕەلایانی ئەکردوبۆئەوەی لەڕیزی لەشکرەکانیان بلاوی بکەنەوە بەمجۆرە پێش ئەوەی جەنگیزخان دەست بەهێرشەکانی بکات سیخوڕەکانی پڕوپاگەندەیان بلاوەکردەوە ، کەهێزەکەی جەنگیزخان هێزێکی زۆرگەورەوبێ شوومارە بەمجۆرە مەغۆلەکان ترسێکی زۆریان دەخستە نێودڵی دانیشتوانی ئەوشوێنانەی داگیریان دەکرد٠کەواتە کەرەستەکانی شەڕی دەروونی بریتییە لەفێڵ وهەڵخەڵەتاندن وشێواندن ، دوودڵی وترس٠"جون مارتن" وتوویەتی : ((شەڕی گشتی ناتوانرێ بکرێ ، تەنهابەهێرشی سەرلەش ومێشك نەبێ لەیەك کاتدا))٠زاناکان شەڕی دەروونییان وناساندووە ، کەواکارکردنە سەڕاوهەست وعەواتفی خەڵکە لەکاتی شەڕدا یان لە کاتی پێش دەستپێکردنی شەڕ٠ئامانجەکانی شەڕی دەروونی تێکشکاندنی تۆپ ودەببابەوفڕۆکەنییە٠(شاتلی) ڕۆژهەلاتناسە دەڵێت : ((کاتێك بخوازرێ ئیسلام غەزووبکرێ ولەشکۆمەندییەکەی بهێنرێتە خوارەوە دەبێ گرێ وگول لەعەقیدەکەی دروست بکرێ پێویستەهەوڵ وتوانامان لەڕوخاندنی دەروونی لاوانی موسوڵمان وئوممەتی ئیسلام بەکاربېرێ دەبێ گیانی شانازی کردنیان بەقورئان ومێژووەکەیانەوە تێدابمرێت لەجیاتی ئەمانە ڕۆشنبیری ومێژووی جگەلەخۆیان تیایاندابلاوبکرێتەوە ئەوفاکتەرانە فەراهەم بهێنرێت ، کەگیانی مەعنەوییان تێدا دەڕوخێت٠

١٥ — پڕوپاگەندە :

لەکاتی دەستپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانی دا ئینگلیزەکان ناویان لێنابوو : ((شەڕی سیاسی)) ، لای ئەڵمانەکان (شەڕی کەلتوری) ولای ئەمریکییەکان (شەڕی سایکۆلۆجی)پڕوپاگەندە زاراوەیەکی لاتینییەوئەم وشەیەش لەئەسڵدا مانای زیادکردنی درەختە لەڕێگەی قەلەمکردن ، پاشان زاراوەکە بووە بەبلاوکردنەوەی دەنگ وباس ومەعلومات٠

(لاسویل) و(دۆب) دەڵێن : پڕوپاگەندە چەند ئامانجێکی سەرەکی هەیە لەوانە :-

١ - زیادکردنی ڕق وقینە هەڵسان لەدوژمن٠

٢ - ڕاکێشانی ولاتانی بێلایەن بەلای خۆدا٠

٣ - ڕوخاندنی گیانی مەعنەوی دوژمن٠

١٦ – ڕای گشتی :

(ئەلفرێد دی گرازیا) دەڵێ : ڕای گشتی بریتییە لەبۆچوونی جەماوەربەرامبەربەکێشە یەکی کۆمەڵایەتی٠

١٧ – نوخبە :

خەڵکی بەرچاووبەتوانای ناوکۆمەڵن وەك نوخبەی ڕۆشنبیروسیاسی و٠٠٠هتد پێچەوانەکەی واتا تەواوی خەڵکی ئاسایی ناوکۆمەڵگا٠

١٨ – ڕۆتین : ڕۆتین بریتییەلەوەی کەهاوڵاتیان بۆڕاییکردنی معامەلەکانیان دوچاری بینەوبەردەوهاتووچۆوچاوەڕوانییەکی زۆردەبنەوە بۆنموونە خاوەن دوکانێك بۆئەوەی مۆڵەتی تەندروستی بۆدوکانەکەی نوێ بکاتەوە دەبێت سەردانی کۆمەڵێك دام ودەزگای وەك شارەوانی وباجی دەرامەت وهێنانی پشتگیری قائیمقام و٠٠٠هتد بکات ، هەریەکێکیان ڕەنگە ڕۆژێکی پێ بچێ٠جائەگەرفەرمانبەربێت وئیشی بەدایرە کەوتبێ تائیشەکەی بۆتەواودەکرێت دەبێت وازلەهەمووئیش وکارێکی بهێنێ وبکەوێتە دوای معامەلەکەی ژووربەژووری ئەودەزگایە بەسەربکاتەوە ، ئینجابچێتە فەرمانگەیەکی دی لەوێش دەست پێ بکات ، کەئەمڕۆبەشێکی زۆری وڵاتانی دنیا ڕۆتینیان نەهێشتووە بەتایبەتی لەسەردەمی ئێستا کەزۆربەی هەرەزۆری کاروبارەکان بەهۆی کۆمپیوتەرەوە بەڕێوە دەچێت٠

١٩ – پاسەپۆڕت :

واتا(ناسنامەی جیهانی) ، هەروەك (نفوس) ناسنامەی کەسی لەناو وڵاتی خۆی٠

٢٠ – بیمەی کۆمەڵایەتی (تأمين الاجتماعی) :

بریتییەلەزامنکردنی ژیانی ئەوانەی ، کەڕۆژێك لەڕۆژان لەکەرتی تایبەت وگشتی خزمەتیا ن پێشکەش کردووە ، پاشان بەهۆی نەخۆشی یان بەساڵاچوون توانای کارکردنیان نەماوە٠هەروەهازامنکردنی ژیانی ئەوانەش دەگرێتەوە لەکاتی کارکردن تووشی ڕووداویان پێکان وهەرناخۆشییەك دەبن٠

٢١ – ستراتیج :

وشەیەکی یۆنانییە بەمانای (پلانی گشتی)دێت٠ واتا بریتییەلەدیاریکردنی ئامانج وپلانەکان ، هەروەهابەهەموونەونەخشەدرێژخایەنانەدەوترێ کەدادەڕێژرێ بۆپێکانی ئامانجێکی دوور٠

٢٢ – دیمۆگرافیا :

دیمۆگرافیازاراوەیەکی یۆنانییە لەدوو وشەپێکهاتووە : (دیمۆس) بەواتای (خەڵك) ، گرافیابەواتا ی (وەسف)دێت٠

٢٣ — مافیا :

بەهەمووئەودەستەوگرووپ وتاقمانەدەوترێت ، کەکاریان دزین ورێگرتن ورفاندنە٠مافیاناوی کۆ مەڵەیەکی نهێنی بوولەئیتاڵیاسەری هەڵدا٠ئەوانەی دەبوونە ئەندام لەورێکخراوە دەبوایەتوانای چەقۆوەشاندنی هەبوایە ولەگەڵ دزی ورێگری ، ئەم کۆمەڵەیەلەسەدەی (١٥) ی میلادی سەری هەڵدا٠

٢٤ — کودەتا :

بریتییە لەراپەڕینی لەناکاوی گرووپێك لە ئەفسەران یاخود سەربازان یاخود چەندکەسانێکی نز یك لەدەسەلأت بۆروخاندنی دەسەلأت وحکومەت٠جیاوازی لەنێوان شۆڕش وکودەتا ئەوەیە کە شۆڕش لەلایەن خەڵکەوەئەنجام دەدرێ دژی زوڵم وزۆرداری، بەلاّم کودەتالەلایەن چەندکەسێکی دیاریکراوەوەئەنجام دەدرێ٠لەبەرایی هەرکودەتایەکیش هەرزوودەست دەگیرێت بەسەردەزگاکانی راگەیاندن وەکورادیۆوتەلەفزیۆن ورۆژنامەکان ودەزگاکانی تری دەوڵەت٠

٢٥ — تاوانەکانی دژبەمرۆڤایەتی :

واتاهەرکردارێك کەکرابێ دژی دانیشتوانی سڤیل (هاولاّتی — مەدەنی) کەسێك کەلەساحەی شە ڕنییە ، سەربازنییە ، یاخودکۆمەڵکوژی ودوورخستنەوەی دانیشتوان٠

٢٦ — فاشییەت :

مانای زیادەڕەوی لەنەتەوایەتی٠

٢٧ — تۆرانیزم :

بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی تورك بوو ، کەدەیانویست ئەوگەلانەی بەرەگەزتورکن لەدەوڵەتێکی رە گەزی دا کۆبکەنەوە٠

٢٨ — پلۆرالیزم :

بەبیروبۆچوونێك دەوترێ ، کەبڕوای بەفرەیی هەبێت٠

٢٩ — کۆنگرێس :

دەستەی یاسادانان لەئەمریکا ، کۆنگرێس لەدووئەنجومەن پێکدێ، ئەنجومەنی پیران وئەنجومە نی نوێنەران ، دووساڵ جارێك هەڵدەبژێردرێن لەهەرویلایەتێکیش دووپیرهەڵدەبژێردرێن بۆ ئەوەی بچنەناوئەنجومەنی پیران ، کەپێیان دەوترێ (سیناتۆر)٠

٣٠ — الولاء :

واتا : خۆشەویستی ، نزیکبوون ، پابەندبوون ، سەرخستن٠

٣١ — نموونەی بالاّ :

واتایەکێك کەپێی سەرسامەدەیکاتەنموونەی بالأی خۆی ، هەوڵ دەدات لەکردەوە و هەڵسوکەوت

چاوی لێ بکات٠زۆرجارگوێبیستی وشەیەك دەبین بەناوی (نموونەی بالاّ) واتا کەسێك چۆن بووە ئەویش ئاوادەبێت٠بۆنموونە هەندێك کەس وتەی فەیلەسوفێکیان کردۆتەنموونەی بالاّی خۆیان ، هەندێك کەس باوك وباپیریان چۆن بووە وادەبێت٠(س)دەڵێ: نموونەی بالاّی من هاوسەرەکانی پێخەمبەرە (درودی خوای لەسەربێ)٠

٣٢ — سایکۆلۆجیا :

واتازانستی دەروون ، ئامانجی دەروونزانی بریتییەلەتێگەیشتن لەدیاردە دەروونییەکان لەڕێگەی ڕوونکردنەوەی هەردووپرسیاری (چۆن)و(بۆچی) واتابۆچی مرۆڤ شەڕخوازە یان درۆدەکات یان گۆشەگیرە یان وازلەخوێندن دەهێنێ ، ٠٠٠هتد٠بۆنموونە ئەگەرمنداڵێك وەیان هەرزەکارێك سە یری فیلمی جەنگی بکات ئەوافێری ڕەفتاری شەڕخوازی دەبێ٠

٣٣ — کوردناسی :

بەوزانستەدەڵێن ، کەلەهەموولایەنێکی ژیان وکەلتوروزمان ونیشتیمان ومێژووی گەلی کورد دە کۆڵێتەوە٠زاراوەی کوردۆلۆجی بۆیەکەم جارلەساڵی (١٩١٣) لەژمارە (٢)دووی گۆڤاری (ڕۆژی کور د) لەئیستەمبووڵ لەلایەن (عەبدوللاّ جەودەت) بەکارهاتووە٠

٣٤ — فیقه :

وشەی فیقه بەمانای زمانەوانی واتا (تێگەیشتن ، شارەزابوون)٠هەروەك لەم حەدیسەداهاتووە :
(الناس معادن كمعادن الذهب والفضة خيارهم في الجاهلية خيارهم في الأسلام اذافقهوا)
واتا : (خەڵك کانن وەك (کان)ی زێڕوزیو ، باشەکەیان لەنەفامی باشەکەیانەلەئیسلام ، ئەگەر شارەزابێت لەئاینەکەی)٠مانای زاراوەییشی زانستێکەلەزانستی شەرعی٠

٣٥ — فەرز :

فەرزئەوەیە ، کەخوای گەورەلەسەرموسوڵمانانی چەسپاندووە بەکردنی پاداشت وەردەگرێت وبە نەکردنی سزا٠

٣٦ — واجب :

واجب هەروەکوفەرزوایە٠

٣٧ — فەرزی عەین :

لەسەرهەموموسوڵمانێك پێویستەبیکات ، کەس ناتوانێت لەسەری لاببات وەکونوێژ ، ٠٠٠هتد٠

٣٨ — فەرزی کیفایە :

ئەمەلەسەرکۆمەڵی موسوڵمانان داواکراوە ، بەلاّم بەکردنی هەندێکیان ئەوانی ترلەسەریان لادە کەوێ وەکو : نوێژی مردوو ، ٠٠٠هتد٠

٣٩ — سوننەت :

بەكردنی خێری پێدەگات بەنەكردنی گوناهی ناگات٠

٤٠ — مباح :

بەكردن ونەكردنی سزانادرێ ، بەلآم بیكات چاكترە٠

٤١ — حەرام :

لەسەرموسوڵمانان چەسپاوە ، كەنەیكەن بەكردنی گوناهباردەبێت٠

٤٢ — قضاء :

ئەمەفەرمانی پەرستنە، بەلآم لەدەرەوەی كاتی خۆی،وەكوبۆنموونە نوێژكردنی نیوەڕۆلەكاتێكی تر٠

٤٣ — تەیەمووم :

بریتییەلەشوشتنی دەست نوێژولابردنی جنابەت (لەشگرانی) بەخۆڵ٠بەهۆی نەبوونی ئاویاخو دبوونی برین لەلەش كەواترسی هەبێ ببێتەهۆی دژواری برینی لەش یاخودنەخۆشییەك كەوا زیانی پێبگات لەبەكارهێنانی ئاو٠

٤٤ — تەكنیك :

بریتییەلەمەكینەوئامێربۆبەرهەمهێنانی كەرەستەیەكی دیاریكراو٠

٤٥ — ئیئتیلاف :

حكومەتێك لەچەندپارتێك پێكهاتووە هیچیان زۆرینەی كورسییەكانی پەرلەمانیان نەهێناوە ، لەبەرئەوە ئەوپارتانە ئیئتیلاف پێكدەینن ، تابتوانن حكومەت دروست بكەن٠

٤٦ — ئیستیبداد :

حوكمی تاكەكەسێك یان چەندكەسێك ، كەملكەچی هیچ یاسایەك نەبن٠

٤٧ — مانگرتن :

وەستان لەكارە بۆئەوەی فشاربخرێتە سەرخاوەن كار ، تاداواكارییەكانیان جێ بەجێ بكات٠

٤٨ — ئۆتۆكراسی :

حوكمی بێ سنوری تاكەكەسێك٠

٤٩ — بۆرجوازییەت :

چینی خاوەن سەرمایەوكارگە٠

٥٠ — تەكنۆكراتی :

حوكمی پسپۆڕەكان ، وەكوپسپۆڕانی ئەندازیاری وپیشەسازی٠

٥١ — ثیوكراتی :

حوكمی پیاوانی ئاینی٠

٥٢ — سۆسیۆلۆجیا :

کۆمەڵناسی٠

٥٣ — ڕادیکالی : ڕیشەیی ، بنەڕەتی

٥٤ — چاکسازی :

چاککردنی بارودۆخی سیاسی یان کۆمەلأیەتی ، بێ ئەوەی گۆڕینێکی بنەڕەتی بەسەردا بهێنرێ

٥٥ — ئیغتیساب :

دەستدرێژی جنسی٠

٥٦ — سەندیکا :

ڕێکخراوێکی پیشەییە ئەوکەسانە کۆدەکاتەوە ، کەلەبوارەکەی کاردەکەن ، وەك : سەندیکای پز یشکان وکرێکاران و٠٠٠هتد٠ داکۆکی لەمافەکانیان دەکات٠

٥٧ — نیصاب :

ڕێژە یان ژمارەی ئەوئەندامانەی کەپێویستە ئامادەبن ، تادانیشتنەکە یاسایی بێ بۆنموونە دوو لەسەرسێی ئەندامان٠

٥٨ — ئۆلیگارشی :

حوکمی کەمایەتی

٥٩ — احداث :

نەوجەوان ، مێردمنداڵ

٦٠ — ئینتیما :

بەمانای وابەستەیی لەگەڵ ئەوکەسەی یان ئەوشوێنەی ، کەکەسێك پێوەی بەندە وەکو وابەستە یی مرۆڤ بەنیشتیمانەکەی٠

٦١ — نەرگسی :

واتاخۆویستی ، کەخۆی وادەبینێت لەهەمووکەس چاکتروجوانتروزیرەکترە٠ لە ئەفسانەی یۆنانی دا (نێرسیسوس) ناوی گەنجێکی یۆنانی بووە خاوەن ڕوخسارێکی زۆرجوان بووە تەنانەت دیانای خواوەندی مانگ لەئەفسانەی یۆنانی کۆن دا عاشقی بووە لە ئەفسانەکەدا هاتووە کاتێك نێرسیسوس لەئاوێك دا سەیری ڕوخساری خۆی دەکات عاشقی خۆی دەبێت بەم شێوەیە ماوەی چەند ساڵێك نێرسیسوس دەچێتە سەرئەوئاوەوبەردەوام سەیری ڕوخساری خۆی دەکات ، بەلأم دواجاردەکەوێتەناوئاوەکەودەخنکێت٠خواوەندی گەورە (لەئەفسانەی یۆنانی کۆن) وەك ڕێزێك بۆئەوگەنجە لەشوێنی مردنەکەی دا جۆرە گوڵێك دەچێنێت کەهەمووساڵێك لەنزیك بەهاردا دەردەکەوێت وەك یادکردنەوەیەك ناوی گوڵەکە دەنێن (نێرسیسوس)٠

**لەبارەی درۆکردن :**

**درۆکردن دیاردەیەکی ناپەسندی نێوکۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە ، کۆمەڵێك فاکتەرهەن والەمرۆڤ دەکەن درۆلەگەڵ کەسی بەرامبەری بکات ، لەوانەیەدرۆکردن ئامرازێك بێت بۆبەدەستهێنانی بەرژەوەندییەك یان بۆخۆدەرهێنان بێت لەناوخەڵك یان بۆخۆدەربازکردن بێت لەسزایەك٠(ك ڕ)دەڵێ:هەندێك جاردرۆکردن بۆخۆدەربازکردنەلەسزا٠هەروەك چۆن منداڵ لەلێدانی دایك وباوکی ومامۆستاوکەسانی لەخۆی گەورەتردەیەوێت بەدرۆکردن خۆی لەسزادەربازبکات یاخودچۆن یاریزانی تۆپی پێ دەڵێت دەستم بەتۆپ نەکەوتووەلەناوچەی سزایان بۆنموونەدەڵێ : ئەویاریزانەخۆی بەربۆوە ئەمەش تاوەکوخۆی لەسزادەربازبکات وکارتی سۆروزەردی نەدرێتێ کەدەشزانی دەیان کامێرایارییەکەی تۆمارکردووە ، بەلاّم هەردرۆش دەکات٠مامۆستا (س ئە) دەڵێ : لەئاینی ئیسلامداسزایەکی ماددی وەکوپێبژاردن (غەرامە)یان بەندکردن یان دەست بڕین نییە ، بەلاّم سزایەکی ئەخلاقی هەیەکەکۆمەڵگەمتمانەی بەکەسی درۆزن نامینێ٠هەروەهاپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)دەفەرموێ : (**ان الكذب يهدى الى الفجوروان الفجوريهدى الى النار)**٠(ژ) دەڵێ : ئەودرۆیانەی کەدەبنە مایەی لەناوبردنی فیتنە وئاژاوە وهۆکارێك دەبن بۆچاککردنەوەی نێوان دووهاوڕێ ئەواپێویست دەکات بکرێت٠(ن) دەڵێ : درۆکردن متمانەی مرۆڤ ناهێڵێت٠(ك) دەڵێ : منداڵ کە درۆدەکات دایکەکە پێی دەڵێت : ڕۆڵەدرۆمەکە ئەگینا خوا(جل جلاله) چاوت کۆرە دەکات٠کەمێکی پێدەچێ منداڵە کەبۆی دەردەکەوێت چاوی کوێرنابێت بۆیەباشتروایە پێی بڵێین گوناهە یاخود لەئەنجامی درۆ کردن هۆشیاربکرێتەوە ، چیرۆکێکی بۆبگێڕدرێتەوە کە ئەنجامی درۆکردن ڕوون بکاتەوە٠(ز) د ەڵێ : لەڕاستی دا کەم کەس هەیە لەژیانی دا هیچ جارێك درۆی نەکردبێ ، بەلاّم کاتێك درۆکر دن ببێتەخوێك ووەك پیشەی لێبێ ئەمە گرفتە٠ئیمامی غەزالی لەکتێبەکەی دا : (**احياء علوم الدين) **کەوەرگێڕدراوەتەسەرزمانی کوردی لەبەرگی شەشەمی ، دەڵێ: (دەربڕینی هاوسۆزی لە ئەحوال پرسین (وەکو : ماڵ ومنداڵت چۆنە ؟ خۆت چۆنی ؟ حالت چۆنە ؟) لەدڵیش دا هیچ خەمێکت لێ هەڵنەگرتبێت ئەمە تەنیابەدووڕوویی دەژمێردرێت٠دەڵێ : ئیبن سیرین بەپیاوێکی وت : ئەرێ حالت چۆنە ؟ پیاوەکە وەلاّمی دایەوە دەبێ حالی کەسێك چۆن بێت ، کەپێنج سەد درهەم قەرزاربێت وکلفەتێکی زۆری بەسەرەوە بێت ؟ ئیبن سیرین چووەماڵەکەی خۆی وهەزار دیرهەمی بۆهێنا ، وتی : بەپێنج سەدی قەرزەکە بدەوە ، پێنج سەدیش ببەبۆخۆت ومنداڵەکا نتی خەرج بکە وەتەنیائەوەندە پارەلەماڵی داهەبوو ، لەپاشان وتی : سوێند بەخوا ئیترلەحالی**

هیچ کەسێکی ترناپرسم بۆیە بەم شێوەیە چووبەدەمییەوە لەوەدەترساکەهەواڵ پرسینەکەی بەڕاستی نەبێت وئەگەربایەخی پێ نەدات بەدووڕوویی لەسەری بنوسرێت)٠ بۆیەزۆربەی نە ریتی ئەحوال پرسینەکان خاڵی نین لەدرۆودووڕوویی٠ پیاوێك چووە سەرتاشخانەیەك وسەرتا شەکە وتی : لێگەڕێ باعایدی من بێ ، پیاوەکە پارەکەی خستەوە ناوگیرفانی وسەرتاشەکەبەدوا ی کەوت پارەکەی بداتێ٠

بوك وخەسوو :

کێشەی نێوان بووك وخەسوویەکێکەلەوکێشەکۆمەڵایەتییانەی کەلەکۆنەوەلەنێوکۆمەڵگەی کوردەواری وعەرەبیش هەرماوە٠(ئا)دەڵێ:خەسووم زۆرخراپ بوولەگەڵم هەمووشتێکی بەقوفل وکلیل دەشاردەوە ، ئەوەندەماندووبووم ڕۆژتائێوارەڕاوەستانم نەبووهێشتالێم ڕازی نەبوو٠(ژ)دەڵێ : کەس هیندەی خەسووم خراپ نییە ، ئەگەرمووچەی خۆشم بێ ناوێرم شتێك بێ پرسی ئەوبۆخۆم بکڕم ، کەپرسیشی پێدەکەم دەڵێ زیادەمەسرەفەبۆچیتە؟

ڕۆژنییەلەسەرئیشکردن شەڕێکم لەگەڵ نەکات٠(د)دەڵێ : دووساڵ بوومێردم کردبوومنداڵمان نەدەبووخەسووم هەرئەهات وئەیووت : بووکی فلانەکەس لەگەڵ تۆ شووی کردووەدوومنداڵی هەیەوسکیشی هەیە ، فلانەکەس ساڵێك نابێ شووی کردووە جمکێکی بووە٠زۆرجارهانی مێردەکەمی دەداتەلاقم بدات وژنی تربخوازێ٠ئێستاش چوارکچم هەیەلەکاتێکداخۆشی دووکچی هەبوو (٤ — ٥)ساڵەشوویان کردووە منداڵیان نابێ٠بەڵام (ن س)دەڵێ: هەشت ساڵەمێردم کردووە لەگەڵ خەسووم دانیشتووم پێم خۆش نییەماڵم جیابکەمەوە، جارجارەناخۆشیش بووە، بەڵام ئەمەشتێکی ئاساییەلەهەمووماڵێك هەردەبێ گرینگ ئەوەیەڕق وکینەلەدڵمان هەڵنەگرین ، من بەدایکی خۆم داناوە هەرگیزلێی تووڕەنابم٠(ن ڕ)دەڵێ : خەسووم خراپ نییەلەگەڵم بەینیشمان زۆرخۆشە ، بەڵام حەوت ساڵەلەلایانم پێم خۆشەماڵم جیابکەمەوە وماڵی تایبەتی خۆم هەبێ ، چونکەمنداڵەکانم گەورەبوینەوجێگەمان نابێتەوەلەیەك ژوور٠(ش س)مامۆستایەکی کەمئەندامەدەڵێ : خەسووم زۆرباشەلەگەڵم زۆریارمەتیم دەدات لەماڵەوەنانم بۆدادەنێ کاتێ لەدەوام دێمەوە زۆرجارجلەکانم بۆدەشوات وبۆم هەڵدەواسی ، بەڵام هەرحەزدەکەم ماڵم جیابکەمەوە ، چونکەهیچ شتێك ناگاتەئەوەی ئافرەت ماڵی تایبەتی خۆی هەبێ بەئازادی لەماڵەکەی خۆی بسووڕێتەوە٠پلکە(خ)کەتەمەنی حەفتاوهەشت ساڵە ، دەڵێ : بووك دڵی بەماڵی خەسووی ناسووتێ لەدووبووکان تا ئێستاهەرخۆم نان وهەویردەکەم بەوپیرییەی هەرخۆم چێشت لێدەنێم ، ئەوڕۆژەی نەخۆش بکەوم کەس نییەنان حازربکات بۆپیاوەکان

ئەوجادەبێتەشەڕوهەرا ، زۆرجارگوێبیست دەبم بووکەکان دەڵێن بەدرۆخۆی نەخۆش خستووە بۆئەوەی چێشت لێ نەنێت دەیەوێ هەربخوات وپاڵداتەوەوئێمەش ببینەخزمەتکاری.(ئا)دەڵێ : شەش کوڕم هەیەوهەریەکەولەگەڵ یەکەم ڕۆژی ژنهێنان ماڵم پێ جیاکردنەوە ئەوهاباشترەسەرم ئیسرحاتە ئێستالەگەڵ تاقەکچەکەم سەرمان بەیەك کردووە ، دووکوڕیشم جیرانی خۆمن بەهانەدەگرن بۆئەوەی لەگەڵم دانیشن ، بەلاّم من قبوولی ناکەم ، چونکەلەدێرزەمانەوەبووك وخەسووپێکنەهاتوون لەگەڵ یەکتری.(س)دەڵێ : بووکەکەم زۆرپیسەوتەمبەڵە لەماڵەوەخزمەتی مێردەکەی ناکات،ئەگەرخۆم جلی بۆنەشۆم بەدەڕۆژجلی لەگۆڕێ دەکەوێ خزمەتی منداڵەکانیشی بەتەواوی ناکات هەرمن خەریکیانم کەچی هێشتاڕازی نییەوداوای ماڵ دەکات ، کوڕەکەشم توانای ماڵ دانان وکرێی خانووی نییە بۆیەمانگی دەڕۆژلەلامانەوبیست ڕۆژزیاترلەماڵی باوکی دەبێ.(ش)دەڵێ : لەبەرئەوەی بیرکردنەوەی خەسووبیرکردنەوەیەکی دیکەیە ، بەلاّم ئێستاخەسوومان زۆرەکەسەردەمییانەبیردەکاتەوە.(ك)دەڵێ: لەنێوکوردەواریداواباوەخەسووی پیاوی باشە ، خەسووی بووك وانییە.(ژ) دەڵێ : نۆبەرەکەم کچ بوو ماڵی خەزوورم نەدڵخۆش بوون نەخەمبا ربوون کاتێ منداڵی دووەمم کچ بوو خەسووم بەهاوسەرەکەمی وت : ئینشاللاّ ئەوجارە خوابە شێکی باشتان دەداتێ منیش زۆرسکم بەخۆم وبەکچەکەم سووتا ، ئەوجارەش کچمان بوو بەلەدا یکبوونی کچەکەم پرسەلەماڵی خەزوورم دانرا.مانگێك تێپەڕی کچەکەم بێ ناوبوو دواجارخەسووم ناوی نا (نیهایەت) بۆئەوەی نیهایەتی کچان بێت!(ز) دەڵێ : هۆکارەکانی سەرهە ڵدانی ناکۆکی نێوان بووك وخەسووزۆرن بۆنموونە شەڕوناکۆکی لەسەرقاپ وقاچاغ یان ناوماڵ شوشتن یان جل وبەرگ کڕین یان سەردان وچوونەدەرەوە ، ناکۆکی نێوان بووك وخەسووش تە نیالەکۆمەڵگای کوردی دانییە ، بەلکولەزۆربەی کۆمەڵگاکانی جیهان هەیە.خەسووبەردەوام گلە یی لەبووك هەیە ، بووکیش بەهەمان شێوە گازاندەیان قەت نابڕێتەوە ، هەرای نێوان بووك و خەسووش زۆرجارئاژاوەی خستۆتەنێوماڵەوە.

## ئەلقەی هاوسەرگیری :

(م ح) دەڵێ : من نزیکەی هەشت ساڵە خێزانم پێکەوەناوە ، تەنیاسێ مانگی یەکەم ئەلقەم لەپەنجەکرد دواترفڕێمدا ولەپەنجەنەکردنیشی زۆرئاساییە وبەڕامەوەگرینگییەکی ئەوتۆی نییە ، پێموایە ٩٠٪ی پیاوان پابەندنین بەلەپەنجەکردنی ئەلقە بڕواش ناکەم ئەمەبۆئەوەبێ خۆیان نیشان بدەن کەهێشتاسەڵتن وژیانی هاوسەرییان پێکەوەنەناوە یاخودبۆئەوەبێ کچانی

پێ دەستخەڕربکەن ونیازەکیان هەبێ وکەس نەزانێت خێزاندارن ، ڕێزی تایبەتیشم بۆهاوسەرەکەم هەیە بائەلقەشم لەپەنجەنەبێ٠(ئا) دەڵێ : ئەلقەهێمایەبۆزەواجی نێوان دووکەس٠(م ح) دەڵێ : لای ئێمەبەئەلقەئەوئافرەتانەجیادەکرێنەوەکەزەواجیان کردووە وئافرەتان زیاترلەپیاوان لەپەنجەی دەکەن ، هەربۆیەگەنجان پێش هەمووشتێك دەڕواننەپەنجەی ئەوئافرەتەبزانن ئەلقەی لەپەنجەدایە ؟ئەوانەی دەیانەوێ هاوسەری خۆیان هەڵبژێرن٠(ك) دەڵێ : هەمیشەکوڕان داوای هاوسەرگیرییان لەکچان کردووە ، مەگەربەدەگمەن کچێك داوای هاوسەرگیری لەکوڕێك کردبێ٠(ب) دەڵێ : ئەلقەلەپەنجەنەکردنی پیاوان نیشانەی بێ وەفایی وبێ بایەخی نییە ، بەڵکوسروشتی پیاو وایە حەزلەخشل وزنجیروشتی لەوبابەتەنا کات٠

**منداڵ :**

هێنانەکایەی منداڵ خەونی هەموودایك وباوکێکە لەدوای پێکهێنانی هاوسەرگیری حەزدەکەن منداڵیان هەبێت٠بێگومان قۆناغی منداڵی قۆناغێکی ناسك وبەپیتە بۆپەروەردەکردن وفێرکردنی منداڵ ، هەروەهامنداڵ وەك هەویرێکە پێش ئەوەی بیخەیتەناوفڕن چۆنت بوێ وای لێ دەکەی ، بەڵام پاش لەفڕن دان ناتوانی چۆنت بوێ وای لێ بکەی٠هەموومان دەبینین کەچۆن منداڵی بچووك لەبەردەممان ڕادەوەستێ لاسایی کردەوەکانمان دەکاتەوە لەوکاتەی نوێژدەکەین ، کەواتەدایك وباوك کاریگەرییان لەسەرڕفتاری منداڵەکانیان هەیە٠منداڵ گوڵێکی ناسکە ، پاك وساغە ، دڵخۆش ، ڕووخۆش لەوپەڕی بەرائەت ئیدی منداڵ لەسەرئەوپاکی وساغییەیە ، بەڵام بەتێپەڕینی کات لەسەرئەوحالەتە نامینێت٠

تێڕوانینەکان جیاوازن لەسەرتەمەنی منداڵ ، بەڵام بەپێی ئەوپێناسەیەی ڕێکخراوی یونسێف کردوویەتی ، خوارتەمەنی (١٨)ساڵی بەمنداڵ دادەنرێت٠بەیاننامەی جیهانی مافەکانی منداڵ ماددەی (١) پێناسەی منداڵ دەکات ودەڵێت : ((منداڵ کەسێکە کەتەمەنی لە (١٨) ساڵ کەمتربێ مەگەرياسای نیشتیمانی وڵات تەمەنێکی لەوە کەمتری وەك تەمەنی خۆناسین وبالغبوون ناسیبێ٠منداڵان ئەوبەشەلەئەندامانی کۆمەڵ پێکدەهێنن کەهێشتالەباری جسمی وعەقلییەوە نەگەیشتوونەتەقۆناغی پێگەیشتن بۆیە پێویستیان بەچاودێری وپشتگیری هەیە٠

١ – منداڵ لەساڵی یەکەم ودووەمی تەمەنیدا دەستی بگاتەهەرشتێك بۆدەمی دەبات ، لەبەرئەوەنابێت هیچ شتێك لەبەردەمی دابنرێت وەکو دەرزی یان ٠٠٠ نەوەك قوتی بدات٠

٢ – یاری :

هەردوونوسەر (محەممەدعەبدولرەحیم وعەدنان عارف) لەکتێبی : (ریاض الاطفال) پێناسەی (یاری) دەکەن ودەڵێن : ((سوودوەرگرتنە لە هێزوتوانای لەش وهزری مرۆڤ بۆبەدەستهێنانی خۆشی دەروون))٠چەند خاڵێك هەیە پێویستە ڕەچاوبکرێت لەکاتی هەڵبژاردنی یاری منداڵان دا :-

١ — تیژنەبێت منداڵەکەبریندداربکات٠

٢ — ئەوەندە گەورەنەبێت نەتوانێت یاری پێ بکات وئەوەندەش بچووك نەبێت قوتی بدات٠

٣ - پێویستە دایك وباوك وریای منداڵەکانیان بن نەهێڵن بەتەنیایاری پایسکل بکەن ، چونکەمنداڵ لەم تەمەنەدا ناتوانێ ئاگای لەخۆی بێ ، هەروەهاڵەگەڵ یەکتردا پێشبڕکێ دەکەن بەمەترسی زۆرنافامن بۆیە پێویستە دایك وباوکیان لەگەڵیان بن وچاودێرییان بکەن کاتێ کەپایسکل سواری دەکەن ، چاکترین شوێنیش باخی گشتی وئەوگۆڕەپانانەیە ، کەترومبێلی پێداناڕوات٠(ش) دەڵێ : ئەومنداڵەی بەبەردەوامی یاری ڤیدیۆیی دەکات ڕاستەوخۆکاردەکاتەسە رهەڵسوکەوتی تەنانەت زۆرجارکارەساتی بریندداربوونیش ڕوویداوە بەهۆی ئەو یارییە ڤیدیۆییا نە٠وەك دەزانین خانووی گەڕەکەمیللییەکان ڕووبەرەکەی تەسکەومنداڵەکان بۆیەلەکۆڵان یاری دەکەن لە ئەنجامی یاریکردنیش زۆرجارلێیان دەبێت بەشەڕ،جاری واشەشەڕەکان پەرەدەسێنێ وفتنەوئاژاوەلەنێوان چەندین خێزان هەڵدەگیرسێ٠

٤ — دەرزی لێدان وپاراستنی منداڵ لەئیفلیجی٠

٥ — نەناردنی منداڵ بۆشت کڕین لەدوکان ، بەشێکی زۆری دایکان کاتێك حاجەتێکی ناوماڵیان پێویست دەبێت منداڵەکانیان دەنێرنە دوکانێك بۆیان بکڕێت بۆنموونە ئەم ڕووداوە کەلەگۆڤاری گوڵان ، ژمارە (٧٠٣)ی ساڵی (٢٠٠٨) بڵاوکراوەتەوە : دایکێك نیوە ڕۆیەك کەلەدائیرە دێتەوە ڕوولەمەتبەخی ماڵەوەیان دەکات دەبینی ئاوی تەماتەیان نەماوە بۆیە یەکێ لەکچەکانی دەنێرێ بۆی بکڕێ کەتەمەنی (٩)ساڵە کەکچەکە دەنێرێ پترلەنیوکاتژمێری پێدەچێ ناگەڕێتەوە ئیدی دایکەکە تەنگاودەبێ وسەربەکۆڵانەکەدا دەکات وادەبینێ منداڵەکە بەردی لەدەستەوبۆدوکانێك کەتەنیائەوکرابۆوە بۆی دەهاوێژێ وبەدەم گریانەوە جنێوی پێدەدات ، دەڵێ چییەکچم بۆدەگری ؟ بەدەنگی ڤیژەودەنگەدەنگ وهەرا خەڵکی گەڕەکیش دێنەدەرەوە تابزانن چی ڕویداوە ؟ دەپرسن ئەوە چی بووە ؟ چی قەوماوە ؟ منداڵەکە بەدەم گریانەوە دەڵێ : ئەوکوڕەدوکاندارە خۆی پێوەنووساندم ، پاشان یەکێ لەوێ تەلەفۆن بۆپۆلیس دەکات وپۆلیس دەگەنە ئەوێوکوڕەکە دەستگیردەکەن ٠٠٠

٦ — لەکاتی شەودا باڕووناکییەکی کزلەماڵ دا هەبێ٠

٧ – منداڵ بوونەوەرێکی ناسك وبێتاوانە زۆرجارهەڵەدەکات ولەمانای هەڵەکەنازانێت بۆیە پێویست ناکات لەسەربچوکترین هەڵە لەمنداڵ بدرێت وهاواربەسەریانەوە بکرێت بەتایبەتی ئەگەرمنداڵەکە زۆربچووك بێت ، بۆنموونە لەسەرپەرداخ شکاندنێك ڕووبەڕووی لێدان ببێتەوە یاخود جەستەی داخ بکرێت ، چونکە منداڵ هەرلەسەرەتای تەمەنییەوە بەلاسایی کردنەوە فێردەبێت ئەویش فێری توندوتیژی دەبێت٠جاری واهەبووە دایك ئەندامێکی لەشی منداڵەکەی خۆی داخ کردووە یان شکاندووە ، بەلاَم هەندێ جاریش منداڵ هاروهاجە بەلێدان نەبێ کۆنترۆ ڵ ناکرێ ، بەلاَم نەك لێدانێك مەترسی بخاتە سەرمنداڵەکەوشوێنێکی زامداربکات٠

٨ – دانانی بەربەست لەپێش قاندرمەوشوێنەبەرزەکان ، تاکومنداڵ نەتوانێت پێداسەرکەوێ٠

٩ – لەکاتی هاتووچۆبەئۆتۆمبیل دەبێت منداڵ لەسەرکورسی تایبەت دابنیشێرێ وببەسترێتە وە ونابێ لەکورسی پێشەوەبێ٠

١٠ – منداڵ فێربکە ، کەلەترومبێل دادەبەزی لەلای پیادەڕۆدابەزێت ولەکاتی گەشت وسەیرا ن دا لێ مەگەڕێ منداڵ سەرودەست وشانی بباتەدەرەوە ، چونکەئەمەزۆرمەترسیدارە٠

(م) دەڵێ : بێگومان منداڵ هەمیشە خۆشەویستە بەتایبەتی منداڵی بچووك لەبەرئەوەهەموو خێزانێك بایەخێکی زۆری پێدەدات ، بەلاَم نابێت زیاد لەپێویست گرینگی بە منداڵ بدرێت و نازی ڕابگیرێ هەرشتێك داوابکایەکسەربۆی دابین بکەی ، چونکە ئەمەپاڵ بەمنداڵ دەنێت زیا ترنازبکا بۆمسۆگەرکردنی پێداویستییەکانی منداڵیش تاگەورەتربێت پێداویستییەکانی زیاتر دەبێت ، زۆرجاریش باروگوزەرانی خێزان ڕێگرن لەبەردەم هێنانەدی ئەوهەمووداواکارییانە بۆ یە دەبێ بەشێوازێکی نەرم قسەی لەگەڵ بکەی ، کەلەبەرهۆکاری نەبوونی وکەم دەرامەتی ناتو انێ ئەوکەل وپەلانەی بۆبکڕێت٠(ڕ)کەمنداڵەکەی قوتابی پۆلی یەکەمی بنەڕەتییە دەڵێ: پێش ئەوەی ئەرکی پەروەردەکردنی منداڵ هی مامۆستابێت هی ئێمەی دایکان وباوکانە ، من کوڕەکە م فێرکردووە کەلەخەوهەڵسادەبێ دەست ودەم وچاوی بشوات ، نانی بەیانی بخوات ، پاشان جلە کانی لەبەردەکەم ودەینێرم بۆ قوتابخانە٠(ع) دایکێکی ترەدەڵێ : جل وبەرگەکانیان بۆدەشۆم ، پرچیان شانەدەکەم وخواردنیان بۆحازردەکەم ، بەقسەی خۆش هانیان دەدەم کەخۆیان ماندوو بکەن لەقوتابخانە٠(ح) پیاوێکی خاوەن سێ منداڵە دەڵێت : جلی جوانیان بۆدەکڕم ، پێداویستی یەکانی قوتابخانە ئەوەی بیانەوێت بۆیان دابین دەکەم ، ئامۆژگارییان دەکەم ، کە باش بخوێنن جارجاریش سەردانی قوتابخانەدەکەم ، تاکوڕای مامۆستاکان بزانم لەسەریان٠(ئە) دەڵێ : ئامۆژ گاری منداڵەکانم دەکەم پابەندبن بەیاسای قوتابخانە ولەپۆل دا بەئارامی بجولێنەوە وڕێزی ما مۆستاکانیان بگرن٠(ت) دەڵێ : ئامۆژگاری منداڵەکانم دەکەم قوتابخانە پاك وخاوێن ڕابگرن و جلەکانیان پیس نەکەن وئازاری یەکترنەدەن وکەل وپەلی قوتابخانە خراپ نەکەن٠

١١ – بەجێهێشتنی سابوون وهەمووشتەلووسەکان لەسەرزەوی بەتایبەتی لەگەرماو(حەمام) کار ێکی ناپەسندە ، چونکە منداڵ پێی هەلبخلیسکێت وبکەوێت یەکێك لەئەندامەکانی جەستەی بشکێت ٠٠٠

## کارکردنی منداڵ :

بەهۆی بارودۆخی خراپی ئابووری هەندێ خێزان پاڵ بەرۆڵەکانیانەوەدەنێن کەئەرکی بەرپرسیاریەتی ژیانی خێزان هەلگرن بەبێ ئەوەی هەست بەقۆناغی تەمەنی منداڵییان بکەن ولەبری ئەوەی خەریکی خوێندن بن خەریکی کاروکاسبی سەختن ، کەدوورەلەتەمنیانەوە هەربۆیە ڕۆژانە بەدەیان منداڵ خەریکی کرین وفرۆشتنن وفێری دەیان فروفێڵ وتەڵەکەبازی دەبن ، جۆرەهاکاری کرین وفرۆشتنی گەرۆك دەگرنەدەست یاخود بۆیاخچییەتی وشاگردی و٠٠٠هتد کەلەم تەمەنەدا منداڵ تووشی دەیان پیاوی خراپ دەبن بەهۆی دەستکورتی ونەبوونییەوە ، لەدوارۆژدا دەبنەئەندامێکی خراپی ناوکۆمەڵ ، کەداب ونەریت و ویژدانی مرۆڤایەتی ئەوکارانە ناگرێتەخۆی٠(ئە) منداڵێکە شت دەفرۆشێ لەهەمان کات دا لەخوێندن بە ردەوامە ، دەڵێ : بۆماڵەوە ئیش دەکەم ، چونکە وەزعی ماڵەوەمان خراپە (٩) نۆسەرخێزانین و باوکمان نەماوە٠(ب) دەڵێ : باری ئابوری وادەکات خێزان ناچاربن منداڵی خۆیان لەقوتابخانە د ەربێنن ولەتەمەنێکی بچووکدا ئیشیان پێبکەن ناتوانین لەمەکتەب سوود وەربگرین وببین بەد کتۆریان پلەوپایەکی بەرز٠

## کارکردنی ئافرەت لەدەرەوەی ماڵ :

ئەوەی لەناوەندەکانی فرۆشتن شتێکی تازەیەبوونی فرۆشیاری کچە٠(ت)دەڵێ:بێگومان ئافرەت لەگەڵ فرۆشیاری کچ مورتاحترە ، چونکەشەرم ناکات لەهەڵبژاردن وتاقیکردنەوەی جل وبەرگ بێ ترسن بەتایبەتی لەکاتی کرینی هەندێ جلی تایبەت٠(ئە ف) لەیەکێك لەمینی مارکێتەکانی ناوشاری هەولێرکاردەکات کارکردنی خۆی بەپێویست دەزانێ ، چونکەباوکی نەخۆشی هەیەوتوانای کارکردنی نەماوە٠هەروەهادووخوشك وبرایەکی لەخۆی بچووکتری هەیەکەلەقوتابخانەدەخوێنن٠بۆیەدەڵێ بەکارکردنم یارمەتی خانەوادەکەم دەدەم ، بەلاّم دەڵێ : کارکردنم لەکەرتی تایبەت گەڵێ کێشەی بۆدروست کردووم ،لەوانەلەرووی کۆمەلآیەتییەوەزۆرجارلەلایەن دراوسێکانمەوەهەستم بریندارەدەکرێ وئازاری دەروونیم دەدەن ، وەهەندێك لەکریارەکان مامەڵەی خراپم لەگەڵ دەکەن٠(ن)دەڵێ : لەکۆمەڵگەی

ئێمەئەگەرئافرەتێك خاوەن دەرمانخانەبێت زۆرڕێزی لێ دەگیرێ لەلایەن خەڵکەوە لەکاتێکدادەرمانخانەش دووکانەوبەشێکەلەکەرتی تایبەت کەچی ئەگەرئافرەتێك لەمینی مارکێتێك کاربکات خەڵکی جۆرەتەماشاکردنێکی تایبەتیان بۆی دەبێ ، ئەمەش جۆرەئیزدیواجیەتێکی پێوەدیارە ، چونکەبەڕای من کارکردنی ئافرەت لەمینی مارکێت هیچ جیاوازی نییەلەگەڵ کارکردنی ئافرەت لەدەرمانخانەیەك٠(ھ)دەڵێ : کاتێك لەولاَتێکی وەك بەنگلادش کچ وژن ڕەوانەی کەنداوەدەکرێن بۆکارکردن ئەوەیان ئاسایی نییە٠(خ گ) دەڵێ : زۆربەی کارمەندوفەرمانبەرەکان ناچارن منداڵەکانیان ببەنەماڵی داپیرەوباپیرە یاخودبەهەزارتکاوڕەجامالەدراوسێ منداڵەکانیان ڕابگرن ، لەڕووی یاساییەوەش نابێ منداڵ بېرێتەنێوفەرمانگەکان ودەزگاکانی تری حکومەت ، ئەمەجگەلەوەی دۆخی دەروونی منداڵەکەلەنێوئەوماڵانەدارِەنگەبەرەوخراپی بچێت یاخودفێری هەندێ شت ببێت کەبەدڵی دایك وباوك نەبێت ، هەروەهافەرمانبەرلەکاتژمێرهەشتی بەیانی تاکوسێی نیوەڕۆ ژەمەکانی خواردنی لێ تێکدەچێوناچارەخواردنی خێرابخوات ئەمەش زیان بەتەندروستی دەگەیەنێ ، بۆیەپێویستەدەزگاکان دایەنگەدابنێن وبیکەنەمەرجێك لەمەرجەکانی بینا هەروەك چۆن لەمەرجەکانی بینادەبێت گەراج هەبێت٠دووەم شت کەزەرووره هەبوونی کافتریایە ، چونکەکارمەندبەیانی لەماڵەوەهاتووە نانی نەخواردووە٠(ز) دەڵێ : کتێبێکم خوێندەوە لەسەرمێژووی ئەمریکا ، تیایدا دەڵێ : لەشاری نیۆیۆرك لەساڵی (١٩٠٠) یەك ئافرەتی کرێکاری تێدانەبوو ، هەمووژن لەماڵەوەبوون وتەنیاپیاوکاری دەکرد٠هەروەهاکراسی ئافرەت درێژبوولەزەوی دەخشا٠(ف) دەڵێ : سەبارەت بەکارکردنی ئافرەت لەدەرەوەی ماڵ ئەوپیاوانەی کەهاوسەرەکانیان خەریکی دەوامن کاری ناوماڵیان لەنێوان خۆیان دابەشکردووە ، کەجاران بەدیدێکی سەمەرە تێیان دەڕوانین ، بەلاَم ئێستا بەچاوێکی ئاسایی تێیان دەڕوانن ، کەپیاولەماڵەوە دابنیشێ وپیاوی ماڵەوەبێ٠(ڤ ع) دەڵێ : ئەوکاتانەی لەماڵ نەبم هاوسەرەکەم لەماڵە ، ئێمە هەردووکمان مامۆستاین ودەوامەکەمان پێچەوانەی یەکترە خۆمان ئەوجۆرە دەوامەمان هەڵبژاردووە بۆئەوەی ئەوکاتەی من لەماڵەوە نەبم مێردەکەم ئاگادراری منداڵەکان بێت وکارەکانی ماڵەوە جێبەجێ بکات ئاماژە بەوە دەکات بەشێك لەکاری ناوماڵ لەسەرپیاوپێویستە ئەگەرهاتووئەوئافرەتە وەزیفەی هەبوو لەڕووی داراییەوە یارمەتی پیاوەکەی دەدا٠(ب) دەڵێ : ئافرەتی خاوەن بڕوانامە چونکە لەپێناووەرگرتنی بڕوانامەکەی زۆرماندووبووە ئەی بۆچی خوێندووە ؟ بۆچی ئەوهەمووساڵەماندووبوونی کێشاوە ؟ بۆیە حەزدەکات لەبواری ئەوشتانەی خوێندوویەتی کاربکات ، هەروەهائافرەت بەکارکردن لەڕووی ماددییەوە سەربەخۆدەبێت٠(ع) دەڵێ : کارکردنی ئافرەت زۆرپێویستە ، چونکە شت وەکی ئا

فرەتان وەك جل وبەرگ وهەندێ شت کەتایبەتە بەئافرەت واباشە کەفرۆشیارەکە ئافرەت بێ٠
(ن) دەڵێ : بینینی ئافرەتێك لەسەرشەقام وکارکردنی بینینێکی خەم ئامێزە ، چونکە بۆئافر
ەت بەئاسایی وەرناگیرێت ، بەڵام هەندێك نەبوونی وکەم دەرامەتی زۆری بۆدەهێنێت بیرلەو
جۆرە کارکردنەبکاتەوە٠

ئایائافرەت کاری ناوماڵ بکات قازانجە یان زەرەر ؟
ئافرەتی کورد لەکۆنەوە هەمیشە خەریکی کاروباری ئاژەڵداری ومەڕدۆشین ومەشکەهەژاند
ن بووە ، لەبواری کشتوکاڵیش دا شان بەشانی پیاوکاری کردووە ، هەروەها جۆرەها لێف وبا
لیف ودۆشەك ولبادوجاجم وبەرماڵی دروست کردووە ، ئاوکێشانی کردووەوگۆزەی لەسەرشا
نی داناوە بۆماڵ گواستوویەتییەوە ، سەرەڕای ئەرکی دایکایەتی ومنداڵ بەخێوکردن ، تەنا
نەت وەکوئێستا(حەفازە)ش نەبووە ، جل وبەرگەکانیان بەدەست شووشتووە ، بەڵام لەم سە
ردەمەی ئێستا کارئاسانی بۆکراوە بە دەست ئەم ئیشانە ناکات تەنانەت ئێستا گسکی کارەبا
یی وئامێری قاپ شۆرینیش هاتووە ، تەنانەت بۆمافوورشوشتنیش کارگەی تایبەتی هەیە
دەیشوات و وشکی دەکاتەوەوبۆت دەهێنێتەوە٠مریشکیش خەریکی چاکردن وپاککردنەوەی
نابن لەشوێنی مریشك فرۆشتن بۆیان چاك دەکرێت وسووردەکرێتەوە بە (١٠٠٠)دیناربەپا
کی وجوانی بۆیان دێتەوە ماڵ٠
لێکوڵینەوەیەك کەلەسەرلەش ولاری ئافرەت کراوە دەرکەوتووە ، ئەگەرئافرەت ئیشی ماڵەوە
بکات بەبێ ئەوەی بچێتە هۆڵەکانی لەشجوانی وا لەژن دەکات کەپارێزگاری لەش ولاری خۆی
بکات بەشێوەیەکی سروشتی٠لەوکارانە : پاککردنەوەی پەنجەرەی ماڵ ، چونکەلەوکارەدا پێو
یست دەکات ماسولکەکانی هەردوو دەست بجولێنێتەوە ، کەماسولکەکان بەهێزدەکات ، پاککر
دنەوەی پەنجەرەوادەکات بڕێکی باش کالۆری بسوتێ٠هەروەهاپاککردنەوەی زەوی بەپلەی دوو
ەم دێت لەڕووی ئەوهەوڵەی کەلەش پێویستی پێیەتی ، جولانەوەی لەش وادەکات بەشێوەیە
کی ڕێك وپێك خوێن بۆناودڵ بچێت ئەمەش والەدڵ دەکات کەئەرکی خۆی بەباشی جێبەجێ
بکات ، پاککردنەوەی زەویش وادەکات لەش بڕێکی زۆرکالۆری لەدەست بدات٠هەروەهاشوشتن
وهەڵخستنی جل وبەرگیش دەبێتەهۆی سوتاندنی بڕێکی زۆرکالۆری٠ هەروەها کارەکانی تر
پێویستی بە جولانەوەی هەردوودەست وهەردووقۆل بەشێوەیەکی بەردەوام هەیە ، چونکە
کاتێك دەست درێژدەکەیتەوە ماسولکەکانی لەش دەجولێتەوە ، بەتایبەتی کاتێك دەتەوێت
دەستت بگاتە هەمووشوێنێك ، چونکەهەندێ شوێن هەیە بەئەستەم دەستت دەیگاتێ٠وەهەر

چییەك لێدانی دڵ بەرزبكاتەوە بەوەرزش دادەنرێت٠ ئەمەش ئەرزسڕینەوە ، گسكدان ، پە نجەرەپاككردنەوە ، هەموونیشەكانی ناوماڵ بەوەرزش دادەنرێت٠هەروەهاكاتێك مرۆڤ خۆی بەئیشێكەوەسەرقاڵ دەكات كەمترهەست بەبێزاری وبۆشایی دەكات٠

**جاران وئێستا :**

ململانێی نێوان كۆن ونوێ زۆركۆنە دەگەڕێتەوەبۆململانێی فەلسەفی لەشارستانییەتی یۆنان دا ، ئەوەتا لەساڵانی (٥٤٠پ م) (هیراكلیتس) و(پارمنیدس) لەوبارەیەوەلەململانێ دابوونە لەنێوان گۆڕان ونەگۆڕان یاخوود جوولەوجێگیری٠"هیراكلیتس" دەڵێ : ((شتەكان لەگۆڕانی پێكەوە گرێدراون ، دەڵێت : مرۆڤ ناتوانێت دووجاربچێتەناوئاوی یەك ڕووبار)) ، چونكە ئاوەكەلەڕۆیشتن دایە كاتێك مرۆڤ جاری دووەم دەچێتەنێوئاوەكەوە،ئاوە كۆنەكە ڕۆیشتووەوئاوی تازە لەجاری دووەم دێتەپێشی واتا گۆڕان شتێكی حەتمییە٠بەشێوەیەكی گشتی دەتوانین بڵێین لەهەركۆمەڵگەیەكدا دووپرۆسیس هەیە ، یەكێكیان هەوڵدەدات پارێزگاری لێبكات ، دووەمیشیان هەوڵدەدات بیگۆڕێ٠دووجۆرە گۆڕانی كۆمەڵایەتی هەیە ، یەكەم گۆڕانی كۆمەڵایەتی بێ پلان ، كەهیچ ئامادەكارییەكی پێشوەختی لەلایەن مرۆڤەوە بۆنەكراوە بۆی هەیە لەدەرەنجامی قەیرانێكی ئابووری یان ڕامیاری یان پیشەسازی بێ٠دووەمیان گۆڕانی كۆمەڵایەتی پلاندار ، ئەمجۆرە گۆڕانە بریتییە لەوەی پێشوەخت پلانی بۆدانراوە٠ هەركاتێك بەساڵاچوێك دەدوێنیت هەمیشەبەدەم گلەییەوەلەنەوەكانی سەردەم دەڕوانێت زۆرجاردەڵێن پیاونەماوە ، پیاوەتی نەماوە ، شەرم وحەیانەماوە٠٠٠هتد٠

١ — جاران كەخانوودروست دەكراڕەچاوی لایەنی دەروونی دەكرا ، بەڵام ئەوجۆرەخانووكردنەی ئێستابایەخی پێدراوە گوێنەدانەبەحەوشەوباخچەی ماڵان واتائەوزەوییەی خانووی لەسەردروست دەكرێت هیچ ڕووبەرێك تەرخان ناكرێت بۆباخچەوسەوزایی ، ئەمەش لەبەرچاونەگرتنی لایەنی دەرونییە ، چونكە ئەگەرخانووباخچەی تێدانەكرێت ئەواگەورەترین كەم وكوڕی هەیە چونكەبۆئاسوودەیی دەروونی خانووپێویستی بەحەوشەوباخچەهەیە ، چونكەهەموومرۆڤەكان پێویستەڕۆژانەچەندساتێك بۆئارامی دەروونیان بڕۆنەشوێنێكی وەك باخچەوسەوزایی ، چونكەئەگەرئەم شوێنگۆڕكێیەنەكات ئەواهەست بەبێزاری دەكات بەتایبەتی بۆخێزانێك كەكەسی بەتەمەنی هەبێت پێویستەسەردانی پارك وباخچەكانی شاربكەن ، نەك هەمووكاتەكانیان لەكونجی ماڵەكانیان ببەنەسەر٠(ش ف) دەڵێ : باخچەبۆماڵ زۆرپێویستەجوانی دەكات ، بۆنخۆشی دەكات،تەپ وتۆزی لێ دەگیرێتەوە،فێنكی دەكات ، دڵی ماڵ

ومنداڵەکەی دەگەشێتەوە٠(ك) دەڵێ : باخچەی ناومالٚ سودێکی هەرەگەورەی هەیە بۆناوماڵ لەبارەی جوانییەوە ، کارتێکردنی بۆسەرباری دەروونی هەمووخێزانەکەهەیە٠

٢ – تەقەکردن بۆشەوی بەزاوابوون :

یەکێك لەوداب ونەریتەچەپەڵانەی لەڕابردوولەلایەن کەسانێکی جاهیل ودواکەوتووپەیڕەودەکرا ئەوەبوولەدوای ئەوەی بووك دەگوازرایەوە هەرکاتێك کوڕەکەبەزاوابوویەکێك لەکەسەنزیکەکانی ماڵی زاوایاخودزاوالولەی چەکێك بەرەوبەرزایی ئاسمان هەوایی چەندگوللەیەکی دەتەقاندبەمەش خەڵکی هەمووگوێبیستی تەقەکردنەکەدەبوون٠دەنگی تەقەکردنەکەئەوەدەگەیەنێ کەکوڕەکەبەزاوابووە ئەمەش شتێکی زۆرعەیب ونیشانەی دواکەوتویی بووخۆشبەختانەسەردەمی بەسەرچوو٠

٣ – جاران لەپرسەدالەسەرلافیتەدەنوسرا : ((خوالێ خۆشبوو))کەئەم دەستەواژەیەلەڕووی واتاوناوەڕۆکەوەهەڵەیەکی زۆرزەقی پێوەدیارەکەئەوەدەگەیەنێ خوای گەورەتەواولەگوناهەکانی خۆشبووەوبەهەشتییە ، بەلأم ئێستادەنوسرێت : ((خوالێ خۆشبێت))کەوەك دوعای خێروایە ، بەڵکوخوای گەورەلەگوناهەکانی کەسەکۆچکردووەکەخۆشبێ وڕەحمی پێبکات٠

٤ – لەڕووی هونەرییەوە : (ا ب) دەڵێ : هەمووکارەهونەرییەکان وغەیری هونەرییەکان ساڵانی حەفتاکان تاوەکوساڵانی نەوەد پێشکەش دەکرابەچەرخی زێڕین ئەژماردەکرێ ، لەبەرئەوەی بەگەرمی وگڕوتینەوە بەرهەمی جوان وشاکارودانسقەیان پێشکەش کردووە بەتایبەتی کارکردنیان لەدنیای منداڵاندا،بەلأم ئایائێمەڕازین لەوبەرهەمانەی ئەمڕۆپێشکەش بەمنداڵان دەکرێت ؟ بۆچی ئەوبەرهەمانەی لەناوەڕاستی حەفتاکان پێشکەش دەکران لەهەمووبوارەکانی ژیان بەتایبەتی بواری منداڵان تاکوئێستاش تاموچێژیان لەدەست نەداوە ، بەلأم ئەوبەرهەمانەی ئەمڕۆپێشکەش بەمنداڵان وبگرەگەورەکانیش دەکرێ لەڕووی ناوەڕۆك وهەستی هونەرییەوەزۆربەرەولاوازی چووە ، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوەبۆئەوەی ڕوحیەت لەکاری ئێستادانەماوە ، زۆری وبۆری هەیە٠بەلأم بۆنموونە : کارتۆنی عەدنان ولیناوبەرنامەی افتح یاسمسم ورجل الحدیدی وبۆمبۆوفلۆنە تائێستاش تام وچێژی خۆیان لەدەست نەداوە ، ئەم ئەفلام کارتۆنانەتائێستاش لەزەین وبیرماندامÙˆەتەوە وبیرەوەری ویادگاری منداڵیمان دەخاتەوەیاد ، چونکەئەوانەی ئەوبەرهەمانەیان دروست دەکردکەسانی پەیام داربوون٠

٥ – پەیوەندی نێوان مامۆستاوقوتابی :

(م ح) دەڵێ : ئەگەربەراوردلەپەیوەندی نێوان مامۆستاوقوتابی بکەین لەنێوان دوێنێ وئەمڕۆدا ، لایەنی ڕێزگرتن جاران زۆرزیاتربوو ، ئەم ڕێزگرتنەش بوبووەهۆی جێبەجێکردنی ئەوئەرکانەی کەمامۆستادەیدایەقوتابی لەپۆلدا ، جێبەجێکردنی ئەرکیش واتاپێشکەوتنی

زانست ، بەلاّم ئەم ڕێزگرتنەساڵ بەساڵ کەمتردەبێت لەهەمووقۆناغەکانی خوێندن ئەمەش بۆتەهۆی دواکەوتنی زانست کەهەمووومان هەستی پێدەکەین ، کەپێشترقوتابی لەقۆناغی سەرەتاییدابوولەخوێندنەوەونوسین زۆربەتواناتربوولەقوتابییەکانی ئێستا ، بەگشتی ئەوقوتابیانەی کەلەڕابردوداخوێندنیان تەواوکردووە ئێستاکەش ئەوماموٚستایانەی دەرسیان پێداون بەچاوێکی پڕلەڕێزەوەسەیریان دەکەن٠لەکۆندا قوتابی بەگشتی ڕێزی ماموٚستای دەگرت ، بەلاّم قوتابخانەی ئەمڕۆلەگەڵ جاران جیاوازی زۆرە ، ئەمڕۆلێدان بەهەمووجۆرێ قەدەغەیە ، قوتابی ئەمڕۆ(هەمووی نا) ماموٚستابەگەڕەکێکدارەت دەبی هاواردەکات بانگی دەکات ، زۆرکردەوەی ئەمڕۆدەبینین بەرامبەرماموٚستائەمەش خۆی لەخۆیدا دواکەوتنە٠

٦ — خواردن :

جاران خواردن ئەوەندەزۆرنەبوو ، بەلاّم ئێستابەدەیان جۆرخواردنی خۆش وبەتام لەسەرسفرەی دادەنرێ : دووسێ جۆرتورشی ، دووسێ جۆرشەربەت ، ئاوی سارد ، ماستاو ، بەتایبەتی لەمانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا ، بەلاّم جاران لەنان ودۆزیاترنەبوویان نان وشوتی٠

٧ — جاران کەدەگەیشتینەمانگی چوارکەون ونوێ دەکەوتەسەرزاری خەڵك بۆنموونە : نەخۆشێك دەچووەلای عیادەیەك دەیوت : کاتژمێرچەنددکتۆردێت ؟ نوسەرەکەی دەیوت : کاتژمێرسێ٠نەخۆشەکەدەیوت : کەون یان نوێ ؟ دوکاندارێك بەیەکێکی دەوت : کاتژمێرحەوت وەرە دوکانم کردیتەوە ، ئەویش دەیوت : کەون یان نوێ ؟ بەکورتی کەون ونوێ گیروگرفتی زۆری دروست کردبوو بەتایبەتی حەفتەی یەکەمی مانگی چوارئیواهەبوویەك کاتژمێرلەقوتابخانەوفەرمانگەکەی دوادەکەوت ولێپرسینەوەی لەگەڵدادەکرا ، ئی واهەبوولەکاردوادەکەوت ودرەنگی پێدەچووکارەکەی لەکیس دەچوو ، ئی واهەبووکەزانی دواکەوتووە سەیارەکەی بەخێرایی لێدەخوڕی بۆئەوەی پێڕابگاکارەساتی دڵتەزێنی لێدەکەوتەوە٠زۆربەی خەڵك لەپاش مانگی سێ کاتەکەیان لێ تێکدەچوو ، کاروباریان لێدەشێواکەناویان دەنا : کاتی هاوینە٠زۆرکەسیش کاتژمێرەکەیان نەدەگۆڕی٠

٨ — هەندێ عادەت ورەوشت لەسالأنی چلەکان وپەنجاکان باوبوون ئێستانەماون پێکەنین دەمانگرێت ، لەوانە : سەر ڕووتکردن بۆپیاوان عەیب بووئەبوایەهیچ نەبێ کلاّوێکت خستبایەسەرت٠هەروەهاپێش سییەکان وچلەکان پێلاّوبریتی بوولەکەوش وکلاّشی پەڕۆقۆندەرەی لای خۆمان نەبوو ، لەئەوروپاوەهات خەڵك فێری قۆندەرەلەپێکردن بوون ، دەگێڕنەوەکەیەکەمجارقۆندەرەهاتەعیراق خەڵك دژی وەستان ، چونکەدەیانووت : پێشەوەی لەلووتی بەرازدەچێت! ئەم عادەتەش نەماوبەسەرچوو٠

٩ – جاران لەقوتابخانەکان (سەرەتایی) پوول کۆکردنەوە هەبوو ، منداڵان وقوتابیان زۆرچێژیان لێ دەبینی لەهەمان کاتدالەڕێگای ئەوپووڵانەوە زانست وزانیارییان فراوان دەبوو دڵ ودەروونیان دەگەشایەوە ، زانست وزانیاری فێردەبوون ، چونکە ناوی شاروولاّتان فێردەبوو ، کەپوولی پۆستەیان کۆدەکردەوە٠

١٠ – ڕەنگە زۆربەمان لەقۆناغی منداڵی دا ئاواتی ئەوەمان خواستبێ زووجەژن بێت ، تاخۆمان بگەیەنینە شاری یاری (مدینە الالعاب) وبن لەیلوکان ، بەلاّم ئێستالەزۆربەی گەڕەکەکانی ناوشارچەندین یاری هەن کاتێکی خۆش بەسەردەبەن٠

## لەبارەی هاوڕێیەتی :

مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەلاّیەتییەبەرگەی تەنیایی وگۆشەگیری ناگرێ هەربۆیەئەگەرکەسانێك ئەوهاوڕێ دڵسۆزەیان دەست نەکەوتبێ پەنایان بۆئاژەلاّن بردووە بەتایبەتی ئاژەڵێکی بەوەفای وەکوسەگ٠(ئە) دەڵێ : هاوڕێی باش لەتەنگانەبەدیاردەکەوێ،پێویستەئێمەی مرۆڤ لەهاوڕێی خراپ دوورکەوینەوە ، تاکوژیان جوانتربێ٠(س) دەڵێ : برادەرکەسێکەباوەڕی پێدەکەی ولێی ئەمینی لەهەمووشتێك وقسەی دڵی خۆتی بۆدەکەی ، هەروەهابەشداریت دەکات لەخۆشی وناخۆشی ، وەلەکاتی تەنگانەدابەدەمەوەت دێت ودڵت ئاسودەدەکات٠(ع)دەڵێ : برادەری باش سامانێکی بەنرخە ، چونکەلایەنی کەم دەتوانی ئازارەکانی دڵتی لاهەڵڕێژی وپاڵەپەستۆی ناخت کەم کەیتەوە٠(ك) دەڵێ : هاوڕێ بۆسەفەرپێویستە،چونکە بەتەنیاسەفەرکردن مەترسی دزوجەردەی لێ دەکرێ٠ (س)دەڵێ : لای کوردەواری بووە بەنیشانەی سەخاوەت وپیاوەتی ، ئەگەرچووی بۆچایەخانەودووهاوڕێت هاتنەلات بەگوێرەی عادەت پێویستەپارەی چایەکانیان بدەی ئەگینابەمرۆڤێکی ڕەزیل دەژمێردرێیت دووریش نییە ئەوکەسە پارەی پێنەبی یاخود دە ستی کورت بی٠(ع) دەڵێ : هەمووتەمەنی گەنجیم لەیارییەناپەسندەکان بردۆتەسەر ئاماژەبەوە دەکات ، کەلەتەمەنی هەرزەکارییەوە بەهۆی چەندبرادەرێکی نزیکییەوە لەیاری بلیاردفێربووە٠ (ب) دەڵێ : هاوڕێیەتی هەندێکی بۆکات بەسەربردنە ، هەندێکی بۆبەرژەوەندییە٠ئێمە ڕۆژانە ئەوە ئەزموون دەکەین زۆربرادەرهەیە هەتاکاری پێتە دەتناسێت ، پاشان کەکاری پێتنەماهەر هەرناشت ناسێت٠دووجۆرەهاوڕێ هەیە یەکێکیان بۆنموونە دووکەس لەیەك شوێك یان یەك فە رمانگە یان قوتابخانە بەیەکەوە کاردەکەن ، کەهەرلەچوارچێوەی کار دەمێنێتەوە هەندێ جار یش بەمەرحەبایەك لەدەرەوە چاویان بەیەك دەکەوێت ، بەلاّم جۆرەکەی تریان پێکەوەپیاسەدە کەن ودەچنەدەرەوە پێکەوە نان دەخۆن وپێکەوە سەفەروگەشت دەکەن٠ (ئا) ئافرەتێکی خاوەن ماڵ ومنداڵە ، دەڵێت : هاوسەرەکەم لەگەڵ برادەرێکی پێکەوە مامەڵەی کڕین وفرۆشتنیان دە

کرد بەم هۆیەوە زۆرجارمێردەکەم سەردانی ماڵی برادەرەکەی دەکردو بەهەمان شێوە برادەرە کەی دەهاتە ماڵمان چەند جارێك هەستم پێکرد ، کەبرادەرەکەی هاوسەرەکەم بەچاوی خراپ سەیری نامووسم دەکات منیش بەمێردەکەم وت کەچی هاوسەرەکەم وتی : نەخێرباوەڕناکەم تۆدرۆدەکەی ، چەند هەفتەیەکی پێچوو ڕۆژێك لەدەرگای ماڵەکەمانی دا منیش دەرگام کردە وە هاتەژوورەوە دانیشت بیَ ئەوەی ئەوکەسە هەست پێبکات تەلەفۆنم بۆمێردەکەم کرد گوتم وەرە ماڵەوە فلاَن کەس لێرەیە بەرلەوەی هاوسەرەکەم بگاتە ماڵەوە کەوتە قسەکردن وگوتی حەیف تۆژنی ئەوپیاوە بێسەروبەرەبی منیش لەسەرەتاوە پێم گوت عەیب ناکەی خیانەت لە گەڵ برادەرەکەت دەکەی ؟ ئینجا ئەوبێشەرمانە وەلاَمی دامەوە وتی : هەزاربرادەرم بەقوربانی زەردەخەنەکی تۆبێت منیش دەستم بەجنێودان کرد ، گوتم هەزاری وەك تۆ بەقوربانی پێلاَو ی مێردەکەم بی لەناکاومێردەکەم لەدەرگاهاتەژوورەوە بەسەرشەڕەکە گەیشت ڕاستی یەکەم بۆ گێڕایەوە مێردەکەم پێی وت : دیارە تۆهیچ شەرەفێکت نییە تفێکی لێکردولەماڵ بەدەری نا٠

لەبارەی هونەر :

هونەرئەونوسراوونەخش ونیگاروکارە ڕەنگینانەیە ، کەبەهۆی خەیاڵ وسەلیقەوهۆشیاری مرۆ ڤێکی لەئاسایی بەدەرەوە هەڵقولاوە٠بێگومان ئەوکەسەی کەکارێکی جوان ئەنجام بدات کەمایە ی سەرسوڕمانی کەسانی تربێت پێی دەوترێت هونەروبەداهێنەرەکەشی دەوترێت هونەرمەند٠ هونەروشەیەکەبەکارهێنانی لەزمانی میللەتێکەوە بۆمیللەتێکی ترجیاوازی هەیە ، لەزمانی عە رەبی دا (فن)بەکارهاتووە واتا(سنعەت)٠لەزمانی کوردیش دا (هونەر) بەکاهاتووە٠ بەواتایەکی گشتی هونەربەوبەرهەم وداهێنانەی مرۆڤیان گوتووە وەکو : نیگارکێشان وشانۆگەری وهەموو کارەهونەرییەکانی تر٠(لیۆن تۆڵستۆی) لەکتێبەکەی دا : (هونەرچییە؟) باسی هونەردەکات و دەڵێ : ((ئەوچالاکییەی مرۆڤ ، کەئەتوانیَ خواستی خۆی بگەیەنێتە کەسانی تر٠ ئەگەرسەیر ی هەرشتێك بکەین ڕوویێکی چاك وڕوویێکی خراپ بەدی دەکەین ، هونەریش بەدووشێوەمرۆ ڤ دەتوانێت بەکاری بهێنێت ، شێوەی یەکەمیان مرۆڤ دەتوانێت هونەرەکەی لەپێناوی ئیمان و خاك ونیشتیمان وهیواوئاواتی چاکە بەکاری بهێنێت ، هەروەهادەتوانێت لەپێناوی هەواوئارەزو وی گومڕایی و سەرلێشێواوی و پڕکردنی باخەڵ و بلاَوکردنەوەی فەساد و بەدڕەوشتی بەکاری بهێنێت٠ هونەرلەهەرولاَتێکدادەربڕی کەلتوور و مێژوو و فۆلکلۆر و خەسڵەتی کۆمەلاَیەتییە٠ (ب)دەڵیَ : هونەری کوردی دابەزییوە ، کچەهونەرمەندێك وێنەی ڕووتی خۆی بلاَودەکاتەوە ، (م س) هەندێك لەبەشەکانی ڤیدیۆی کلیپەکەی لەناوتوالیت گرتووە ئەمەش بێڕێزییەکەبەکلتووری نەتەوەکەی خۆی٠(ش پ)دەڵیَ : بۆنموونەسروودحەماسەت دەخولقێنیَ

و ورەبەرزدەکاتەوە٠هەروەهاهونەرمەند(ش پ)دەڵێ : بەهۆی گۆرانییەکانمەوە هەوڵ دەدەم لاوان هانبدەم ڕوولەخوێندن بکەن٠(س)دەڵێ : گۆرانی ئێستاهەمووی باسی دڵدارییە٠(ئە)دەڵێ : ئەگەربەراوردی هونەرمەندانی کۆن و هونەرمەندانی ئەم سەردەمەبکەین ئەوان لەناخ ودڵەوەگۆرانییان دەوت ، هونەرمەندەکۆچکردووەکانی کوردخزمەتی هونەری کوردییان کرد ، بەلام ئێستاهونەرلەحەزەوەبووەبەکاروسەرچاوەی بژێوی ژیان ، هونەری ڕەسەن میللەتانی دەوروبەرسودیان لێوەرگرتووە٠(ك ع)دەڵێ : گۆرانی ئێستامانگێك دوومانگ خەڵك گوێی بۆڕادەگرێ پاشان لەبەرچاوی نامینێ وگوێی بۆناگرێ٠(ڕ ز) لەبارەی فیلمەتوندوتیژەکان وکاریگەرییان لەسەربینەردەڵێ: ئەگەرئاماژەبەفیلمی توندوتیژبکەین دەبینین کاریگەری هەیەلەسەرهزرولەوانەیەببێتەهۆی گۆڕینی ڕەوشتی مرۆڤ وهاندانی مرۆڤ بۆهەڵچوون وتاوان بەتایبەتی کاریگەری لەسەرمنداڵ زۆرە ، چونکەمنداڵ هەمیشەوابیردەکاتەوەلاسایی چۆنییەتی شەڕەکان بکاتەوە بەتایبەتی منداڵانی ڕۆژهەلات لەکەش وهەوایەکی واداژیاون هەمیشەبیرلەبەکارهێنانی دەمانچەوتەقەمەنی وجۆرەکانی دەکەنەوە٠ئەگەرلەدرامادۆبلاژکراوەکانیش بدوێین کاردەکەنەسەرمرۆڤ چ منداڵ بێ یاخودگەورە٠(ك)دەڵێ : زۆرجاردراماکانی دۆبلاژی کوردی دەبنەهۆی ئەوەی ناوەکانی نێوئەم درامایانەلەمنداڵ بنرێت٠(ئا)لەگەڵ پەخشکردنی زنجیرەدرامای دۆبلاژکراوی کوردی (خۆشەویستی خەمناك) ناوەکەی خۆی گۆڕیوەبە(هاین) دەڵێ : چونکەبەگۆڕینی ناوەکەم وادەزانم دەبمەکەسایەتییەکی وەك (هاین)٠(ئە)بەهۆی کاریگەری زنجیرەدرامای کۆری عاشقی ناوی ژوانیۆن دەبێ وکوڕەکەیان ناودەنێن (ژوانیۆن)٠(س)دەڵێ : هونەرناساندنی گەلێکە٠(چ ن)دەڵێ : بۆئەوەی هونەرپێشبکەوێ پێویستەسوودلەفۆلکلۆروەربگرین وزیندووی بکەینەوەبە شێوەیەکی زانستی٠(م س ئە) دەڵێت : ئەوکەسانەی فیلمی ترسناك تەماشادەکەن کاریگەری خراپی دەبێت لەسەردەروون ولاشەوڕەفتاریان هەربۆیەلەخەویشدادەیانبینێ ودەشلەژێ وتێکدەچێ وخەونی ترسناك دەبینێ٠(هـ ئا) دەڵێ : ئێستالەتەلەفزیۆنەکان دەبینین بەرنامەی زۆرانبازی ئازاد (مصارعة الحرة) پەخش دەکرێت ، خەڵکێکی زۆربینەرین وبەتامەزۆرییەوەسەیری دەکەن ، ئەگەرلەڕووی ئاینییەوەلێی بکۆڵینەوە ، سەیرکردنی لەڕووی ئاینییەوەحەرامە ، لەبەرئەوەی ئەوان تەنیاشۆڕتێکیان لەبەردایە ، لەئیسلامیشداحەورەتی پیاولەنێوان ناوك وچۆکدایە ، لەلایەکی ترسەیرکردنی ئەم جۆرەیارییانەلەڕووی شێوازی یارییەکەوپێکدانانەکەی هەڵسوکەوتیان حەرامە ، دەبینین زۆرجارلەدەم وچاوی یەکتریش دەدەن ، کەپێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەمرمان پێدەکات لەکاتی جەنگدا لەلێدانی دەم وچاوخۆمان بەدووربگرین ، هەروەك فەرموویەتی : (اذاقاتل أحدكم فليتجنب الوجه) رواه

البخاری (م) دەڵێ : زۆربەی زۆری گۆرانییەکوردییەکلاسیکییەکان لەئاکامی ڕووداوێکەوەسەریان هەڵداوە وکەوتۆتەسەرزاری خەڵکی وبلاّوبۆتەوە بۆنموونە : گۆرانییەکی فۆلکلۆری هەیە ، کەسەرەتاکەی دەڵێ :

هەی بەللاروبەللارەوە

توسەری باوکت وەرەماڵەوە

دەگێڕنەوەکەوالەپاش جەنگی یەکەمی جیهانی لەگەڕەکی (سەیسەروەر)ی شاری کەرکووك کوڕێك دڵی بەکچێك بووە بەناوی (بەللەرە) لەئاکامی گڕی ئەوکوڕە گۆرانییەکی داناوە بەسەرئەوکچە٠(ژ) دەڵێ : کەمرۆڤێك لاسایی مرۆڤێکی تردەکاتەوە بەدەنگ وگۆرانی وجوولە لەبەردووهۆی سەرەکییە یان لەبەرئەوەی حەزبەدەنگی دەکات یان لەبەرئەوەی گاڵتەی پێدەکات٠(ك) دەڵێ : زۆردەگمەنەئەودرامایانەی پەندووانەدەبەخشن٠پیاوێك بەدیارئەودرامایا نەدابنیشێت بالەدڵیش دا لێی ناڕازیبێ ئەوگرانییەی نامینێ لەبەرچاوی ئەوگوناهە ، ئەگەرئەو کرداره زۆرببینێت وای لێدێت ناڕەزاییشی کەم دەبێتەوە لەبەرامبەری بۆیەگۆڕانکاری بەسەرسر وشتی دادێت ودەیکاتە کارێکی سروشتی٠

لەبارەی ئەدەب وشیعر :

خوای گەورەفەرموویەتی : (الرحمن علم القران خلق الانسان علمه البيان) کەوابووقەدروبایە خی مرۆڤ پەیوەندی بەتوانای دەربڕین وگفتوگۆوە هەیە ، چونکە نەتوانینی گفتوگۆکەڵێنێکی گەورەیەولەبایەخی مرۆڤ کەم دەکاتەوە٠ زۆرجاریش (درودی خوای لەسەربێ) هانی حەسانی کوڕی سابت وعبداللەی کوڕی ڕەواحەی داوە پاڵپشتێکی بەهێزی لەهەڵبەست وبەیان بۆشیروتیر دروست کردووە ، ئەمەش بەسە بۆکاریگەری وشەوکاریگەری ئەدەب٠هەروەها (درودی خوای لە سەربێ) فەرموویەتی : (ان من البيان لسحرا وان من الشعرلحكمة) واتا : (هەندێ زمانپاراو ی وداڕشتن کاریگەری جادویی هەیە ، هەندێ شیعریش حیکەت ودانایی)٠

ئەدەب دەبێتەدووبەش :-

یەکەم — هۆنراوە (شیعر)

دووەم — پەخشان

هۆنراوە ئاخاوتنێکی کێش وسەرواداره و واتادەگەیەنێ٠(قدامەبن جعفر) هۆنراوەش چەندجۆر ێکە :-

یەکەم — هۆنراوەی ویژدان ودەروون (الشعرالوجدانی) یان هۆنراوەی گۆرانی ، ئەوەیە کەشاعیر

تێی دا گوزارشت لەدەروونی خۆی دەکات ، ئەم جۆرەهۆنراوەیەش چەندلقێکە :

١ — غەزەل : باس لەعیشق ودڵداری وبەئافرەت هەڵگوتن دەکات٠

٢ — مەدح وستایش

٣ — شانازی

٤ — لاواندنەوە

٥ — پەندوئامۆژگاری

٦ — هەجوو (جنێو)٠ جۆری تریشی هەیە٠٠٠

دووەم — هۆنراوەی شانۆیی (الشعرالمسرحی) :

بریتییەلەوەی ، کەچیرۆکێکی شانۆیی بەهۆنراوە دابڕێژری٠

سێیەم — هۆنراوەی شەڕوشۆڕ(الشعرالملحمی) :

بەوهۆنراوەیەدەوترێت ، کەتەرخان دەکرێت بۆگێڕانەوەووەسفکردنی جەنگێ لەجەنگە مێژوو ییەکان وەبەشان وباڵ وتنی سوپاکەونەبەردی پێشەواوجەنگاوەرەکان٠

چوارەم — هۆنراوەی فێرکردن (الشعرالتعلیمی) :

بریتییەلەوهۆنراوانەی ، کەزانستیان تێ ئاخنراوە بۆئەوەی ئاسان بێ بۆلەبەرکردن وەك کتێبی (ئەحمەدی) کەشێخ مەعروفی نەودەهی نوسیویەتی بۆفێربوونی زمانی عەرەبی٠ ئەم جۆرەهۆ نراوانەسۆزوئەندێشەی تێدانییە٠

دووەم — پەخشان (النثر) :

بریتییەلەهەرشتێك کەشیعرنەبێ یاخودبریتییەلەووتراوونوسراوانەی ، کەپابەندی کێش وسەر وانییە٠ پەخشان دەبێتەدووبەش : -

١ — پەخشانی هونەری :

تایبەتە بەنوسینی ئەدیبەوە ، نوسەرەکە تێی داتەعبیرلەئازاروشادی وئاواتی دڵی خۆی دەکات٠

٢ — پەخشانی زانستی وەك کتێبەکانی کیمیاوفیزیاو٠٠٠هتد٠

ئەدەبی بەراورد (الادب المقارن) :

بەدوو واتالێکیان داوەتەوە : یەکەم بەراوردکردنی بەرهەمی دووشاعیر یان دووئەدیب یان بەر هەمی ئەدەبی دوومیللەت لەگەڵ یەکدا لەبوارێك دا ، تابزانرێ شێوازی دەربڕینیان چۆن بوو ە تاچەندکەڵکیان لەیەکتروەرگرتووە٠ دووەم بریتییەلەلێکۆڵینەوەی ئەندازەی پەیوەندی وکار تێکردن ولێك وەرگرتنی ئەدەبەجیهانییەکان لەیەکتر٠

## كۆچكردن بۆدەرەوەی ولآت :

**كۆچ بریتییە لە بەجێهێشتنی ولآتی خۆت یان شوێنی نیشتەجێبوون ولەدایكبوون بۆشوێنێكی تر ، جاچ بەئازادی خۆت بێ یان بەناچاری٠**

**دیاردەی كۆچكردن بۆدەرەوەی ولآت هۆی یەكەم ئابوورییە ، چونكەكاتێك باری ئابووری بەرەوباشتردەڕوات ئەم دیاردەیەكەمتردەبێتەوە٠بێگومان چەندین هۆكارهەیەبۆئەوەی مرۆڤ ولآتی خۆی بەجێبێلێ وكۆچ بكابۆولآتێكی دیكە،بەلآم كۆچكردن بەمەبەستی دابینكردنی بژێوی ژیان دیاردەیەكی بەرچاوبووە٠(م) دەڵێ : ئەگەربەوردی سەیری لایەنەخراپەكانی ئەم دیاردەیەبكەین دەبینین كەچەندین لایەنی خراپ لەمەسەلەی كۆچكردن بۆهەندران هەیە ، بۆنموونە : كەس وكاروخانەوادەكەی بەجێدێلێ ، هەروەهاهەتادەگەیتەهەندەران گرفتی كوشتن وكەمین ومانددوبوون ڕوودەدات ، هەروەهازۆرجاركچ وژنی لەگەڵ ناگەڕێنەوە ولآت ئاژاوەوئابڕووچوون ڕوودەدات ، هەروەهالەدەستدانی ئیمان وئەخلاق بۆزۆركەس ڕوودەدات ، كەبەناچاری دەكەوێتەژێركاریگەری داب ونەریتێك كەدوورەلەئەووزیانی پێدەگات٠(پ س) دەڵێ : كۆچ مێژوێكی زۆركۆنی هەیە ، هەرلەسەرەتای هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام پیاوانی خواپەرست بەهۆی ئەشكەنجەدانیان كۆچیان دەكرد ، هەرلەوسەردەمەدا زۆرلەخەڵكی ئەوسامنداڵەكانیان دەبردبۆئەومالآنەی لەدەرەوەی شارەكان دەژیان بۆماوەی چەندساڵێك بۆئەوەی بەباشی منداڵەكانیان لەوكەش وهەوایەداگەشەبكات ئەمەش خۆی لەخۆیداجۆرێكەلەكۆچ٠هەروەهائێستاكەش زۆرلەبازرگانەكان كۆچ دەكەن لەشارێك بۆشارێكی ترياخودلەولآتێك بۆولآتێكی تردیارەئەودیاردەیەهەربەردەوامەوڕۆژلەدوای ڕۆژلەزیادبووندایە ، ئەمڕۆڕۆژنەسەدان فڕۆكەوكەشتی مرۆڤەكان دەگوازنەوە ، كۆچ بەتەنیاهەرلای مرۆڤەكان نییە ، بەڵكوباڵندەكانیش كۆچ دەكەن چ بەدوای نێچیریاخودگەرمیان وكوێستان دەكەن ، هەروەهاماسییەكانیش لەنێوقولایی دەریاكان بەهەمان شێوەلەگەڵ گۆڕینی وەرزەكاندا جێگاوشوێنی خۆیان دەگۆڕن ، ئاماژەبەوەش دەكات لایەنی چاكی كۆچكردن فێربوونی زمانێكی ترە٠(ب) دەڵێ : سەرەڕای ئەوهەمووزەحمەتییەی كەلاوان لەڕێگای چوونیان بۆهەندەران دووچاری دەبنەوە بەشی هەرەزۆریان سنووورداش دەكرێنەوە ، دوای سەرفكردنی پارەیەكی زۆربەدەستبەسەری دەگەڕێنرێنەوەولآت٠(ه س) دەڵێ : لەمێژووی ژیانی مرۆڤ لەبەرهەرهۆیەك بووبێت (ئابووری ، سیاسی ، كۆمەلآیەتی) خاك بەجێ هێشتن وڕوولەولآتان كردن هەرهەبووەوهەردەشبێ٠(ك) دەڵێ : من دەڵێم بەردلەجێی خۆی سەنگینە٠كۆچكردن بەزۆری لەڕۆژهەلآت بۆڕۆژئاوایە ؟ ئەویش لەدووسەرچاوە خۆی دەبینێتەوە یەكەمیان ئابووری**

، دووەمیان سیاسی٠لەڕۆژئاوازۆری دەرفەتی کاروایکردووە خەڵك لەڕۆژهەڵاتەوەکۆچ بکەن بۆڕۆژئاوا ، لەلایەکی ترتێبینی دەکرێ زۆربەی کات کۆچکردن بەدیاردەیەکی سلبی باس دەکرێ ، بەڵام وێڕای هەمووئەوسلبیاتانەی باس دەکرێ کۆچکردن لایەنی ئیجابیشی هەیە ئەوانەی لەوێ کاروکاسبی دەکەن دەستکەوتێکی باشیان دەبێ ئەم دەستکەوتە دەنێرنەوە کەس وکاریان لەنەبوونی ڕزگاردەکەن ، هەروەهائەم کۆچەوادەکات کەبێکاری کەم بێتەوە دەرفەتی کاربۆئەوانە زۆرتربێ کەلێرە دەمێننەوە بێگومان لایەنی سلبیشی زۆرە٠(د) دەڵێ : هەرچەندە وڵاتانی ڕۆژئاوا بەلای هەندێ کەسەوە وەك (المدينة الفاضلة)وایە ، بەڵام لەڕاستی دا وڵاتانێکی بێ سۆزوبەزەیین٠(س) دەڵێ : من قۆناغی ئامادەیی بازرگانیم تەواوکردووە لەبەرچاولێکەری ئەم ڕێگایەم گرتەبەر٠

**لەبارەی تاوان :**

هەرلەوکاتەوەی قابیل هابیلی کوشتووە تاوانی کوشتن دەستیپێکردووە٠مێژووی مرۆڤایەتی لەسەردەمی کۆنەوەتاکوئێستاجۆرەهاستەم وغەدری تۆمارکردووە ، کۆنترین تاوانیش تاوانی کوشتنی یەکێك لەکوڕەکانی باوکەئادەمەبەدەست برای خۆی لەئەنجامی حەسودیدائامرازەکانی کوشتنیش زۆرن وەك دەمانچە ، چەقۆ ، ژەهر ، هەروەهاکوشتن بەئامرازی ناماددی واتاتاوانی کوشتن ئەنجام دەدرێت بەکاری دەروونی وەکوخەفەت کەدەبێتەهۆی مردن وەك یەکێك هەواڵێکی ناخۆش بەیەکێك ڕابگەیەنێت ئەمەش ببێتەهۆی مردنی وەك زۆرجارلەڕۆژی درۆی نیساندائەمەڕوویداوە٠هاندەرەکانی کوشتن ، زۆرجارهاندەردەبێتەهۆیەکی بنچینەیی بۆتاوانی کوشتن ئەمەش دەبێتەهۆیەکی سەرەکی پاڵ بەتاوانباردەنێت بۆئەنجامدانی تاوانەکەی٠گومان ودڵپیسی هەیەکی ترە ، زۆرجاروابووە پیاوژنەکەی خۆی دەکوژێ لەبەردڵپیسی ونەفامی٠عەبدوڵای کوڕی مەسعود (خوای لێ ڕازیبێ) دەڵێ : پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی: (أول مايقضي بين الناس يوم القيامة في الدماء) واتا : (یەکەم شت لەنێوان خەڵکدادپەروەری لەسەردەکرێت لەڕۆژی دواییدالەسەرخوێنە)٠

(د)دەڵێ : ژنان کەمترتاوانی کوشتن ئەنجام دەدەن ، هەروەهاتاوانی کوشتن لای ژنان شێوەیەکی جیاوازتری هەیەلەوشێوەیەی لای پیاوان بەرچاودەکەوێت :

١ — لەباربردنی منداڵ :

ئەم تاوانەهۆکاری زۆرەلەوانەهۆکاری نەبوونی ، کاتێك ژمارەی منداڵەکانی خێزانێك زۆرەواتەسەووڕدەکەن ناتوانن ئەومنداڵانەبەخێوبکەن٠مامۆستا(ش ڕ)دەڵێ : دروست نییەلەباربردنی منداڵ بەبیانووی بژێوی ونەداری ، چونکەخوای گەورەڕزق وڕۆزی ئینسان

دەداوەك دەفەرموێ : (ولاتقتلوا أولادكم خشية املاق نحن نرزقهم واياكم)الاسراء: ٣١واتا : (منداڵەكانتان لەترسی ڕۆزی مەكوژن ، ئێمەخۆراك دەدەین بەئەوان وئێوەش)٠ بەتایبەتی لەباربردنی منداڵ لەدوای (١٢٠)سەدوبیست ڕۆژییەوە واتادوای گیان بەرهاتنی٠ لەچین قەدەغە یە لەیەك منداڵ زیاتریان هەبێت ، ئەگەرحەزیان لە منداڵێكی تربێت دەبێت بەفەرمی داوای مۆڵەت لەحكومەت بكەن ئەمەش كاتێكی زۆری دەوێت تاوەلاَمی دێتەوە ، لەبەرئەوە ڕێژەی لە باربردن لە(چین) لەهەمووشوێنێكی تری جیهان زۆرترە٠ئەوولاَتانەی خاكیان كەمە دانیشتوانیا نیان زۆرە هەوڵ دەدەن ژمارەی دانیشتوان سنورداربكەن ، بەلاَم ئەو ولاَتانەی خاكیان زۆرەودا نیشتوانیان كەمە هەوڵ دەدەن ژمارەی منداڵ زۆربكەن٠

٢ — خۆكوشتن :

خۆكوشتن لەناوژنان زۆرترباوە ئەمەش هۆكاری زۆرەلەوانەهۆكاری دەروونی٠(ش پ)دەڵێ : هەرمرۆڤێك مرۆڤێكی تربكوژێ هەرگیزبەئاسوودەیی ناژی یان ئەگەریەكێ بكوژێ دەخرێتەبەندیخانەوە ئەوكەسەی مرۆڤێكی تردەكوژێ ناتوانێ ئاسوودەبێ وخۆشی دەمرێ٠(ك) دەڵێ : هەم ئافرەت وهەم پیاوڕوودەدات تاوان ئەنجام بدات ، بەلاَم هەریەكەوبەشێوازێك ، بۆنموونەئافرەت دەتوانێت بەهۆی قسەگێڕانەوەئاژاوەوئاشووب دروست بكات (ز) دەڵێ : پێموایەئافرەتیش تاوان ئەنجام دەدات ، چونكەڕەچاوی ئەوەناكات هاوسەرەكەی توانای دابینكردنی هەیە یان نا ، ئەمەش والەهاوژینەكەی دەكات هەست بەبێزاری بكات ودنیای لەبەرچاوڕەش بێ ، جگەلەوەی داواكاری زۆردەبێتەهۆی ناكۆكی نێوان ئافرەت وپیاو ئەمەش ڕەنگەخێزان لەبەریەك هەڵوەشێنێتەوە ومنداڵ لەسۆزی دایك یان باوك بێبەش بكات٠(پ خ) دەڵێ : لەبەرئەوەی پیاولەئافرەت بەهێزترە سەرچاوەی زۆربەی تاوانەكانیش بەگشتی هێزە ، بەڕای من پیاولەئافرەت زیاترتاوان ئەنجام دەدات ، ئەگەرئەقلی لەگەڵدانەبێت٠(ع ڕ) دەڵێ : ئەگەرتەماشای دۆسیەی تاوانەكان لەدادگابكەین كەتن وتاوانەگەورەكان دەبینین هەتاسەرپێچییەكانیش بەشی زۆری پیاوە ، كەم وابووە ئافرەت دەستی بچێتەكەسێك وبیكوژێت یان دزییەكی شەوانەئەنجام بدات یان ڕێگالەخەڵك بگرێت٠

سزا :

لەشارستانییەتی بابلی چەندان تاوان سزایان لەناوبردن بوو ، وەك : (دزی گەورە ، شاردنەوەی كەل وپەلی دزراو ، سڕینەوەی شوێنەواری كوتران لەسەرچەهرەی بەندەكوەیلەكان تاخاوەنەكانیان نەیان ناسنەوە ، كوشتن ودەست درێژیكردنەسەرئافرەت وچەندانی تر٠لەئاینی جوولەكەچەندان تاوان سزای لەناوبردن بوو وەك : سیحربازی ، هەڵگەڕانەوەلەئاین ، ژن

وپیاوی داوێنپیس ، نێربازی ، ئەوکەسەی دەست درێژی کردباسەردایکی یان خوشکی تاوانبارابەردباران دەکراوخەڵکیش بەشداریی بەردبارانەکەدەبوون تاگیانی دەردەچوو٠لەئینگلستان (٢٠٠)دووسەدتاوان سزایان لەناوبردن بوو، بۆنموونە لەساڵی (١٨١٤) یەکێکیان لەسێدارەدابەهۆی پچڕینی دارێك !!! لەساڵی (١٨٣٣) منداڵێکی نۆساڵان بەهۆی دزینی نەختێ بۆیەکەنرخەکەی دووپەنس بوولەسێدارەدرا!لەئاینی ئیسلامدامرۆڤ بەجێنشینی خوای گەورەدانراوە بۆیەڕێگەنادرێ گیانی لەناوببرێ لەچەندحالەتێکدانەبێ :-

١ — ئەوکەسەی یەکێك بەئەنقەست بەهەڵەنەبێ بکوژێ دەکوژرێتەوە٠

٢ — ئەگەرژن لەگەڵ پیاوێکی تر ، پیاویش لەگەڵ ژنێکی ترزینابکات تاوانەکەش بچەسپێ بەردباران دەکرێن تامردن٠

٣ — سیحربازئەگەرتەوبەنەکات٠

(لەزیانەکانی سیحر : لێك جیاکردنەوەی ژن وپیاوکێشەخستنەنێوانیان تادەرەنجام بگاتەئەوئاستەی کەتەلاق ڕووبدات وخێزان هەڵبوەشێتەوە ، ئەمەش بەڵگەی ئایەتی ئەوجۆرەسیحرەهەیە : (فیتعلمون منهمامایفرقون به بین المرء وزوجه ) البقرة : ١٠٢ یاخودوالەوکەسەدەکات ، کەسیحری لێکراوە بەبەردەوامی حەزبەتەنیایی دەکات ویانیش بەردەوام بێدەنگ دەبێت وتاقەت وخولقی قسەکردنی نابێت ، یاخودژنەکەلەپێش چاوی پیاوەکەناشیرین دەکەن یان پیاوەکەلەپێش چاوی ژنەکەناشیرین دەکەن٠کەواتەسیحرمەترسییەکی گەورەیەلەسەرخانەوادەولەسەرئافرەت وپیاوچەندجاروابووە بەسیحرژن وپیاویان لێك کردووە وعائیلەیان تەدمیرکردووە٠لەسەردەمانێکی زوولە(چین وژاپۆن)دا (٣٠٠٠)سێ هەزارداب ونەریت هەبوو ، هەرکەسێك یەکێك لەم داب ونەریتانەی پێشێل کردبا دەکوژرا!!!

٤ — نێربازی٠(نێربازی لەنێوگەلی حەزرەتی لوط (علیه السلام) باوبوو ، ئەگەرچی حەزرەتی لوط (علیه السلام) لەپەیام وخەشمی خوا(جل جلاله) ئاگاداری کردنەوە ، بەلاّم ئەوان هەردەستبەرداری نەبوون ، تاخوای گەورە (جل جلاله) سزایەکی زۆرسەخت ودژواری بۆناردن ولەناوی بردن٠خوای گەورەسەبارەت بەوان دەفەرموێ : (تأتون الفاحشة ماسبقكم بها من أحد من العالمين انكم لتأتون الرجال شهوة من دون النساء بل أنتم قوم مسرفون) الاعراف : ٨٠ - ٨١ واتا : (ئایائێوەبۆکارێکی وابەدوخراپ دەکەن کەکەس لەخەڵکانی پێش ئێوە نیکردووە ؟ ئێوەبۆئارەزووشکاندن دەچنەلای پیاوان نەك ئافرەتان ئەوەش گوناه وتاوانە) کەواتەلەناوهەرگەلێك ئەودیاردەیەسەرهەڵبدات ڕەنگەئەوگەلەدووچاری سزای سەختی خوای گەورەببنەوەوکۆمەڵگەلەنێوبچێ٠

تێبینی :-

هەندێ لەوئەحكامانەتەنیالەدەسەلأتی ئیمامدایە جێبەجێكردنی ، بۆتاك تاكی خەڵك نییە٠

## دیاردەی سوالكردن :

دیاردەی دەرۆزەكردن بۆتەدیاردەیەكی زەق وئاشكرا ، ڕوولەهەركووچەوكۆلأن وبازاڕوبەردوكانێك دەكەی چەندین منداڵ وكیژی عازەب وژنی منداڵ لەباوەش وپیروشەڵ وگۆج و٠٠هتد٠ڕۆژێك پۆلیس گەنجێكی تەلەكەبازی دەست گیركردبووكەجووتێ دارشەقی دەخستەبن باڵی گوایەئیفلیج بووە كەچی نەئیفلیج بوونەنەخۆش٠(ف ك س) دەڵێ : سوالكردن دووجۆرە ، جۆرێكیان كەسانێك پێی هەڵدەستن بەشێوەیەكی كاتی ولەبەرباری خراپی ئابووری پێویستەخەڵكی بەتوانای ماددی (دەوڵەمەند) یارمەتی ئەوجۆرەكەسانەبدەن،چونكەخەڵكی لێقەوماون ولەبەرهەندێ بارودۆخ تووشی دەرۆزەكردن بوون ، جۆری دووەمیان كەسانێك پێی هەڵدەستن كەدەتوانن ئیش وكاربكەن ئەم جۆرەكەسانە ئیشێكی ئاسانیان كەوتۆتەبەردەست وزۆرتەمبەڵن ونایانەوێ خۆیان ماندووبكەن سوالكردنیان كردۆتەپیشەی خۆیان٠سوالكەرەكان هەژاری وبەخانووی كرێ بوون ونەخۆشی ودروستكردنی ڕپۆرتی پزیشكی وچەندوێنەیەكی كەمئەندامی ودەیان فێڵی تربەكاردەینن٠لەئەنجامی هەڵمەتی دەستگیركردنی پۆلیسی شارەوانی دەركەوتووە كەبەشی زۆری ئەوانەفێڵكردن بوون لەهاولأتییان تاكوخەڵكی سۆزیان بەرامبەریان بجوولێ وپارەیان پێببەخشن٠سوالكەرهەبووە كچ بووە خۆی بەژن نیشانداوە ومنداڵی لەلابووە منداڵەكەی بەكرێ هێناوە ، ڕۆژانەیەكی داوەتەدایك وباوكی منداڵەكە٠(ڕ ف)دەڵێ : زۆرجارسوالكردن ڕووداوی دڵتەزێنی بەدوای خۆیداهێناوە بەتایبەتی ئەگەرماڵەكەتەنیاكەسێك لەماڵەوەبووبێ دەستی خۆیان دەوەشێنن لەناحییەی ڕزگاری سەربەشاری هەولێرسەالكەرەكان دەچنەنێومال وچەقۆلەخاوەن ماڵ دەدەن ، ژنەسوالكەرێك دەچێتەماڵێك كەدەبینێت تەنیایەك ژن لەماڵەكەیەچەقۆدەردێنێت ولەژنی خاوەن ماڵ دەدات ودوای هات وهاوارسوالكەرەكەهەڵدێت٠زۆربەی ئەوانەش كەسوالكەرن ئافرەتن ، چونكەقەبیلەی واهەیەپیاوەكان كارناكەن وئافرەتەكانیان دەنێرنەسوالكردن٠(س)دەڵێ : مرۆڤ ئەگەرهاتووباری ئابوری ناتەواوبووئەوكات دەتوانێ بۆماوەیەكی كورت سوال بكات ئەویش بەشەرمەوە٠(ش ڕ) دەڵێ : دەرۆزەكردن تەنیالەكاتی ناچاریدا دروستە ، وەك :

١ - لەبەرنەخۆشی گران وناچاری٠

٢ - لەبەرقەرزاری٠

٣ - دانی خوێن وسولحکردن٠

(س) دەڵێ : بۆنموونە گەنجێکی بەقەلافەت وڕێك وپێك هەندێك جاریش لەگەڵ ئافرەتێك دایە ، دێتەپێشەوەودەڵێ : لەفلآنە شوێەوە هاتووم ، ئێستادەمەوێت بگەڕێمەوە پارەم لێ بڕاوە یان دەڵێ : دەگەڕێمەوە شارەکەی خۆم پارەم پێ نییە ئێ خۆدەتوانێ تەکسییەك بگرێ ولەبەردەرگاپارەکەی پێ بدات٠(م) دەڵێ : مێردەکەم بەزۆردەمنێرێت وئەوپارەیەی کەپەیدای دەکەم قومارومەشڕوبی پێدەکات ، نەبوونی کەس وکاریشم وایکردووە کەئیستغلالم بکات٠(ك) دەڵێ : کەسانێك هەن کە سوال دەکەن پاساوێکیان هەیە کەگوایە کاریان نییە یان کەمئەندامن یان ئاوارەن ئەم پاساوانە بەشێکی ناڕاستن ، چونکە کابرای کەمئەندام کەدانیشتووە سوال دەکات دەتوانێ شت بفرۆشێ ، بەلآم کردویانەتەپیشەودەستبەرداری نابن٠زۆریش لەوانە سوالکردنەکەیان بۆکاتی منداڵی وخێزانەکەیان دەگەڕێتەوە بەتایبەتی بۆژنان سوالکردن زیاترترسناکە بەتایبەتی ئەوانەی لەدوکانەکان دەگەڕێن ودەست دەخوێننەوە وسوال دەکەن بەتایبەتی ئەگەرجوان وسەرنجڕاکێش بن٠

لەبارەی قەرز :

قەرز واتاوەرگرتنی پارەیان هەرشتێکی دیکە لەبڕی پارەبۆکاتێکی دیاریکراو ، لەپاش ئەوماوەدیاریکراوە بۆخاوەنەکەی بگەڕێنرێتەوە٠قەرزاری دیاردەیەکەهەندێ جارمرۆڤ بەناچاری پەنای بۆبردووە ، بەلآم هەندێ جاریش مرۆڤ بەشێوەیەکی ئاسایی بۆنموونەئەوژنانەی لەدوکان وئەوسەیارەگەڕۆکانەی کوتاڵ وکەل وپەل وپێداویستی ناومالْیان لایەبەنێوکوچەوکۆلآنەکان دەسوڕێنەوە ئەوژنانەشتیان بەقەرزلێ دەکڕن بەزۆریش مێردەکانیان بەمەڕازی نین٠مامۆستا(س)دەڵێ : زۆرجارئەبێ مرۆڤ ناچاردەبێ کەقەرزبکات بۆنموونەژن بۆکورێکی دەینێ یان تووشی گرفتێك دەبێ یان لەبازرگانییەك توشی تێکشکان هاتووە ئەمانەووێنەیان هەڤن وڕەوان مرۆڤ لەپێناویداقەرزبکات وتوشی قەرزاری ببێ زۆربەجێشەمرۆڤی باش ئاوڕلەم جۆرەکەسانەبداتەوەوقەرزیان بداتێ ، بەلآم ئەگەرنەگاتەڕاددەی پێویستی وناچاری نابێ مرۆڤ خۆی توشی قەرزبکات بۆنموونەنابێ قەرزبکات بۆئەوەی زیاترخۆشگوزەران بێت ولاسایی دەوڵەمەندان بکاتەوە ئەوەنابێ قەرزبکات وناشبێ قەرزی بدرێتێ٠ لەبوخاری گێڕدراوەتەوە ، لەعائیشە(خوای لێ ڕازیبێ) : توفي رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ودرعه مرهونة عند يهودي ، بثلاثين صاعا من شعير) کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) پێداویستی خۆی لەجولەکەیەك کڕیووە کەپارەی ئامادەی پێ نییەبەقەرزدەیبات٠

## کوشتنی بەزەیی چییە ؟

لەجیهانی ئەمڕۆدالەئەوروپادیاردەیەك هەیە ئەویش دیاردەی کوشتنی بەزەییە ، وەکوئەوەی یەکێك تووشی نەخۆشییەك بووبێ چارەسەری نەبێت تاڕزگاری بێت لەئێش وئازارلێرەدائەوپزیشکەی هەڵدەستێ بەکوشتنی نەخۆشەکە تاوەکوڕزگاری بکات لەئێش وئازاری نەخۆشییەکەی کەچارەسەری بۆنییە بەڕای من بەتاوانبارداەنرێت ونابێ هیچ یاسایەك ڕێگەی پێبدات ، چونکەئەم کارەکوشتنی بەئەنقەستە ئەگەربەڕەزامەندی نەخۆشەکەش بێ ، چونکەبەدەستی مرۆڤێك ئەنجامدەدرێ٠بەشێوەیەکی گشتی ئەم دیاردەیەئەوروپای گرتۆتەوە خۆشبەختانەلەجیهانی ئیسلامدا ئەگەرهەشبێ دەگمەنە ، چونکەئاینی ئیسلام بەتەواوی دژی ئەم کارەیە ، وەئەمەنەبەزەییەونەدڵسۆزییە٠

## لەبارەی نوستن :

نوستن هۆکاری حەوانەوەوئارامی جەستەیە ، پاش هەستان لەخەومرۆڤ دووبارە چالاك دەبێتەوە وهێزوتوانای بۆدەگەڕێتەوە٠باسی نوستن فراوانەوزۆرلایەن دەگرێتەوە : بڕی نوستن ، کاتی نوستن ، شێوازی نوستن٠لەکاتی نوستن بۆدڵنیابوون لەپاك وخاوێنی ونەبوونی زیندەوەری زیانبەخش لەناویدا٠خەوتن لەسەرلای ڕاست٠نەخەوتن لەسەرڕوو٠زیکرکردن پێش نوستن٠خەوتن لەسەرلای ڕاست باشترین شێوازی نوستنە٠ئەوکەسەی لەسەرڕوودەنوێت پاش کەمێك هەست بەتەنگەنەفەسی دەکات٠نوستن پێویستییەکی سەرەکی ژیانەهەموومرۆڤێك پێویستی پێیەتی ، پشووبەجەستەومێشکی مرۆڤ دەدات بۆیەپێویستەلەشەووڕۆژێکدا بەلایەنی کەم (٧) حەوت سەعات بخەوین٠(ك ڕ) دەڵێ:زۆرنوستن باش نییەمنیش نەمکردۆتەپیشە بۆیەبەیانییان زووهەڵدەستم ئیش وکاری ناوماڵ دەکەم ، زۆرلەشم سوك وخۆشە وهەست بەئاسوودەیی دەکەم کەوازووهەڵدەستم٠(س م) دەڵێ : من بەیانییان زووهەڵدەستم یارمەتی دایکم دەدەم ، خوانی بەیانی ئامادە دەکەم لەشم زۆرسوکەوچوست وچالاکم ، خەویشم سوکەهەرتەقەی دەرگابێ بەئاگام٠(هـ ت) دەڵێ : من لەگومرگی سەوزەدائیش دەکەم بۆیەبەیانییان زوولەخەوهەڵدەستم ، چونکەکارەکەم ڕێگام پێنادات بۆیەدەبێ زوولەخەوهەڵبستم٠لێکدراوەتەوە مرۆڤێك کەحەفتاوپێنج ساڵ بژی ، تێکڕانزیکی بیست ساڵ تەمەنی لەنووستن دا دەشکێ٠هەروەهادڵ لەکاتی بێداری دا لەدەقیقەیەکدا حەفتاوپێنج جارلێدەدات لەکاتی نوستن دا دێتەسەرشێست جار ، هەروەها پلەی گەرمی لەشی مرۆڤ لەکاتی

نوستن دا دێتەخوارێ٠پاش خواردن بەتایبەتی پاش ژەمی گەورە واباشە هەندێك جولەی سادە ئەنجام بدرێت یەكسەرپاڵنەكەوی ، چونكە دەبێتە ئەگەری پەیدابوونی گەلێك كێشەی وەكو : قەلەوبوون ونارەحەت بوونی گەدە٠لەئاینی ئیسلامدا بەگرینگییەوە باس لەخەوكراوە لەسوڕەتی (نبأ) ئایەتی (٩) خوای گەورە دەفەرموێ : (وجعلنا نومكم سباتا) واتاخەوپشووهێوریتان پی ٘دەبەخشێ٠

سیستەمی نوستن :

١ – زووبخەوی بۆئەوەی بۆنوێژی بەیانی هەڵبستی٠

٢– ئەبێ بەیادی خوا (جل جلاله) بخەوی ، وەكو : خوێندنی ئایەتولكورسی و٠٠٠هتد٠

٣– لەسەربان نەخەوی ئەگەرستارەی نەبوو٠

٤– جێگای خەوەكەت بتەكێنی نەوەك دوپشك یان ماریان شتی لەوبابەتەی چووبێتەناو٠

٥ – دەرگاكان دابخەی٠

٦ – ئاگربكوژێنییەوە نەوەك قوماش یان كاغەزێك بیسوتێنی یان هەڵبچی٠

خەون :

زانایانی ئیسلام خەوبینینیان بردۆتەوەسەرسێ سەرچاوە ، یەكەمیان لەخوای گەورەوە ، دووە میان لەشەیتانەوە ، سێیەمیان لەنەفسەوە٠ زانایان بۆیان ڕوون بۆتەوە چەند شتێك هەن دەبنە هۆی خەوبینین ، وەك ئەوشتانەی هەست ئەبزوێنن وسەرنج ڕاكێشن٠هەروەهاپڕبوونی گەدەلە خواردن ئەمەش دەبێتەهۆی خەوبینینی ناخۆش٠

لەمیسرِی كۆندابەهۆی خەوبینینەوە حەزرەتی یوسف (علیه السلام) زانی چی ڕوودەدات وەكولەقورئانی پیرۆزدالە(سوڕەتی یوسف)داباسكراوە ، كەحەزرەتی یوسف (سەلامی خوای لێ بێ) دەستێكی باڵای هەبوولەلێكدانەوەی خەون دا ، توانیویەتی خەوی یەكێك لەپاشاكانی میسرِلێكبداتەوە ئاگاداری كردووە كەدوای حەوت ساڵ وڵاتەكەی تووشی برسێتی وگرانی دەبێ٠وەدەبێ چارەسەری بۆدابنێن ، ئەم خەوە هاتۆتەدی و چارەسەركراوە ، وتراوە ئەم پاشایە لەسەرشەریعەتی حەزرەتی ئیدریس بووە ، ئیمانی بەخوا(جل جلاله)هەبووە ، بەڵام زۆرلەپاشاكانی میسرِ بتپەرست بوون وفیرعەونی زەمانی حەزرەتی مووسا(علیه السلام) كافربوو٠زانای بەناوبانگی كەنەدی (فردریك أعزانت) بەهۆی خەوبینینەوە توانی دەرمانی ئەنسۆلین بدۆزێتەوە بۆچارەسەری نەخۆشی شەكرە ، ئەم زانایەلەساڵی (١٩٢٣) خەڵاتی نۆبڵی پێ بەخشرا٠بەڕای (بافلۆف) چەند هۆیەك دەوری هەیە لەدەست نیشانكردنی ناوەڕۆكی خەونەكانمان ، ئەوكاروبارانەی كەڕۆژانە پێی هەڵدەستین زۆرجاردەبێتەناوەڕۆكی

خەونەکانمان، بەڵام بەشێوەیەکی شێواو یان زۆرجاریادگارییەکی زۆرکۆن ، ئەگەرهی منداڵیش بێ کەماوەیەکی بەسەردا تێپەڕیوە ، لەبیرمان چۆتەوە کەچی دەبینین ناوەڕۆکی خەونێکمان پێك دەینێ٠هەروەها زۆرخواردن لەپێش خەودا یاخود جۆری خەوتن زۆرجارتووشی هەناسەتەنگیمان دەکات یان بەگران خوێن لەلەشمان دەسوڕێتەوە ، چونکە دڵ ناتوانێ ئیشی خۆی بەباشی بکات ، چونکەهەناسەدانمان لەبارێکی تەواودانییە بۆیە ئەوخەونانەدەبینین ، کەخەریکە دەخنکێین٠خەون مانایەکی مەجازیشی هەیە ، دیارە خەون بەمانامەجازییەکەی هیواوئاواتە بۆنموونە (س) دەڵێت : خەونی گەورەی من ئەوەیەببم بەدکتۆر٠گۆڤاری گوڵان لەژمارە (٦٣٩)ی ساڵی (٢٠٠٧) بلاۆیکردۆتەوە کەپیاوێك لەخەون دا بینیویەتی کەواشاخی بۆپەیدا دەبێ ئەم خەونە هاتەدی لەدواتەمەنی بۆتەخاوەنی دووپارچە گۆشتی زیادە لەسەری کەوەك شاخ وایە ، شاخی یەکەمی لەلای ڕاستەوەپەیدابوو پاش ماوەیەکی دیکە شاخی دووەمی پەیدابوو لەلایەکی تری سەری درێژی ئەم شاخەدەگاتە (١٤)سم وپانی نزیکەی (٧)سەنتیمەترە٠هەرچەندە ئەم دووشاخەکاریگەری نەبووە لەسەرتەندروستی ئەم پیاوە ، بەڵام شێوەی تێکداوە٠

## بورجەکان :

ئەستێرەناسی کارێکەکەئەستێرەناسەکان لەڕێگەیەوە هەوڵ دەدەن هەواڵی داهاتووبەخەڵکی بدەن ئەوداهاتووەی جگەلەخوای گەورەنەبێ هیچ کەس نایزانێ٠لەمێژەباس لە کەلوەکان کراوە هەندێك کەس چارەنووس وداهاتووی خۆیان بەخوێندنەوەی ئەوکەلوانە گرێداوە ، کەدوورەلە زانست ولێکدانەوە زانستییەکان٠

دیاردەی کەلووەکان بابەتێکە هەندێ خەڵك بایەخی پێدەدەن٠(ك ش ق) دەڵێ : نوسینی بورج وکەلووەکان لەڕۆژنامەکان ، خۆئەگەربڵێ کێشەیەکت دەبێ لەگەڵ خێزانەکەت ئێ هەمووکەس لەماڵەوەهەندێ جارتووشی کێشەدەبێ لەوکاتەدائەوکەسەدڵتەنگ دەبێ٠یان دەنووسێ تووشی گیروگرفتی ئابووری دەبی ئەوەئاساییەلەوانەیەتووشی بیت٠بەکورتی بەهۆی کەلووەکانەوەمرۆڤ سەرودڵی دەگیرێ ودەکەوێتەدڵەڕاوکێ ونیگەرانییەوە وای لێ دێ هەمووکات لەخۆی بپرسێ دەبێ چ زەرەرێکم تووش بێ٠(ڕ) دەڵێ : ئەم کەلوانە تەنیابۆتێکدانی دەروونی مرۆڤن ، بەهیچ شێوەیەك نایخوێنمەوەوباوەڕیشم پێی نییە٠(پ) دەڵێ : هەندێك جارپێشبینییەکان مرۆڤ توو شی دڵەڕاوکێ دەکات٠ (س) دەڵێ : کەلوەکان لەڕووی ئاینییەوە بەحەرام دادەنرێ ، چونکە لە سەردەمانێکی زووەوە کاهین وئەوانە پێشبینییان دەکرد ، بەڵام ئێستائەمە چۆتەقالبێکی ترەوە من بڕوام پێی نییە ، چونکە کاریگەری نێگەتیڤی هەیە٠

**تەکنەلۆژیا :**

تەکنیك بۆخزمەتکردن وئاسانکردنی زەحمەتییەکانی ژیانی مرۆڤ بەرهەم هاتووە ، بەڵام بەکار هێنانی ناتەندروستی تەکنیك بۆتەهۆی پەیدابوونی کێشەوگیروگرفت٠ تەلەفۆن هەرچەندە بۆ خزمەتی مرۆڤ دروستکراوە ، مەسافەی نێوان مرۆڤەکان دەسرێتەوە ، بەڵام ئێستاکە بۆتە هۆی سەرهەڵدانی کێشەوگیروگرفت ودابڕانی جەستەیی ومەعنەوی کۆکەلگا٠ئەمڕۆبۆتەعزیەوسەرد ان تەنهابەکورتەنامەیەك ئەوئەرکەجێبەجێ دەکرێت ، بەڵام لەکۆن دا بۆئەم ئەرکە بەسەدان کیلۆمەتردەبڕا ، تەوقەکردن ویەکترلەئامێزگرتن بەمۆبایل ناکرێت٠لەلایەنی ئەخلاقی لەڕێگە ی سەدان ماڵپەڕوپێشکەشکردنی مۆسیقاووێنەی دوورلەئەخلاقی دەبێتەهۆی کاریگەری مەتر سیدار٠هەروەهادەبێتەهۆی دروستکردنی ناکۆکی بۆخانەوادەکان وکەم نین ئەوکەسانەی بەهۆی مۆبایلەوە کوژراون یان ئابڕوویان چووە٠هەروەهاکەمکردنەوەی ئارەزوولەبواری خوێندن وکەم خەوی ودابەزینی ئاستی خوێندن لەوانەکانی قوتابخانەکان وئەرکی قوتابخانە٠هەروەهادوورکەو تنەوەلەکەلتوری کۆمەڵگاوخۆگۆڕین لە بواری جل وبەرگ وشێوازی پرچ لە ژێرناوی مۆدیل دا٠ هەروەهابەکارهێنانی مۆبایلی گرانبەها بۆخۆدەرخستن وتەکەببور٠هەروەها شوفێرلەکاتی بەکا رهێنانی مۆبایل ڕووبەڕووی ڕووداوی هاتووچۆدەبتەوە٠هۆکارەکەشی بەکارهێنانی مۆبایلە وەك مەسەنجەروکورتەنامەیان بەکارهێنانی بەرنامەکانی تری مۆبایل لەکاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبیل دا هەروەهامەترسی مۆبایل لەبواری تەندروستی دا دەبێتە هۆی زەرەرگەیاندن بەگوێچکە ولاوازی بیستن٠(ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی)ش مەترسی شەپۆڵەکانی ئەم ئامێرە وەك مەترسیدار ترین شەپۆڵ بۆمرۆڤ دیاری دەکات ، کەدەبێتەهۆی نەخۆشی شێرپەنجە٠هەروەهاکێشەی مۆبا یل لەمندالآن دا ، ئەومندالآنەی لەخوارتەمەنی (١٨)هەژدەساڵین ومۆبایل بەکاردەینن ڕووبەڕ ووی کێشەی هەڵسووکەوتی کۆمەڵایەتی دەبنەوە٠

(ك)دەڵێ : مۆبایل دەبێتەهۆی نانەوەی کێشەی خێزانی بەتایبەتی ئافرەت کەخووی بەوئامێرەگرتووە شەووڕۆژلێی دوورناکەوێتەوە بۆیەهیچ ئاگای لەماڵ ومنداڵی نەماوە بۆیەپێویستەلەوئامێرەلەعنەتییەدوورکەوێتەوەوچاوی لەخێزانەکەی بێت٠(ف) دەڵێ : خراپ بەکارهێنانی ئینتەرنێت ، هۆکارەکەی نزمی ئاستی هۆشیاری وبێکارییە٠(ش) دەڵێ : زیانەکانی مۆبایل بریتین لە : زۆربەکارهێنانی کاریگەری لەسەرئابووری خێزان دەبێت ، کوشتنی کات لەلایەن قوتابیان ودوورکەوتنەوەیان لەوانەکانیان٠سوودەکانیشی بریتین لە : کات وبەرواروەدەمژمێریش لەمۆبایل نیشان دەدرێت ، لەجیاتی ڕادیۆش بەکاردێ ، وەك زەنگی بەئاگاهێنانەوە لەجیاتی دەمژمێریش بەکاردێ٠(د) دەڵێ : دەوڵەتەگەورەکان

هەمیشەسەرکەوتنیان لەئەنجامی پێشکەوتنیان بووە لەبواری زانست وتەکنەلۆژیا ، لەبواری جەنگدا ئەولەشکرە سەردەکەوێ وجەنگەکەدەباتەوە کەچەك وتەقەمەنی وتەکنەلۆژیای باشتری هەبێت.(س) لەبارەی یاری زۆرانبازی ئازاد (مصارعەحرە) کەلەتەلەفزیۆنەکان نیشان دەدرێ ، دەڵێ : ئاسەواری جەنگی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدی هێشتالەهەندێك شوێنی دنیاماوە لەیۆنانی کۆن دا گۆڕەپانی تایبەت هەبوو بۆئەومەبەستە خەڵك وەك بۆبینینی یاری نێوان دووتیپی تۆپی پێ ئاپۆڕەیان دەبەست وچەپڵەیان بۆدواگیانبازدەکووتا ، ئەمرۆبەهەمان شێوازپیادە دەکرێ. (پ) سەبارەت بەدانانی ئاوازلەسەرزەنگی مۆبایل دەڵێ : من ئاوازێکی زۆرهێمنم داناوە زیاتردەنگی باڵندەوهاژەی ئاودادەنێم ، چونکە نابێتە هۆی بێزارکردنی خۆم ودەوروبەرەکەم. هەروەهادانانی گۆرانی بەلای منەوە عەیبە بۆیە زەنگێکی ئاسایی لای من خۆشترە لەگۆرانی. هەندێ لەتوێژینەوەکان وای دەردەخەن ، کەئاوازی مۆبایل ڕەنگدانەوەی ژیانی کەسەکەیە لە ورێگایەوە دەتوانیت کەسایەتی وئارەزووەکانی بزانیت بەبێ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆپر سیاری لێ بکەیت.(ك) دەڵێ : دەتوانین سیمکارت بەئۆتۆمبیل بچوێنین ، ئۆتۆمبیل ئەگەربێ ڕ ەقەم بێت یان ئەگەرساڵانە (سەنەوی)وئەوانەی نەبێت هەمووشتێکی پێ دەکرێت سیمکارتیش لەوەزۆرخراپترە.(ش) دەڵێ : چیرۆکی زۆربەهۆی مۆبایل وسیمکارتی بێ بەڵگە کەبۆکاری خراپ بەکاردەهێنرێت خاوەنەکەی نادۆزرێتەوە کچ کوژراوە ، خەڵك کوژراوە ، خێزان تێکچووە،دەبێت حکومەت هەڵبستێت بەقەدەغەکردنی ئەوسیمکارتانەی کەبێ بەڵگەن،چونکە بەهۆی ئەوسیمکا رتانەوە شەڕوئاژاوە لەنێوخێزان دا دروستبووە ، تەلاق ولەیەکجیابوونەوە دروستبووە.(ش) دە ڵێ : مۆبایل هۆکاری لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە ، من جاران لەگەڵ هاوڕێ ودۆ ستانم دەچووینە سەیران وگەڕان وپارك زووزوو یەکترمان دەبینی ، بەڵام ئێستاوام لێهاتووە تە نیابەمۆبایل یاخودبەنامە ئەحوالی یەکتردەپرسین تەنانەت لەبۆنەوجەژنەکانیش دا.(ك) دەڵێ : هەندێك لەخەڵکی ئێمە لەبەرکەمی ئاستی هۆشیاری ئاینی دەنگی قورئانی پیرۆز لەسەرمۆبا یلەکەیان دادەنێن ئەمەش شتێکی باش نییە ، لەبەرئەوەی ئەگەرتۆ لە(توالیت) بووی ، کەواتە باشتروایە دەنگێکی ترلەسەرمۆبایل دابنێین بۆئەوەی گونجاوبێت بۆهەمووشوێنێك.(ك) دەڵێ : سەرەتاهەموومرۆڤێك پیاوبێت یان ئافرەت پێویستی بەوەیەکاتەکانی بەشتێك بەسەرببات ئا فرەت ئەوکاتانەی کەبێکارە دەتوانێت خۆی بەچەند شتێك خەریك بکات وەك : گوێگرتن لەڕا دیۆ یاخود خوێندنەوەی پەرتووك ، بەڵام بەداخەوە زۆربەی ئافرەتەکانمان کاتی خۆیان بەشتی بێسوود بەسەردەبەن وەك : سەیرکردنی زنجیرەدراماکان ومۆبایل وفەیسبوك وباسکردنی یەکتر ی وکاری بێسوود.(ك) دەڵێ : تەلەفۆن شتێکی گرینگە ، لێرەدا بەتایبەتی هەرزەکاران دەبێ دا یك وباوك ئاگاداری ڕەفتاری ڕۆڵەکانیان بن ، چونکە تەلەفۆن لەم حالەتەدا دەبێتە کارەسات بۆ

خێزانەکە ، چونکەمندالْ هەرهەڵسوکەوتێکی نەشیاوبکات یەخەی دایك وباوکی دەگرن٠(س) دە لێ : زۆرینەی ئامێرە تەکنەلۆژییەکان دووسەرەن دەتوانرێ هەم بە باش و هەم بە خراپ بەکار بهێنرێ بۆنموونە ئۆتۆمبیل یەکێکەلەوئامرازانەی ، کەبۆکەم کردنەوەی ڕێگادوورەکان وکەم کر دنەوەی ماندووبوون دروستکراوە ، بەلأم کاتێ شوفێرپابەند نابێ بەیاساکانی هاتووچۆ کارەسات ڕوودەدات وکێشەی زۆردروست دەبێت ولەئەنجام دا خەڵك تووشی زەرەری گیانی ومالْی ودەروو نی دەبێت٠مۆبایلیش یەکێکە لەوئامێرانەی ، کەلەبنەڕەت دا بۆمەبەستی خزمەت گەیاندن در وستکراوە ، بەلأم ئەگەربۆئەومەبەستەبەکارنەهێنرێ کەبۆی دروستکراوە بێگومان لەجیاتی سوودگەیاندن زیانی دەبێت٠بەداخەوە لەکۆمەلگەی ئێمە ئەم ئامێرە ئەوەندە بەشێوەیەکی خر اپ بەکاردەهێنرێ ئەوەندە بەباشی بەکارناهێنرێ ئەمە نیشانەی ئەوەیە کەنەك هەرتوانای ئە وەمان نییە داهێنان بکەین ، بەڵکو توانای ئەوەشمان نییە ، کەئامێرەکان بەشێوەیەکی ڕاست و دروست بەکاربهێنین٠(گ) دەلێ : جاران ئەگەریەکێ بەمیوانی بچووبامالێك بەبێ ئاگادارکردنە وەدەچوو ، بەلأم ئێستابەهۆی داهاتنی مۆبایلەوە خاوەن مالْەکەئاگاداردەکەنەوە٠

لەبارەی وەسواسی :

ئەگەرسەرنج بدەینەهەڵسوکەوتی هەندێك کەس لەهەرکارێکی کەڕۆژانەئەنجامی دەدات دڵنیانابێت کەئەوکارەی بەتەواوی ئەنجام داوە بۆیەدووبارەوسێ بارەی دەکاتەوە بۆنموونەدەستی دەشوات دڵنیانییەکەدەستی بەتەواوی پاك بۆتەوە بۆیەدووبارەوسێ بارەوچواربارەدەستی دەشواتەوە٠(چ ز) دەلێ : لەجل وبەرگ کڕیندازۆروەسواسم ، لەکڕینی جل وبەرگ زۆرم پێدەچێ ، ئینجادەیکڕم٠(چ) دەلێ : ئەوحالەتەوەسواسییەی کەمنی گرتۆتەوە ئەوەیەکەزۆرتەماشای ئاوێنەدەکەم سەیری ڕوخسارم دەکەم کەئایاجوان بووە؟

لەبارەی سەری سالْ :

هەمووسالێك کاتێك سەری سالێکی نوێ دەست پێدەکات ، کەسالْی میلادی دەستپێکی لەدا یکبوونی حەزرەتی مەسیح(سەلامی خوای لێ بێ)نەصرانییەکان حەوت ڕۆژی دەخەنەسەری وسەری سالْ حیساب دەکەن٠هەرچەندەئەم مێژووەلەلایەن مێژوونوسەکان مشتومرِی لەسەرە،بەلأم ڕێوڕەسمەکەبایەخێکی تایبەتی پێدەدرێ لەلایەن موسوڵمانەکانیشەوە بەئاهەنگگێڕان پێشوازی لێ دەکرێ بێگومان کاتێك مرۆڤێك لەدایك دەبێت هەمووخێزان

**ودەوروبەرەکەی پێیان خۆشە ئیترئایامرۆڤەکەکەسێکی سادەبێت یان نێردراوێك بێت٠وەهەمووئاینەکان دەبێ ڕێزیان بۆیەکترهەبێ٠بەلاَم سەری ساڵی میلادی کەکوردوەکوموسوڵمان بایەخ بەوبۆنەیەدەدات ، نەصرانیش بایەخ بەبۆنەی سەری ساڵی کۆچی دەدەن کەساڵی نوێی مێژووی ئیسلامە ؟لەکۆتاییەکانی سەدەی بیست ئەودیاردەیەلەکوردستان پەرەی سەند ، جاران ئەوچینەی پێیان دەوترا(ئەفەندی) ئەویادەیان دەکردەوە ئەوانەش چینێك بوون بەداب ونەریتی ڕۆژئاوایی کاریگەربوون٠جاران مێژووکۆچی بوولەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی لەبەرامبەری کۆچی میلادیش نوسرالەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانان٠دیارەلای موسوڵمانان هیچ جیاوازییەك نییەلەنێوان پێخەمبەرەکاندا (علیهم السلام) وەئیمان وباوەڕیان بەهەموویان هەیە ، لەدایکبوونی هەرپێخەمبەرێك سەرکەوتن وژیانەوەیەبۆکۆمەڵگە ، بەلاَم نەك بەئاهەنگ گێڕان ، نەك گوناه وتاوانی تێدابکرێ وتێکەڵبونی کوڕان وکچان وعارەقی تێدا بخورێتەوە ، هەموموسوڵمانێکیش لەدایکبوونی هەمووپێخەمبەران بەرزدەنرخێنن ، بەلاَم نابێ بەهی خۆیانی بزانن ، هەروەهائایاساڵی کۆچی کوائەوەندەباسی هەیە ؟ لەبارەی هەڵوێستی موسوڵمانان لەبۆنەکاندا (د ع م) دەڵێ : بۆنەکۆمەلاَیەتییەکان وکەسییەکان ، کەپەیوەندییان بەبۆنەئاینییەکانەوەنییە ، وەك : ژنهێنان وشوکردن ومنداڵبوون وگەڕانەوەلەسەفەروچاکبوونەوەلەنەخۆشی ، موسوڵمان وەك ئەرکێکی کۆمەلاَیەتی ودراوسێیەتی وخزمایەتی دروستە پیرۆزباییان لێ بکات ، چونکەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دیاری لەگاوروجولەکەی سەردەمی خۆی وەرگرتووە ، چۆتەماڵیان وخواردنیانی خواردووە ، دەعوەتەژەهراوییەکەی ئافرەتەجولەکەکەبۆپەیامبەر(درودی خوای لەسەربێ)بەلگەی ئەم چەمکەیە٠هەروەهادەقی ئایەتی ژمارە پێنجی سوڕەتی مائیدە باس لەوەدەکات ، کەموسوڵمان دەتوانێت خواردنی جولەکەوگاوربخوات وئافرەتی پاکداوێنیان بخوازێت :** (الیوم أحل لکم الطیبت وطعام الذین أوتواالکتب حل لکم وطعامکم حل لهم والمحصنت من الذین أوتواالکتب من قبلکم )**بەپێی ئەم دەقە گاوروجولەکەدەکرێ ببنەخەسووخەزوری پیاوی موسوڵمان ، ببنەدایەگەورەوبابەگەورەوخاڵی منداڵەکان ، واتادروستەخزمایەتییان لەگەڵدابکەین٠**

**تێبینییەکی گرینگ :-**

**میلادی نەك زاینی ، چونکە لەزمانی کوردیدا (زان) بۆگیانلەبەرانی غەیری مرۆڤ بەکاردێ ، بۆنموونە : دەوترێ : (فلاَنەمەڕزایە) ، بەلاَم لەکوردیدا وشەی (زان) قەت بۆئافرەت بەکارنایەت**

، هەرکەسێکیش پێی بڵێن زای ، توڕەدەبێ ، کەواتەوشەی زان لەوشەی زاینی لەزمانی کوردیداوەك سوکایەتی سەیردەکرێت ، بۆیەپێویستەساڵی زاینی ناوبنرێت ساڵی لەدایکبوون.

**لەبارەی دابەزینی ئاستی خوێندن :**

خوێندن وفێربوون گرینگترین بابەتەبۆداهاتووی هەرکەسێك.چوونەبەرخوێندن لەتەمەنی شەش ساڵی دەست پێدەکات وخێزانەکان منداڵەکانیان دەبەنەبەرخوێندن.پێویستەدایك وباوك زۆرهەوڵ لەگەڵ منداڵەکانیان بدەن تاوەکوقوتابخانەیان لەلاشیرین وخۆشەویست بێت ، هەروەهاپێویستەسوودەکانی قوتابخانەیان بۆڕوون بکەنەوە ، دوای ئەوە کەدەوامی قوتابخانە دەست پێدەکات پێویستەمنداڵەکانیان شەوان زووبخەوێنن ، چونکە وابووە قوتابی لەپۆل خەوی لێکەوتووە.هەروەهاپێویستە ئامۆژگارییان بکەن ڕێزلەمامۆستاکانیان بگرن وئەرك و واجباتیان جێبەجێ بکەن.

پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((أطلب العلم ولوكان فى الصين)) واتا : ((عیلم لە "چین" یش بێت بچۆبۆئەوێ)) ، هەروەها فەرموویەتی : ((أطلب العلم من المهد الى اللعد )) واتا : ((داوای عیلم وزانین بکە هەرلەلانکەوە تادەچنە ناوگڵ)) مەبەست ئەوەیە کە هەرزوو دەست بەخوێندن بکەن ، چونکە خوێندن هیندە کارێکی بەسوودە ، ئەگینا خۆمندالأن لەناولانك ناتوانن بخوێنن.

(س) دەڵێ : دابەزینی ئاستی خوێندن دەگەڕێتەوەبۆئەوەی کەگەنجان دوای مۆدیلی ڕۆژئاواکەوتوون.ئاماژەبەوەش دەکات کەگەنجی ئێستامەبەستییان فێربوونی زانست نییە،بەڵکوتەنیابۆبەدەستهێنانی بڕوانامەیە.(ئا) دابەزینی ئاستی خوێندن بۆچەندخاڵێك دەگەڕێنێتەوە ، لەوانە : نزمی ئاستی زۆربەی مامۆستاکان کەتەنیامەبەستییان بەڕێکردنی کات وگەیشتن بەسەری مانگ و وەرگرتنی مووچەکەیانە،هەروەهاسەرقالبوونی قوتابی بەشتی لاوەکی ، هەروەهائەووانانەی لەزانکۆوپەیمانگاکان دەخوێندرێن زۆربەیان تیۆرین نەك پڕاکتیکی.(ش) پێیوایەلەبەرنەبوونی دامەزراندن قوتابی بێ هیوابووە لەبەرئەوەگرینگی نادات بەخوێندن ، هەروەهاپێشترئەوقوتابییەبەئارەزووی خۆی ئەوبەشەی دیارینەکردووە کاتێك لەزانکۆیان پەیمانگاش دەردەچێت ناتوانێت ببێتەکەسێکی سەرکەوتوو.(ز س)دەڵێ:کۆمەڵێك هۆکاروایکردووە ئاستی زانست بەرەودابەزین بچێت لەوانە : لێنەپرسینەوەی دایك وباوك لەمنداڵەکانیان،گرینگی پێنەدانی مامۆستابەقوتابی لەبەرزۆری ژمارەیان یان کەمی کات ، هەروەهانەبوونی سزابۆقوتابی.

**وازهێنانی قوتابی لەخوێندن :**

**(گ ئە) دەڵێ : دابڕانی من لەخوێندن کەمدەرامەتی خێزانەکەم بوو ، لەگەڵ ئەوەشدا قوتابخانەکەم زۆردووربوو نەمدەتوانی سەیارەبگرم بۆهاتووچۆم٠(گ ج) دەڵێ : زرووف وایلێکردم بەناچاری وازلەخوێندن بێنم ، چونکە ژیان ئێمەبەڕێوەدەبات نەك ئێمەژیان بەڕێوەببەین خۆئەگەرهەمووگەڕەکێك قوتابخانەیەکی ئێوارانی تێدابێ ، ئەواقوتابیان پێویستیان بەکرێی هاتوچۆی ئۆتۆمبیل نابێ ، ڕەنگەهەندێکیان بتوانن لەپاڵ ئیشکردن دەوامی قەتابخانەش بکەن٠**

**جانتاومێزی قوتابی :**

**زۆرجارمندالآن لەنێوان سێ یەك بۆنیوەی کێشیان کتێب ودەفتەرلەناوجانتای قوتابخانەداهەڵدەگرن ئەمەش مەترسی دەبێت لەسەرجەستەیان ، چونکەمنداڵ جەستەی لاوازەئەم کێشەقورسەمەترسی لەسەربڕبڕەی پشت دروست دەکات٠پزیشکان پێیانوایەهەڵگرتنی جانتای پڕلەکتێبی قورس زەرەربەتەندروستی دەگەیەنێ ، چونکەدوچاری ئازاری مل وهەردووشان وچەمانەوەی بڕبڕەی پشت دەبن٠هەروەهامێزوکورسی قوتابخانەکان لەگەڵ ستانداردی جیهانی ناگونجێ وتەندروست نییە ، هەروەهاهیچ گوێ بەتەمەن وجەستەی قوتابی بۆدانیشتن لەسەرکورسی ومێزی قوتابخانەکان نەدراوە٠سەیردەکەین قوتابی پۆلی یەکەم وشەشەمی بنەڕەتی لەگەڵ ئامادەیی هەرلەسەریەك مێزوکورسی دادەنیشن لەکاتێکدا بالأوقەدی قوتابی پۆلەکانی ئامادەیی زۆربەرزترە لەیەکەم وشەشەمی بنەڕەتی ، تەندروست نەبوونی مێزوکورسی قوتابی دەبێتەهۆی ئەوەی قوتابیان تووشی پشت ئێشان وماسولکە ئێشان ببنەوە ، چونکە قەتابی ڕۆژانە چوارتاپێنج سەعات لەقوتابخانە لەسەرئەومێزوکورسییانە دادەنیشێ ئەمەش کاریگەری زۆرخراپی لەسەرفەقەرات وبڕبڕەی پشت دەبێ٠**

**بۆچی دەخوێنی ؟**

**خوێندن یەکێکە لەبنەما هەرەبنچینەییەکانی ژیان ، کەڕۆڵێکی سەرەکی لەبەرەوپێشچوونی کۆ مەڵگادەگێڕێ٠**

**(ب) دەڵێ : وەك قوتابییەك هەست بەخۆشی وئاسوودەیی دەکەم ، هیوادارم هەمووکەسێك هەو لێ بۆبدات وخوێندن تەواوبکات٠**

(ھ) دەڵێ : تەنھابۆبەدەستھێنانی بڕوانامەیەکی بەرز ، چونکە بڕوانامە ٥٠٪ ی کەسایەتی مرۆڤ پێکدەھێنێ٠(ن) دەڵێ : بۆئەوەی لەبازنەی چواردیواری ماڵ ڕزگارم بێ ، چونکە خوێندن تاکە ھۆکارە ، کەئافرەت لەڕێگایەوە بێتەناوکۆمەڵگا٠
(م) دەڵێ : تاوەکوپاداشتی دایك وباوکم بدەمەوە بەرامبەربەوخزمەتەی بەمنیان کردووە٠(ع) دەڵێ : تالەداھاتوودا ژیانی خۆمی پێ دابین بکەم٠
(چ) دەڵێ : بۆئەوەی لەپیاسەی سەرشەقامەکان ڕزگارم بێ٠ (ج) دەڵێ : بۆسەربەرزی خۆم و خێزانەکەم٠

لەبارەی پشووی ھاوین :

وەرزەکانی ساڵ چوارن ،لەسێ وەرزداقوتابیان لەبەرخوێندنن کەپشووی ھاوینیش دێت قوتابیان نازانن چی بکەن وکاتی خۆیان بەچی خەریك بکەن ؟ (ك)دەڵێ : ھەرکەکۆتایی قوتابخانەبووپێویستەقوتابی بچێتەخولی زمانی ئینگلیزی کەسوودێکی یەکجارزۆری بۆقوتابی دەبێت٠(ھ)دەڵێ :من لەپشووی ھاوینداکاتی خۆم بۆخوێندنەوەتەرخان دەکەم بەتایبەتی ئەوکتێب وگۆڤارانەی ئاستم بەرزدەکەن وزانیاریم زیاددەکەن ، زۆرجاریش لەماڵەوەگوێ بۆبەرنامەکانی ڕادیۆدەگرم بەھەرحال کاتی خۆم بەفیڕۆنادەم٠(ڕ)دەڵێ : دیارەھاوینان خوولی قورئانی پیرۆزوزانستەشەرعییەکان زۆردەبن وەکوھەلێکی زێڕین ھەروەھاخولی مەلەوانی ئەوخوولانەچاکن٠(ئا ئە) دەڵێ : من لەگەڵ باوکم دەچم بۆکار ، ئەومیوەوتەڕەدەفرۆشێت بەیانیان زوولەگەڵیاھەڵدەستم ئەوکۆلان وئەوکۆلان دەکەین وشت دەفرۆشین ئێوارانیش دێمەوەلەگەڵ برادەرەکانم دەچم بۆتۆپێن ، چونکەزۆرحەزم لێیە٠(پ) دەڵێ : من دەچمەلای خزمێکمان دوکانی ھەیە ، ھەندێ شت فێربووم ئەوپارەی دەستم دەکەوێت بۆخۆم دەیدەم بەجل وبەرگ٠(ك) دەڵێ : پشووی ھاوین دەرفەتێکی گونجاوە بۆھەمووکارێك بۆسەردان لەسەرو وی ھەمووشیانەوە گرینگی بدات بەخوێندنەوەوپەرتووکی جۆراوجۆر٠ (ب) دەڵێ : بەبۆچوونی من خولی ھاوینە لای ھیندێك کوڕان بۆمەبەستی دڵداری یە٠

دەرسی تایبەت :

دیاردەی دەرسی تایبەتی ڕێژەی لەزۆربووندایە بەتایبەتی ئەودەرسانەی کە زەحمەتن بۆئەمەش ئەوانەی کەباری داراییان باشە مامۆستای ناواردەکەنە مامۆستای تایبەتی خۆیان تاوەکوباشترین نمرە بەدەست بێنن ، بەڵام قوتابییە ھەژاروکەم دەرامەتەکان تەنیاپشت

بەخۆیان دەبەستن ، ناتوانن مامۆستای تایبەت بگرن بۆئەوەی نمرەکانیان بگاتەسەرووی توانای خۆیان٠(ب ع) دەڵێ : من بۆیە پەنام بۆوانەی تایبەتی بردووە لەبەرچەندهۆیەکە ، لەوانە : لەپۆلێك (٤٠ — ٥٠) قوتابی تێدایە ڕەنگە ئەوتێگەیشتنە نەبێت ، کەقوتابی بەتەنیالەگەڵ مامۆستا دابنیشێت ، هەروەهاهەراوهۆریای قوتابیان یان دوورونزیکی تەختەڕەشەکە یان سەرماوگەرما ئەم هەمووهۆیانەوادەکەن ، کەقوتابی وانەی تایبەتی پێ باشتربێ ، هەروەها دەڵێ : من دەتوانم بڵێم کەمامۆستا جیاوازی نەکردووە لەوەی کەلەپۆل دەیڵێتەوە لەوەی کەبەتەنیادەیڵێتەوە ، ئەگەرمامۆستاش هەبێ کەجیاوازی بکات بەڕای من دەگمەنە ، بەڵام قوتابی بەتەنیا سوودی زیاتروەردەگرێت لەوەی (٤٠ — ٥٠) قوتابی پێکەوەبن٠(ئا) دەڵێ : بێگومان ئەوقوتابیانەی کەوانەی تایبەتی دەخوێنن قازانجی زۆردەکەن ئەگەرچی هەندێ قوتابی هەیە کەوانەی تایبەتیش دەخوێنێت بەڵام هەرنمرەش ناهێنێت لێرەدا خەلەلەکە لەمامۆستاکە نییە ، بەڵکوقوتابییەکەبناغەیەکی ئەوتۆی نییە٠(ع) دەڵێ : مامۆستالەپۆل ئەوماوەیەی نییە یەك یەك قوتابییەکان تاقی بکاتەوە لەماوەی (٤٠) دەقیقە جابۆیە قوتابی زیرەك هەیە ، قوتابی تەمبەڵیش هەیە هەردووجۆرەکەش پەنابۆدەرسی تایبەتی دەبەن مامۆ ستاش ئەوپەڕی دەتوانێ (١٠ — ١٥) نمرە ئاستی قوتابییەکەبەرزکاتەوە٠(ع ع) دەڵێ : سەبارەت بەوباتەدووشت دەگرێتەوە : یەکەمیان لایەنی قوتابییە ، دووەمیان لایەنی مامۆستایە٠لەبارەی لایەنی قوتابی کەدەڵێن ئێمەحالی نابین ئەوەپەیوەندی بەساڵانی پێشترهەیە کەوەکوزنجیروایە هەرلەسەرەتاییەوەدەست پێدەکات جائەگەربێت ولەسەرەتایی دا بەباشی فێرنەبووبێت ناتوانێ بەئاسانی لەقۆناغەکانی کۆتایی سەرکەوێ ، چونکە مامۆستالەقۆناغی پێنج وشەشی ئامادەیی ناتوانێت ئەوشتانەی فێربکات کەلەپێنج وشەشی سەرەتایی خوێندویەتی واتا ئەوقوتابییەئامادەنەکراوە٠سەبارەت بەلایەنی مامۆستاش ، مامۆستا وەکولایەنی ویژدان نابێت جیاوازی بکات لەوانەوتنەوەی تایبەت لەگەڵ هی قوتابخانە٠

### گۆڕینی پرۆگرامەکانی خوێندن :

(ئە) دەڵێ : بەڕای من پرۆگرامێکە تەنیاقوتابی ماندوودەکات ، بڕواناکەم لەژیانی ڕۆژانەمان دا هیچ سودێکی ئەوتۆی لێ وەربگرین ، پرۆگرامی کۆن خۆشتربوو ، بەڵام نوێیەکە مامۆستاکانیش شارەزاییەکی ئەوتۆیان لێ نییە٠هەروەهالەڕووی مامۆستاشەوە پێویستەساڵێك پێش ئەوەی

قوتابی کتێبی نوێ بخوێنێت ئەوماموٚستایەچەندین خولی لەسەرچۆنیەتی وانەوتنەوە دیتبێ٠(ھ) دەڵێ : پرۆگرامەکان پرۆگرامێکی وانین کەسوودێکی زۆربەقوتابی بگەیەنێت ، کەتەنیاماندووکردنەوھیچی ترنا٠ھەروەھا ئەگەرکتێبەکان نەگۆڕابان زۆرباشتربوو ، چونکەماموٚستاکان شارەزاییێکی باشیان لە پرۆگرامی پێشترپەیداکردبوو ، بەلاّم لەگەڵ پرۆگرام گۆڕین ماموٚستاکەش خەریکەبڵێم وەکوقوتابی لێ دێت کەھەرساڵەوپرۆگرامێك کاریگەری خراپی دەبێت لەسەرقوتابی،چونکەقوتابی دەگاتە ئەوئاستەی لەپرۆگرامەکە بێزاربێت٠(ك) دە لێ : قوتابی لەقۆناغی بنەڕەتییەوە زمانی ئینگلیزی وعەرەبی دەخوێنێ ، کەچی تاوەکو زانکۆ ش تەواودەکات فێری ئەودووزمانە نابێت ، بە(دەورە)چۆن فێردەبێت ؟

لەبارەی پرسە :

پرسەوسەرەخۆشیکردن یەکێکەلەوداب ونەریتەباشانەی خەڵکی ئێمەپابەندن پێوە ، وەکوئاینیش ڕێگەی پێدراوە ، بەلاّم بەوشێوەیەناکەئێستاکۆمەڵگەپەیڕەوی لێ دەکات ، ھەروەھابەپێویستییەکی کۆمەلاّیەتی گرینگ دادەنرێت بۆمانەوەی پەیوەندییەکۆمەلاّیەتییەکان ھەتاڕاددەیەکی زۆریش غەم وپەژارەلەسەردەروونی مرۆڤەکان کەمدەکاتەوە ، بەلاّم ھەندێك شت ھاتۆتەئاراوە وەکوڕەشماڵ ھەڵدان لەنێوکۆلاّن کەدەبێتەھۆی ڕێگاگرتن٠

لەبارەی سوێندخواردن :

مەسەلەی سوێندخواردن لەنێوکۆمەڵگەدازۆرباوە ، ھەرکەسەولەبەرشتێك ولەسەرشتێك وبەشتێك سوێند دەخوات ، ئاینی ئیسلامیش زۆرگرینگی بەمەسەلەی سوێندخواردن داوە، ئەگەرسەیری قورئانی پیرۆزبکەین خوای تەعالابەچەندان شێوەوبەچەندان شت سوێندی خواردووە ، وەك خوای گەورەسوێندبەھەندێ لەماددەودروستکراوەکانی خۆی سوێند دەخوات ، وەك ئەرزوئاسمان ومانگ وڕۆژو٠٠٠ھتد٠بەلاّم ھەرگیزدروست نییەئێمەسویندبەوشتانە بخۆین ، وەك دەفەرموێ : (والسماء والطارق) (والتين والزيتون) (والارض وماطحاها) (والسماء ومابناها) (والقمراذاتلاها) (والطور) ٠٠٠ھتد٠لەئاینی ئیسلامدادروست نییەسوێندبەھیچ کەس وبەھیچ شتێ بخورێ ، جگەلەخوای گەورە ، بۆیەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) سوێندی تەنیابەوەدەخوارد زۆرجاردەیفەرموو : (والذی نفسی بیدیه) واتا : (سوێندبەوکەسەی گیانی منی بەدەستە) کەخوای تاك وتەنیایە٠بۆیەسوێندخواردن بەغەیری خوا(جل جلاله)

**گوناه وتاوانە٠وەئەگەرکەسێ سوێندی بەخوای تەعالاخوارد لەسەرشتێك وەئەوەشی کرد دەبێ کەفارەت بدات ، کەنانی (١٠)دە هەژار یان دەبێ (١٠) دە کەس بەرگ بکا وپارچەجلێکیان بداتێ یان دەبێ کوەیلەیەك ئازادبکات٠ئەگەرکەسێك سوێندی کەوتەسەر ، ئەگەردانی بەتاوانەکەومافەکەدانا تەواو،دەنادەبێ سوێند بخوات ، وەك (درودی خوای لەسەربێ)دەفەرموێ :** (البينة على المدعي واليمين على من أنكر) **واتا : (شاهێدی هێنان لەسەرداواکارە ، سوێند خواردنیش لەسەرداوالێکراوە)٠لەبارەی سوێندخواردن بەتەلاق (ش) دەڵێ : سوێندخواردن بەتە لاق کارێکی ناپەسندە٠ئاماژەبەوەدەکات پیاوان کاتێك سوێندبەتەلاق دەخۆن ، کەبیانەوێت قسە ی ئەوان بەسەربکەوێت٠(ئا)دەڵێت : هەندێ جارفرۆشیاربۆڕەواجدان بەکەل وپەل وشت ومەکە کانی سوێندبەتەلاق دەخوات ، تابەووشەیەیەخەڵك باوەڕی پێ بکەن٠(ع) دەڵێ : سوێندخواردن تەنیابەخوا(جل جلالە) جائیزە٠(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی:**(من كان حالفا فليحلف بالله أوليصمت) **واتا : (ئەوکەسەی دەیەوێ سوێند بخوات بابەزاتی خواسوێند بخوات یان بێدە نگ بێت)٠هەروەهافەرموویەتی :** (لاتحلفوابابائكم ولابامهاتكم والانداد ولاتحلفواباالله الاوأنتم صادقون) **واتا : (نابێت سوێند بەباوك ودایك ونەژاد بخورێت وەئەگەرسوێندتان بەخواش خوارد دەبێ ڕاستگۆبن)٠**

**لەبارەی جل وبەرگ :**

**پۆشینی جل وبەرگ یەکێکەلەسیماجوانەکانی مرۆڤ٠جل وبەرگ ئەوقوماشە دوراوەیە کە بەکار ی دەینین بۆداپۆشینی جەستەوخۆپاراستن لەسەرماوسۆڵی زستان وداپۆشینی عەیب وعار٠ جل وبەرگ دیاردەیەکی شارستانییە زۆرشت کاری تێدەکات ، وەکوداب ونەریت وئاین وکات وشوێن و کەش وهەوا٠هەرشێوەجل وبەرگێك کەباوە پاش ماوەیەك باوی نامینێت وجاری واش هەیە کۆ نەمۆدەیەك دەبێتەوەباو٠**

**لەگەڵ پەیدابوونی مرۆڤ وهاتنی بۆسەرزەوی جل وبەرگیش وەکوپێداویستییەك لەبەرداپۆشینی عەورەت وساردی وگەرمی هاتۆتەکایەوە٠جل وبەرگ دیاردەیەکی شارستانییە کارێکی گرینگیشی هەیەلەڕێکوپێکی وڕازاندنەوەی شێوەی مرۆڤ٠هەرنەتەوەیەك لەنەتەوەکانی سەرئەم دنیایە خاوەن جل وبەرگی تایبەتی خۆیەتی ، کەنەتەوەکان لەیەکتری جیادەکاتەوە ، جۆری جل وبەرگیش هەیەبوونەتەجل وبەرگی جیهانی٠(م ش) دەڵێ : جل وبەرگ گرینگییەکەی لەوەدایەمیللەتان لەیەکترجودادەکاتەوە٠(ك) دەڵێ : ئافرەت بەهۆی جل وبەرگییەوەجیاوازی لەگەڵ پیاودا دەنوێنێ ، بەڵام ئێستائافرەت جل وبەرگی پیاوان دەپۆشێ ، پیاویش جل وبەرگی ئافرەت٠هەندێك جارئێمە ناتوانین لەیەکتری جیایان بکەینەوە ، هەندێ**

جارگومانمان لاپەیدادەبێت ئایا ئەم کابرایە پیاوە یان ئافرەت؟! تاوانیش دەکەوێتەسەرجل دروستکەرەکانیش کە ئەم رێگایەیان لەدروستکردنی جل وبەرگ گرتۆتەبەر٠لەبەرکردنی پانتۆ لَی پیاوان کەزۆرێك لەکچان لەبەری دەکەن ئەوەش چاولێکردنی پیاوانە ، ئێمەدەبێ ئەوەبزانین ، کەهەندێ شت تایبەتەبەئافرەتان وهەندێ شتیش هەیە تایبەتە بەپیاوان بۆیە هەروەك چۆن ناکرێت پیاوجلی ژنان لەبەربکات بۆئافرەتیش جوان نییە جلی پیاوان بپۆشێ ، هەروەها پیاوا نیش تووشی ئەم پەتایەهاتوون ، کەلاسایی ئافرەتان دەکەنەوە لەبەکارهێنانی مکیاژدا وداهێنا نی شێوەی قژ (تەسریحە) ، چونکەلە سیماکانی جیاکردنەوەی ژن و پیاو شێوەی جل وبەرگە٠ (م) دەڵێ : جل وبەرگ هی پیاووژن گوایە مۆدیلە گۆڕانکاری زۆری بەسەرداهاتووە چ هی پیاو چ هی ژن٠شەرواڵ واتەسك کراوەتەوە دەڵێی پانتۆڕە ، کراسی ژنان قۆڵ وهەنگوچکی لەدەست داوە هەرچەندی بڵێی تەسك کراوەتەوە ، هەمووجل وبەرگەکان تەسك وتریسك کراونەتەوە٠ (پ) دەڵێ : ململانێ لە سەرجل و بەرگ و گۆڕینی مۆدیل گرفت دروست دەکات ، چونکە هەر خێزانێك بەگوێرەی داهاتی خۆی بیرلەکڕینی پێداویستییەکانی خۆی دەکاتەوە٠ئایاپۆشینی جل وبەرگەمۆدەکان کێشەوگیروگرفت دروست دەکات ؟ (ت) دەڵێ : ڕۆژانە بەهۆی پۆشینی جلەکانم تووشی چەندان توانجی ناشیرین دەبمەوە٠(گ) دەڵێ : بەڕاددەیەکی زۆرکێشەم بۆدروست دەکات لەکاتی پۆشینی ئەم جلانە دەکەویتەبەرتوانج وپەلاری کوڕەلاوەکان٠(ت) دەڵێ : پۆشینی ئەم جلانە کێشەوگیروگرفتی زۆریان بۆدروست کردووم٠لەقوتابخانەکان چەندین کێشەڕوویان داوە بەتایبەتی ئەوقوتابیانەی لەتەمەنی هەرزەکاری دان بەهۆی لەبەرکردنی جل وبەرگی تەسك لە لایەن مامۆستای ئافرەت٠قوتابییەك دەڵێت : مامۆستایەکمان هەیە جل وبەرگی وەهالەبەردەکا ت لەشی هەموودیارە کاتێك بەرامبەرمان دادەنیشێت کەس ئاگای لەوانەکەی نامینێت٠

دیاری :

دیاری واتا بەخشینی شتێك بۆبەرامبەرەکەت مەرج نییە دیاری پارەی زۆری تێ بچێت گرینگ ئەوەیە دەبێتە هۆی خۆشەویستی لەنێوان مرۆڤەکان دا٠(س) دەڵێ : دیاری سوودی خۆی هەیە ، ڕەنگەتۆکەبۆلای نەخۆشێك دەچیت شەربەتێك لەگەڵ خۆت دەبەیت لەگەڵ ئەوەی دڵی نەخۆشەکەدەدەیتەوە لەهەمان کاتداکاریگەرییەکی سایکۆلۆجی لەسەرنەخۆشەکەدەبێت٠(ش م) دەڵێ : دیاری سوننەتێکەلەسوننەتەکانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ، چونکەفەرموویەتی : (تهادواتحابوا)٠(ژ) دەڵێ : دیاری بەنرخ هەڵناسەنگێنرێ ، بەڵکوقەدروڕێز ی خاوەنەکەی دەردەخات بەرامبەربەوکەسەی دیارییەکەی پێشکەش دەکرێ ، هەروەهادەڵێم ئە

گەرتۆژمارەیەك پێنووست هەبوو کەسێکیش پێنووسێکی پێشکەش کردی ئەوەندە هەست بەبە هاکەی ناکەی ، بەلاّم ئەگەرپێنووست نەبوو پێویستت پێبوو لەناکاوپێنووسێکت بەدیاری بۆها ت دەلێی لەکاتی خۆی دا هات ، بۆیەدیاری هەرچەندە گران یان هەرزان بێت گرینگ نییە ، گر ینگ ئەوەیە ئەوکەسە تۆی هاتۆتەوەیادولەبیری نەکردووی٠

**لەبارەی سیلەی ڕەحم :**

**(ڕەحم)سۆزوسۆزداری وبەزەیی ونەرم وناسکی دڵە لەبەرامبەرکەسێك دەنوێنێت واتا ڕەحمەت ومیهرەبانی وبەزەییە٠**

**لەفەرموودەیەکی قودسیداهاتووە :** (عن عبدالرحمن بن عوف (رضی الله عنه) قال : سمعت رسول الله (صلی الله علیه وسلم) یقول : قال الله : أناالله ، وأناالرحمن،خلقت الرحم وشققت لهامن اسمي ، فمن وصلها وصلته ومن قطعها بتته) رواه الترمذي **واتا : لەعەبدولرەحمانی کوڕی عەوفەوە (خوالێی ڕازیبێ) گوتی : گوێم لەپێخەمبەری خودابوو(درودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو : خودای گەورەفەرموویەتی : من (الله)م وەمن (الرحمن)م ، خۆم ڕەحمم دروستکردووە لەناوی خۆم ئەم ناوەم داتاشیووە ، جاهەرکەس بیگەیەنێ منیش ڕەحمی خۆمی دەگەیەنم،هەرکەسێکیش بیپچڕێنێ منیش ڕەحمی خۆمی لەسەردەپچڕێنم٠(کەواتەسیلەی ڕەحم لەناوی الرحمن داتاشراوە ، نەك ڕەحمی ئافرەت)٠ (ه ف) دەڵێ : ژن وژنخوازی لەگەڵ بێگانەبکرێ باشترە ، چونکە لەحالەتی بوونی تەلاقدا هەرکەسەوڕێگای خۆی دەگرێت ، بەلاّم ئەگەرژن وژنخوازی لەگەڵ خزماندابکرێ ئەوالەحالەتی تەلاقدا سیلەی ڕەحمەکەش تووشی لێکترازان دەبێت٠(ك) دەڵێ : سەردانیکردنی یەکتری بەشێوەیەکی مامناوەندبێت ، نەئەوەندەزۆربچی ببێتەهۆی بێزارکردن ، نەئەوەندەکەمیش بێت دڵەکان لێك ساردببن٠ (چ) دەڵێ : زۆرجارلەیەکتری توڕەبووینە ، ئەگەربەسەرهەڵچوون وتوڕەبوونەکەماندامیوانمان بێت زووئاشت دەبینەوە٠(ڕ) دەڵێ : خۆشترین کات ئەوکاتەیەکەمیوانت دێت٠(ك) دەڵێ : سەردان ومیوانداری ڕەوشتێکی جوانە مرۆڤ پێی خۆشەو یست دەبێت وئاینی ئیسلامیش هانی داوەوبەجێگەیاندنی سیلەی (ڕەحم)یشە ، بەلاّم میواندار یش کات وساتی خۆی هەیە٠زۆرجارتۆپانێ وەك دیاردەیەکی جیهانی بۆتەهۆی تێکچونی پەیوە ندی کۆمەلاّیەتی٠(س) دەڵێ : لەگەڵ برادەرێکی خۆم سێ ساڵە قسەم نییە لەسەرڕیال وبەرشە لۆنە ، کاتی خۆی بووە شەڕمان هەموودەم وددانی یەکترمان شکاند٠(ك) دەڵێ : ئەگەربەخاوەن میوانێکت ڕاگەیاند کەپێت ناکرێ بچی بۆلای ، پاشان زانیت کەپێت دەکرێ تازە نەچی باشترە٠ پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی:**(لایدخل الجنة قاطع) رواه البخاری ومسلم

واتا : (ناچێتەبەهەشتەوە کەسێك سەردانی خزمەکانی ببڕێت) (مەبەست ئەوەیەسەرەتاناچێتە بەهەشتەوە)٠هەروەهازۆربەی هاندەرانی یاری تۆپی پێ لەکوردستان بەسەردوویانەدابەشبوونە ئەوانیش : (ڕیال مەدریدوبەرشەلۆنە) ، کەکاریگەرییان بەسەرپەیوەندییەکۆمەلآیەتییەکان در وستکردووە بۆتەهۆی دڵ لەیەك ڕەنجان وبەشەڕهاتنیش ، کەزۆرجاران دڵیان لەیەك ڕەنجاوەو قسەلەگەڵ یەك ناکەن بۆماوەیەکی زۆر٠(ش) دەڵێ : پەیوەندی نێوان هاوسەرەکەم وبراکانم بە هۆی ئەودوویانەیەوە لاوازبووە ، چونکە دوای یاری دەبێتەدەمەقالێیان ئێستاهاتووچۆی یەکتر ناکەن تەنانەت مێردەکەم کەمنیش بباتەوە ماڵەوە لەئۆتۆمبیل نایەتە خوارەوە٠

**وتنی (نا) :**

بۆنموونە ئەگەرمیوانێکمان هات ، پێی بڵێین مەیەژوورەوە ئابڕووت دەبات٠خوای گەورەدەفەر موێ : (ياأيهاالذين امنوا لاتدخلوابيوتا غيربيوتكم حتى تستأنسوا وتسلموا على أهلها ذلكم خيرلكم لعلكم تذكرون * فاءن لم تجدوا فيهاأحدا فلاتدخلوها حتى يؤذن لكم وان قيل لكم ارجعوا فارجعوا هوأزكى لكم والله بماتعملون خبير) النور: ٢٧ – ٢٨

واتا : (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جگەلەماڵی خۆتان سەربەهیچ ماڵێك نەکەن ، هەتائیزن نەخوازن وسلأونەکەن ئەمە بۆئێوەباشترە بەلکوپەندی لێ وەربگرن٠ئەگەرکەستان تێدانەدیت مەچوونە ژوورەوە تائیزنتان نەدەن ، ئەگەرپێیان وتن بگەڕێنەوە پێویستەبگەڕێنەوە ئەوەبۆ ئێوەباشتروپاکترە خوالەهەرکارێ دەیکەن ئاگادارە)٠

ڕەتکردنەوەی داواکاری یاخودڕەفزکردنی هەرداواکارییەك دەبێتەهۆی حادزبوونی ئەوکەسەی کەداواکارییەکەی ڕەت دەکرێتەوە بۆنموونە یەکێك داوای ئۆتۆمبیل لەهاوڕێکەی دەکات ، ئەم هاوڕێیەلەوانەیەلەڕووی شەرمەوە داواکەی جێبەجێ بکات ، چونکەلەوانەیەبەم ئۆتۆمبیلەتووشی ڕووداوێك بێت ئەم ڕووداوەش خەم وپەژارەوزیانێکی ماددی ومەعنەوی بەخاوەن هەلۆێستەکەببەخشێ٠یاخودکاتێك کوڕێك بۆمەبەستی هاوسەرگیری بەکچێك دەڵێت تاوەکوشووی پێ بکات مافی خۆیەتی قبولی نەکات ، بەلأم ئەگەرسوکایەتی پێ بکات ئەواهیچ لەم کوڕە کەم نابێتەوە٠هەروەها وتەیەکی کوردەواری هەیە دەڵێت : ((قسەی حەق ڕەقە))٠کەوا تە ئەگەرقسەیەك بۆباشی وچاکی بێ باڕەفیش بێت ئینسان نابێ لەبەردڵی گران بێ ، چۆن دەر مان کەبۆنەخۆشییەکی گران دکتۆربیدا ئەودەرمانە هەرچەندە تاڵ وناخۆشیش بێ دواییەکەی شیرینە ، قسەی حەقیش باڕەقیش بێ نابێ مرۆڤ لەبەردڵی گران بێ بۆنموونە ئەگەرئافرەت بە تەنیالەماڵەوەبوو یەکێك لەدەرگای دا با ئەوکەسە خزمیشی بێ نابێ ڕێگەبدات بێتەژوورەوە٠

عەقل :

لەبارەی شوێن وجێگای عەقل لەلاشەی مرۆڤ ئایا لەدەماغە یان لەدڵە ؟ بەشێك لەزانایان دەڵێن : عەقلی مرۆڤ لەدڵییەتی بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەیە : (الافي الجسد مضغة اذاصلحت صلح الجسد كله واذا فسدت فسدالجسد كله ألاوهي القلب)٠

بەشێكی تروای بۆدەچن ، كەدەماغ شوێنی عەقلە٠ خواردنەوەی عەرەق یەكێكە لەوهۆكارانەی كەدەبێتەهۆی پەكخستنی عەقل٠هەروەهاكاتێك مرۆڤ توڕەدەبیت بەشێكی زۆری عەقلی خۆی لەدەست دەدات ، هەربۆیە وتراوە : (توڕەبوون سەرەتاكەی شێتی یە ، كۆتاییەكەی پەشیمانی یە)٠

ئایاگیانلەبەران خاوەن عەقلن ؟

ئاژەڵ وباڵندەكان زمانی خۆیان هەیە ئەوەندە ئەقلیان هەیە ، كەژیانی خۆیان بەڕێوەببەن٠مێر وولە لەهاوین داكاردەكات وگەنم وخۆراك كۆدەكاتەوە ، تازستان دێت ئەوكاتە (ماڵی سپی بۆڕۆژ ی ڕەش)٠بەڵگەی زۆرهەیەلەسەرئەقلی گیانلەبەران ، چۆلەكەكان بەئاسمان دا دێن ودەچن بەدە نوكی بچوكیان پووش هەڵدەگرن وهێلانە دروست دەكەن پاسەوانی بەچكەكانیان دەكەن تاگەور ەدەبن خواردنیان بۆدەبەنەوە بەجریوەجریوە بەیەك دەگەن ، بەچكەكانیان فێری فڕین دەكەن ، كەواتەژیان وكرداریان پیشانی دەدات كەبێ ئەقل نین٠هەندێك باڵندە هاوینان لەناوچەیەك د ەبن و زستانان سەفەردەكەن بۆ ناوچەگەرمەكان خۆیان ڕێگە شارەزان و دەزانن كەی و لەكوێ بنیشنەوە ، باڵندەكان لەشوێنی بەرزهێلانە دروست دەكەن تاپارێزراوبن ئایائەمانە بەبێ ئەقل ئەنجام دەدرێن ؟! مێرووله لەكاتی هاوینان كاردەكەن وخۆیان بۆوەرزی سەرماوباران ئامادەدەكە ن خۆراك بۆشارەكەیان دەبەنەوە یارمەتی یەكتردەدەن ودووان دووان وسیان سیان خۆراكی قور س وگران هەڵدەگرن٠

پۆلینكردنی عەقل :

یەكەم — گەمژە :

گەشەی عەقلی سێ لەسەرچواری كەسانی ئاسایی دەبێت٠

دووەم — گەوج :

ڕێژەی عەقلیان یەك لەسەرچواری كەسانی ئاساییە٠

سێیەم — گێل :

گەشەی عەقلیان لەچارەگێك كەمترە٠

## لەبارەی زیرەکی :

زیرەکی توانای مێشکی مرۆڤە لەشت فێربوون وتێگەیشتن دا٠هەندێکیش دەڵێن : توانای مرۆڤە لەخۆگونجاندنی لەگەڵ دەوروبەردا٠زاناکان دەڵێن : ڕەچەلەك لەنێوان ٦٥٪ بۆ ٨٠٪ دەوردەبینێ لەپێکهێنانی زیرەکی دا٠ئەوزانایانەی لەگەڵ ئەوڕایەدان : (فرانس کریك) و(ڤارلان بورنە) بوو ن ، کەهەردووکیان خەلاٚتی نۆبڵیان بەدەستهێناوە ، کەتاقیکردنەوەیان لەسەردووەمنداڵی جمك کردووە ، کەهەریەکەیان لەجێگایەك داناوە ، کەجیاوازبووە لەوی دی پاش تێپەڕبوونی ماوەیە کی زۆربەسەرئەم کارە تەماشایان کردووە کەئەودووەمنداڵە تاڕاددەیەکی زۆرلەیەك دەچن٠

## زانیاری گشتی :

★ناوی ئەم ولاٚتات وشارانەلەچییەوەهاتووە ؟

١ — ئەرجەنتین :

وشەیەکی ئیسپانییە واتا : (زەوی زیوین) ، چونکەکاتێك ئیسپانییەکان وەك داگیرکەرێك ڕوویان کردە ئەو ولاٚتە بینییان کەوادانیشتوانەکەی بە(زیو) خۆیان ڕازاندۆتەوە وئیسپانییەکانیش هاتنەسەرئەوەی کەئەم ولاٚتەلەڕووی ئەم جۆرەکانزایە دەوڵەمەندە لەبەرئەوە ناوی ئەرجەنتینیان بەسەردابڕی٠

٢ — ئیکوادۆر :

ناوەکەی لەناوی هێلی ئیستیوا بەزمانی ئیسپانی داتاشراوە ، چونکەئەوولاٚتەدەکەوتەسەرهێلی ناوبراو٠

٣ — بەڕازیل :

چونکە چەشنەدارێك کەپێی دەوترا (بەڕازیل) بەڕێژەیەکی زۆرلەم ولاٚتەداهەبوو ، لەبەرئەوە ئەم ناوەیان لێناوە٠

٤ — پۆلیڤیا :

پیرۆی سەرووی پێ دەوترا ، بۆڕێزنان لە"پۆلیڤار" کەسەرکردایەتی خەباتی دژبەئیستعماری لەئەمریکای باشووردادەکرد ، کەلەناوی (پۆلیڤار)وەرگیراوە٠

٥ — کۆلۆمبیا :

ناوەکەی لەناوی "کریستۆفەرکۆلۆمبس" وەرگیراوە٠

٦ — تشیلی :

ناوەکەی واتا(خاکی بەفرین) دەبەخشێ ، لەبەرزۆری بەفرلەم ناوچەیە٠

٧ — ڤەنزوێلا :

لەناوی شاری ڤینیسیای ئیتاڵیاوەرگیراوە٠

٨ — ئەمریکا :

ناوی ئەمریکا لەناوی (ئەمریکۆفتبشی) کەدەریاوانێکی فلورەنسی بووهاتووە ، کەیەکەم کەس بوو وەسفی ئەمریکای وەك کیشوەرێکی سەربەخۆی جیهانی کرد٠

٩ — لوبنان :

وشەی لوبنان فینیقییە لەئەسڵدابەمانای (سپیایی) دێت٠کەمەبەست ئەوبەفرە زۆرەیە کەدەبارێت بەسەرئەوناوچەیەدا٠

١٠ — ئایسلەندا :

بەمانای (خاکی سەهۆڵ) دێت٠ئایسلەندابانێکی گەورەیەداپۆشراوەبەسەهۆڵ٠

١١ — لۆکسمبۆرگ :

بەمانای (کۆشکی بچووك) دێت٠وڵاتێکی بچووکەدەکەوێتەباکوری ئەوروپا٠

١٢ — مۆناکۆ :

ناوی هۆزێکە٠دەوڵەتێکی بچووکە لەداوای ڤاتیکان بچووکترین دەوڵەتەلەجیهاندا ، ژمارەی دانیشتوانی (٣٢٠٠٠) سی ودووهەزارکەس بووە لەساڵی (٢٠٠٢)دا٠

١٣ — نەرویج :

بەمانای (ڕێگای باکوور) دێت٠دەوڵەتێکەدەکەوێتەباشووری ڕۆژئاوای ئەوروپاوە٠

١٤ — هۆڵەندە :

وشەی هۆڵەندە بەمانای (زەوییەنشێوەکە) دێت٠

١٥ — یوگسلافیا :

بەمانای (خاکی سولاڤی) دێت٠

١٦ — ئیتاڵیا :

وشەیەکی یۆنانییە بەمانای (زەوی مار)دێت٠ خواوەندی مار سمبوڵی ئەوهۆزانەبووە ، کەلەباشووری دورگەکە نیشتەجێ بوون٠

١٧ — سان مارینۆ :

دەوڵەتێکی ئەوروپی بچووکە ، ئیتاڵیالەهەموولایەکەوە دەوری داوە ، لەسەدەی سێیەمەوە دروستکراوە لەلایەن (سان مارینۆ)٠

١٨ — سوید :

لەناوی هۆزی (سفیر) دەوهاتووە کەلەم ناوچەیەکاتی خۆی نیشتەجێ بوون٠

١٩ – جامبیا :

دەوڵەتێکەدەکەوێتەڕۆژئاوای ئەفریقیا ، لەناوی ڕووباری جامیاوەهاتووە کەلەسەنیگالەوەدێت.

٢٠ – کۆنغۆ (کۆنگۆ) :

کۆنغۆبەمانای (ڕووباری زۆرئاو)دێت.

٢١ – نەیجەر :

ئەم ناوەلەناوی ڕووباری نەیجەرەوەهاتووە.

٢٢ – ئۆرۆگوای :

وڵاتێکەدەکەوێتەکەناری باشووری ڕۆژهەڵاتی کەناری ئەمریکای باشوور ، وشەی ئۆرۆگوای بەزمانی دانیشتوانەکەی واتای (ئاوی زۆر) دێت.

٢٣ – پاراگوای :

ئەم دەوڵەتەدەکەوێتەبەشی ناوەڕاستی ئەمریکای باشوور ، ناوی ئەم وڵاتەلەناوی ڕووباری (پەرەگوای) هاتووە.

٢٤ – ئوستورالیا :

ئوستورالیابەمانای (خاکی باشوور) دێ.ئەو وڵاتەقارەیەك بەتەواوی لەخۆدەگرێت.

٢٥ – مایکرۆنیزیا :

مایکرۆنیزیابەمانای (دوورگەبچووکەکان).

٢٦ – فەرەنسا :

لەدەوروبەری سەدەی چوارەمی میلادی هۆزێکی ئەڵمانی بەناوی (فرەنکە – فەرەنگ) هاتۆتەنا وچەکەودوای لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ناویان لەم وڵاتەناوە فەرەنسا.

٢٧ – ڕۆما :

ئەم ناوە لەناوی یەکەم حاکمی ئەوشارە وەرگیراوە ، کەناوی (ڕۆمیلۆس)بووە.

٢٨ – پاریس :

هەندێ هۆزناسرابوون بە (پاریزی) لەم ناوچەیە ژیاون.

٢٩ – قاهیرە :

بڕواوایە ، کەلەوشەی (قەهر) هاتبێ.

٣٠ – بڕواوایە ، کەلەوشەی (ئەنجلز) هاتبێ کەمانای (فریشتە).

٣١ – لەندەن :

بڕواوایە لەناوی شا (لۆد) هاتبێ.

★ناوی ئەم شوێن وجێگایانەلەچییەوە هاتووە ؟

١ — دیلمان :

گوندێکە لەنزیك قەسرێ لەپارێزگای هەولێر٠ئەم وشەیەلەزمانی سۆمەری بەشێوەی (دیلمون) هاتووە بەواتای بەهەشت٠

٢ — فورات :

ڕوبارێکی بەناوبانگە لەکوردستانی تورکیاوە شۆڕدەبێتەوە ناوخاکی سوریەوعیراق تادەڕژێتە دیجلەوە٠وشەی فورات واتا (شیرین ، سازگار)٠

٣ — دیانا :

شارۆچکەیەکە لەدەڤەری سۆران لەبناری چیای زۆزك دا٠لەناوئەفسانەی ڕۆمانیەکاندا دیانا وا تا ئیلاهەی (ڕاوشکار)٠هەندێ کەسیش پێیان وایە ، کەناوی (دیانا) لەوەوەهاتووە کەدیان تێد انیشتەجێ بوونە ، هەروەهایەکێك لەحەوت حاجباتییەکەی جیهان پەیکەری (دیانا)یە لەئە فسووس کەشارێکی کۆنە دەکەوێتە ولاّتی تورکیاوە لەسەردەریای ئیجە لەنزیك شاری ئەزمیر ئەم پەیکەرە لەساڵی (٤٥٠ پ م) دروستکراوە٠ لەسەردەمی ڕۆمانییەکان پەرستگای خواوەندی (دیانا)بوو ، کەخواوەندی (ڕاوکردن)بووە٠

٤ — خانەقین :

بەڕای جەمیل ڕۆژبەیانی لە (خان) و(طین) هاتووە٠

٥ — قەسری شیرین :

قەزایەکە لەکرمانشا دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای ئێران٠خەسرەوپەروێزی ساسانی بۆشیرینی هاو سەری دروستی کردووە٠شیرین دووکچی هەبوو ، کەلەماوەی (٦٢٨ — ٦٣٢) یەك لەدوای یەك بوو نەپاشای ساسانی ئەوانیش (پوران) و(ئازەرمیدۆخت)شابوون٠

٦ — شارەبان :

جەمیل ڕۆژبەیانی دەڵێ : شارەبان بۆ(شەهربانو) دەگەڕێتەوە کەکچی (یەزگورد)بووە بووە بە هاوسەری ئیمام حوسێن٠(جەمال بابان)یش دەڵێ : لە(شار+ بان)هاتووە ، بان بریتییەلەلای سەر ەوە وەك تاڵەبان٠

٧ — شارەزوور :

یاقوتی حەمەوی لە (معجم البلدان)دەڵێ: ئەوشارە(زووری کوڕی زوحاك)دایمەزراندووە٠(جەما ل بابان)یش دەڵێ : لە(شهرزەوار)شاری کاروانچی هاتووە ، لەم بارەیەوە جەمال بابان شیعرێکی مەولەوی دەهێنێتەوە :

دەنگ زەیلەن زەواری مەیۆ

دەنگی قافلەکەی جەهاری مەیۆ

٨ – مەهاباد (سابلاغ) :

مەهابادوشەیەکی فارسییە لەدوووشەی (مەھ)و(ئاباد) پێکهاتووە "مەھ" واتا (مانگ) ئابادیش و اتا (ئاوەدانی)٠(سابلاغ)یش وشەیەکی عوسمانی یە بەواتای (کانی سارد)دێت٠

٩ – هەکاری :

دەکەوێتەسەرووی موسڵ لەهەرێمی جەزیرە لەکوردستانی تورکیا٠سەبارەت بەناوی هەکاری ڕای جیاوازهەیە لەوانە : هەکاری ناوی عەشیرەتێکی کوردە لە(وان)٠

١٠ – شەنگال (شەنگار) :

سەبارەت بەناوی شەنگال دووڕاهەیە ، یەکێکیان دەڵێ : لە (شەنگ + ئاڵ)هاتووە بەواتای(جوان) وشەی (ئاڵ)یش بەواتای (لا) تەڕەف٠دووەمیان : شەنگار واتا : (شەنگ + ئاگر) بەواتای ئاگری جوان دێت ، کەپێدەچێت ناوی شارەکە گوزارشت لەئاتەشگای زەردەشتییەکان بکات٠

١١ – تەلکێف :

قەزای تەلکێف لەپارێزگای نەینەوایە دەکەوێتەباکوری ڕۆژهەلاتی شارەکە٠وتراوە تلکێف لە(تلا کیفا)هاتووە واتا(گردی بەرد)بەزمانی ئارامی وسریانی لەبەرئەوەی بەردی (کلس)ی لەسەرزەو یەکەی هەیە ، ئەم شارۆچکەیە زۆرکۆنە شارۆچکەیەکی مەسیحی یە٠

١٢ – ئەلقوش :

ناوی ناحیەیەکە سەربەقەزای تلکێف دەکەوێتەبادینان٠وشەکە بەتورکی عوسمانی لە (ئاڵ + قو ش)هاتووە واتا (باڵندەی سوور)ئەمەش نزیکەلەواقع وەك دەڵێن: لێوئاڵ واتا لێوی سوور٠قوشقاقە ز : باڵندەی کاغەز٠

١٣ – وان :

ناوەکەی لەدەریاچەی (وان) وەرگیراوە٠

١٤ – کفری :

وشەی کفری جۆرەقیرێکەبۆسواخی کەشتی وپاپۆڕەکان بەکارهاتووە تورکەعوسمانییەکان لەجە نگی یەکەمی جیهانی لەوێ خەڵوزی دەردەکردبۆکارپێکردنی ئامێروشەمەندەفەرەکان٠یاخودو شەی کفری وشەیەکی بابلییەدەستکاری کراوە ، کەواتای خەڵوزدەگەیەنێ٠هەروەهاوشەی (کفر) بەودرەختانەدەوترێت کەلەکۆنەوە ناوچەکەی داپۆشیوە پاشماوەی ئەم درەختانەلەدێی (١٢)دوا زدەئیمام ماوە٠

١٥ – هیمالایا :

شاخێکی بڵندە دەکەوێتە هیندستان ، هیما بەمانای (بەفر)٠

١٦ — ئاسۆس :

بەوزنجیرە شاخەدەڵێن ، کەلەدەربەندی ڕانییەوە دەست پێدەکات وکەوتۆتە نێوان پشدەرومەر گە ، ناوی شاخەکە لەوشەی (ئاسۆ)ەوە وەرگیراوە ، چونکە شاخەکە بەئاسۆی بیتوێن ومەرگە دادەنرێت لەکاتی ڕۆژهەڵاتن٠

١٧ — ئەلوەند :

ڕووبارێکی نیمچە گەورەیە شاری خانەقین دەکات بەدووبەشەوە ، وشەیەکی لێکدراوە لەدووشە پێکهاتووە : ئەلی + وەند

١٨ — ئاکۆ :

هۆزێکی کوردە لەناوچەی ئاکۆیان دادەنیشن لەناوچەی قەندیل وڕانیەوچوارقورنەودەشتی بیتو ین بلاّوبوونەتەوە ، لە (ئاو + کوە) هاتووە واتا ئاووشاخ٠

١٩ — بریفکان :

ئەم گوندە کەوتۆتە ناوچەی شێخانان لەشوێنێکی بەرز هەڵکەوتووە ، دووشە هەیە لەناوچەکە یەکەمیان وشەی (کریف) ، کەیەزیدییەکان بۆدۆستی باش بەکاری دەینن ، دووەمیان وشەی (بر یف)ە ، کەموسوڵمانەکان بۆپیاوی باش بەکاریان هێناوە کەواتە وشەی بریفکان بەمانای جێگای پیاوی باش کە ئەم شوێنە قوتابخانەی هەبووە خزمەتی زۆری دین وزانستیان کردووە٠ ئەم گو ندە پیاوی گەورەی لێ هەڵکەوتووە وەکو : شێخ نورەددین بریفکانی٠بۆچوونێکی ترهەیە کە با پیرە گەورەی شێخ نورەددین ، شێخ شەمسەددین لەگوندی بریڤا لەکوردستانی تورکیا هاتۆتە ئەم شوێنەوخانووی لەسەرکانی درەستکردووە ناوی ناوە (بریڤاکانی) واتا کانی بریڤا بەیادی هەوارە کۆنەکەی خۆی پاشان وشەکە بۆتە (بریفکانی)٠

٢٠ — پێنجوین :

قەزایەکی گەورەیە لەسەرسنوری ئێران — عیراق ، ناوی شوێنەکە لەوەوە هاتووە کەپێنج ئاوا یی لەنزیك یەك هەبووە٠بۆچوونی دووەم دەڵێ : ئەم ناوچەیە پێنج جاربەهۆی بومەلەرزەو گرانی وتاعوون وێرانبووە٠بۆچوونی سێیەم دەڵێ : لەپێنج وێنەهاتووە لەبەرجوانی ناوچەکە بەپێنج شێوە خۆی نیشانداوە٠

٢١ — پیرەمەگروون :

زنجیرە شاخێکە لەدۆڵی سورداش تانزیك سەرچنار ، بەرزییەکەی (٢٦٠٩) پێیە ، بەناوی ئەوچا کەکراوە کەلەبەرزاییەکانی ئەوشاخە لەناوگۆڕستانێك دایە٠

٢٢ — بیارە :

شارۆچکەیەکە کەوتۆتە هەورامان پێش میلاد ئافرەتێك سەرداری ناوچەکە بووە بەناوی (بیار

یٚ)٠

٢٣ — باواجی :

شاخێکی زۆرپان وبەرینە لەڕۆژئاوای شارۆچکەی کۆیە لەهەموولایەکەوە ئاووکانی هەیە وەکو ئاوی حەمامۆکێ وچەندین کانی تر لە (ئاووجێ)هاتووە٠

٢٤ — بانەمان :

گوندێکی بەئاووباخاتە لەڕۆژئاوای شاخی پیرمام لەسەر ڕێگای سەرەکی هەولێر — سەلاحەددین قەلایەك لەشوێنێکی بەرز لەم شوێنە بەرچاودەکەوێ ، کەدەگەڕێتەوە بۆسەردەمی میرمحەممە دی پاشای ڕواندز بۆ پاراستنی ڕێگای پاسەوانی ناوی شوێنەکە لە (بنووبەئەمان) هاتووە ، چو نکە ئەوکاروانانەی ، کەلەناوچەی سۆران وخۆشناوەتی هاتوون درەنگ وەختیان بەسەرداهاتوو ە لەوێ پاڵیان داوەتەوە بۆبەیانی بۆهەولێرهاتوون پاسەوانەکان پارێزگارییان لێ کردوون٠

٢٥ — بنەصلاۆە :

پیاوێکی دیان کەناوی (صلێوە) بووە لەم شوێنە خانوودیوەخانی هەبووە٠

٢٦ — بەردەشان :

گوندێکەلەبناری ڕۆژئاوای شاخی ئاسۆس ، زێدی شاعیرعەلی بەردەشانی یە ، کەلەسەدەی حەڤد ەهەم دا ژیاوە٠ناوی گوندەکەلەوبەردە خڕانە هاتووە کەلەگوندەکەدا هەن کەوەکوشانەی مێش هەنگوین خانەخانەی لەسەرە٠

٢٧ — چەم چەماڵ :

قەزایەکی گەورەیەلەڕۆژئاوای دەربەندی بازیان لەسەرڕێگای سلێمانی — کەرکوك٠ناوچەکە ئاو ی زۆربووە لەبەرئەوە کاتی خۆی لەبەرئاوی چەمەکەوە هەریەکەومالێکی دروستکردووە٠

٢٨ — دیبەگە :

شارۆچکەیەکە لەسەرڕێگای مەخموور — هەولێر٠لەوشەی (دێ بەگا)هاتووە واتائەودێیەی (گا)ی زۆرە٠

٢٩ — دێرەلوك :

گوندێکەلەدەڤەری بادینان لەوشەی (دێر لۆقا) هاتووە٠

٣٠ — حەریر :

ناوەکەی لەکوتاڵی (حەریر)هاتووە کەلەسەردەمی کۆن دا بازرگانی بەم کوتاڵەکراوە٠

٣١ — کەلار :

شارۆچکەیەکەلەدەڤەری گەرمیان لە (کەند لار) هاتووە٠

٣٢ — کۆڕەك :

شاخێکی زۆربەرزە لەڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی خەلیفان لە (کوه + ڕك) هاتووە٠

٣٣ – کۆسرەت :

ئەم شاخەش لە (کوه + سرت) هاتووە ، چونکە بەردەکانی زۆرڕەق وپتەوە٠

٣٤ – سەیدسادق :

بەناوی چاکی سەیدسادق کراوە٠

٣٥ – سەنگەسەر :

لەپشت ماڵان سەنگەرهەبووە٠

٣٦ – شمشارە :

گردێکی شوێنەوارییە نزیك دەربەندی ڕانییە بەواتای شاری شمش٠

٣٧ – قەلاچۆلان :

بەمانای قەلای چۆلەوانی٠

٣٨ – قزقابان :

ئەم ئەشکەوتە لەدۆڵی سورداشە ناوێکی تورکییە بەمانای (کچی فرێندراو) ، کەلاوێك کچێکی هەلگرتووە بۆئەم ئەشکەوتەی بردووە٠

٣٩ – قەرەچووغ :

شاخێکی بەرزە لەنێوان دەشتی کەندیناوەوقەراج گیای (چۆغان)ی لێ بووە کەوالەجیاتی سابوون بەکارهاتووە٠

٤٠ – قەرەهەنجیر :

ناحییەیەکەلەسەرڕێگای سلێمانی – کەرکوك٠واتا هەنجیری ڕەش٠

## ساڵنامەی میلادی :

سەرەتای دەستپێکردنی ئەومێژووە دەگەڕێتەوە بۆساڵی لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) ، کەتائەمڕۆئەوەندە ساڵەی بەسەردا تێپەڕیوە٠

## ساڵنامەی کۆچی :

مێژووی ساڵی کۆچی لەوساڵەوە دەست پێدەکات ، کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) لەشاری مەککەوە کۆچی کردبۆشاری یثرب (مەدینە)٠

## ساڵنامەی کوردی :

سەرەتای دەست پێکردنی ساڵی کوردی دەگەڕێتەوەبۆسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ماد (٧٠٠)

سالٚ پێش میلاد٠

٧٠٠ + سالّی میلادی = سالّی کوردی

## ناوی مانگەکانی کۆچی لەچییەوەهاتووە ؟

١ – موحەررەم :

واتا (قەدەغەکراو) ، یەکەم مانگی سالّی کۆچییە وناونراوە موحەررەم ، لەبەرئەوەی عەرەب لە پێش ئیسلامدا کوشتنیان تێداحەرام کردبوو، ولەئیسلامیش دا کوشتنی تێدا حەرام کراوە٠

٢– سەفەر :

لەبەردەرچوون بۆغەزوو٠٠٠

٣– ربیع الاول :

واتا (بەهاری یەکەم) ناونانەکەی لەبەهاردابووە٠

٤– ربیع الثانی :

واتابەهاری دووەم واتا بەهارێکی تر٠

٥– جەمادی یەکەم :

واتا(بەستنی یەکەم) لەبەرئەوەی کاتی بەستنی ئاوبوو ناونانەکەی لەزستان دا بووە٠

٦– جەمادی دووەم :

واتابەستنێکی تربەهەمان شێوە لەزستان دا ناولێنراوە٠

٧ – ڕەجەب :

یەکێکەلەمانگەحەرامەکان بەمانای لەکوشتاربووەستە٠

٨ – شەعبان :

دەلّێن لەبەرئەوەی جیابوونەتەوە بۆشەڕ لەدوای دانیشتنیان لەمانگی ڕەجەب دا٠

٩ – ڕەمەزان :

١٠ – شەوال :

جەژنی ڕەمەزانی تێدایە

١١ – زولقەعدە :

یەکێکەلەمانگەحەرامەکان بەمانای دانیشتن دێ٠

١٢– زولحەجە :

حەج وجەژنی قوربانی تێدایە ، لەبەرئەوەی لەم مانگەدا حەجیان کردووە٠

## ناوی مانگەکانی کوردی لەچییەوە هاتووە ؟

**مانگەکانی وەرزی بەهار :**

١ – مانگی یەکەمی ساڵی کوردی چەندین ناوی هەیە ، وەك : (نەورۆز ، خاکەلێوە ، ئاخەلێوە ، ئادار)٠

خاکەلێوە لە (خاك + لێوە) پێکهاتووە ، بەواتای خشانی لێوی ئاژەڵ لەخاك لەکاتی لەوەڕین ، سەبارەت بەپەیدابوونی گژوگیاوسەوزایی کاتێ گیاوگۆر سەری خۆی لەخاك دەرهێنا دەبێتە لەوەڕێکی تەواو گەرئاژەڵ بشی خوات لێوی لەخاك ناخشێ٠

ئادار لە (ئاو + دار) هاتووە٠

نەورۆز لە (نو + ڕوز) واتا ڕۆژی نوێ

٢– گوڵان : بانە مەڕیشی پێ دەوترێ٠لەومانگەدا دانەوێڵە ، جۆ دەست بەدروستکردنی گوڵ دەکات ، کەپێی دەڵێن گوڵەجۆ بەواتای کاتی پەیدابوونی گوڵی گەنم وجۆ٠بانەمەڕیش بەوا تای لەوماوەیەدا ئاژەڵداران مەڕومالآتیان دەبەن بۆبانان٠

٣– جۆزەردان :

واتا جۆزەردبوو ، بەختەبارانیشی پێ دەوترێت ، کەئەوبارانەی لەوکاتەدا دەبارێت بەختە ، چو نکەلەوکاتەی ساڵ باران بەشێوەیەکی ئاسایی ناباری٠

**مانگەکانی وەرزی هاوین :**

١ – پووشپەڕ :

لە پووش پەڕین هاتووە ، لەوکاتەی ساڵ پووش لەبەرگەرمی هەتاو زۆروشك وناسك دەبێ ، هەر شتێکی پێ بکەوێ وەکوقاچی ئاژەڵ دەوەرێ یان دەپەڕێت٠پووش کاڵێش بەواتای گۆڕانی ڕەنگی گیاوگۆروپووش پووش وپەراش لەبەرگەرمای هەتاوکاڵ دەبێ واتا پووش کاڵبوون٠

٢– خەرمانان :

دوای ئەوەی بەرووبوومی دانەوێڵەی وەکوگەنم وجۆ دروێنەدەکات ، ئینجا لەپارچە زەوییەکی تەختایی کۆی دەکەنەوە ، کەبۆئەومەبەستە ڕێکخراوە پێی دەڵێن : (جۆخین) پاش کوتانی بەر هەمەکە بەگێرەو جەنجەڕکردن بەشەنەباکردن لێك جیادەکرێنەوە بەبەرهەمی تازە پەیدابوو دەلێن : (خەرمان) بۆیە دەڵێن : خەرمانان یان جۆخینان یان زەخیران واتا هەڵگرتن وعەمبار کردنی بەروبوومی دانەوێڵەی پێویست بۆزستان٠

**٢ – گەلاوێژ**

**مانگەکانی وەرزی پایز :**

**١ – ڕەزبەر :**

**بەواتای ئەودەمەی ڕەزومیوەجات دێتەبەرهەم ، لەڕەزبەردان هاتووە٠**

**٢ – گەلاڕیزان :**

**خەڵك گەلاوچڕۆی دارکۆدەکەنەوەو ڕیزیان دەکەن وهەڵیان دەگرن بۆئالیکی زستانی مەڕومالاّت ، لەگەلاڕیزکردن وەرگیراوە٠(پیتی ی حەوتی لەسەرنییە ، چونکە ڕێز واتا احترام )**

**٣– سەرماوەرز :**

**واتاوەرزی سارد ، پێشی دەڵێن شەستەباران ، چونکە باران زۆردەبارێت٠**

**مانگەکانی وەرزی زستان :**

**١ – بەفرانبار :**

**واتابەفربارین**

**٢ – ڕێ بەندان :**

**بەواتای ڕێگاگیران وداخران ، لەڕێ بەندبوون هاتووە٠**

**٣– ڕەشەمێ :**

**چونکە تیشکی خۆربەهێزدەبێت پێستی دەم وچاو نەختێ ڕەش دەبێ ، هەندێك دەڵێن بەواتای مێ (ئافرەت) ڕەشبوون ، چونکەئەگەرئافرەت لەبەرهەتاوبمینێتەوە ڕەنگی دەم وچاوی ڕەش دە بێ ، هەندێکیش دەڵێن ئەوناوە لە (ڕەش ماە) هاتووە ماە واتا مانگ ، چونکە ئەوکاتەڕەنگی زە وی لەهەندێ شوێن لەبەرشین بوونی گیاوگۆر ڕەش هەڵدەگەڕێ٠**

★ناوی ئەم ئۆتۆمبیلانە لەچی هاتووە ؟

١ – مۆنیکا :

لاندکرۆزەرمۆدیل (٢٠٠١) تاوەکو (٢٠٠٧) پێیان دەوترێت مۆنیکا ، کەناوی دۆستێکی بیل کلینتۆ نی سەرۆکی پێشووی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکایە٠

٢ – وەنەوشە :

لاندکرۆزەری مۆدیل (٢٠٠٨) و (٢٠٠٩) پێیان دەوترێت وەنەوشە ، کەئەکتەرێکی زنجیرە درامای گەردەلوول بوو٠

٣– مەرزییە :

تیۆتای مۆدیل (٢٠٠٦) و (٢٠٠٧) پێیان دەوترێت مەرزییە ، بەناوی هونەرمەندی خوالێی خۆ شبێ مەرزییە فەریقی کراوە٠

٣ – سەباو :

لەسلێمانی بە ئۆتۆمبیلی نیسان ناڤاری دەوترێت ، کەئەکتەری نێوزنجیرە درامای ئارەزووبوو٠

٤ – عەزیزوەیسی :

جۆرێکی تیۆتایە لەبەرئەوەی دەعامی پێشەوەی زۆرڕەشەو شێوەکەشی زۆرپانە ، کەئەمەشیان بەسمێڵی گۆرانیبێژ عەزیزوەیسی چواندووە٠

٥ – مازدەی کەری تۆپی :

جۆرێکی مازدەیە بەهۆی نەفرۆشتنی لەبازاڕومانەوەی بەسەرخاوەنەکەی بۆماوەیەکی زۆرئەم ناوەی لێنراوە ، کەمۆدیل(١٩٢٩)یە٠

٦ – گامێش :

جۆرێکی ئۆپڵە ، کەلەهەولێربە (گامێش) ناسراوە ، بەڵام لەسلێمانی بەپشیلە٠

لەکاتی نوسینی ڕێککەوتنی فرۆشتن لەگەڵ ناوە بنەڕەتییەکەی ناوەکەی تریشی دەنوسرێت٠

★دانەری ئەم سرودانە کێن ؟

((خۆشم دەوێی ولاْتەکەم)) ئەم سرودە هی (کاکەی فەللاح)ە٠ دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموز(گەلاو ێژ)ی ساڵی (١٩٥٨) هونەرمەند (ئیبراهیم محەممەد) بۆئێزگەی کوردی بەغدا تۆماری کردووە٠

((ئێمەکوردین نابەزین)) شیعری هونەرمەندی خولێی خۆشبێت (ڕەسول گەردی)یە هەرخۆشی وتوویەتی٠

((کەدەڵێن ئەمرۆدەشت وکێوشینە چەندە مەڵبەندی ئێمەشیرینە))لەسالاْنی سییەکان (مەلاکەر یم) لەسەرقەوان تۆماری کردووە ، دواترچەندکەسێکی تروتوویانەتەوە٠

((ئەی شەهیدان ئەی شەهیدان نامرێ ناوونیشانتان)) شاعیرورۆژنامەوان وفۆلکلۆرناسی کورد ( مەممەد تۆفیق وردی) ، کەبنەماڵەی (وردی) بەڕەچەلەك دیاربەکریین ، بەلاْم ڕەشیدفەندی باپیریان لەکۆیە ژن دەینێ ولەوێ دەمینێتەوە٠

★قەناتی کوردۆ :

ناوی تەواوی (قەنات کوڕی کوردۆکوڕی کەلەش)ە تەمەنی دە ساڵ تێپەڕیبوو ، کەچی هێشتا نە چووبووە قوتابخانە بێکەس وبێدەرلەشاری یەریڤان لەسەردەرۆزە یان بۆیاغ وپاککردنەوەی پێلاْ وی خەڵکی دەژیا٠کابرایەکی ئەرمەنی ، کەناوی (لازۆگازاریان)بووە بیری کردەوە قوتابخانەیەك بۆمنداڵەئاوارەکانی کورد دروست بکات بۆئەم مەبەستەهەندێ منداڵی بێکەسی کۆکردەوە ، کە زۆربەیان لەباوك ودایکیان دابڕابوون بەڕۆژخەریکی دەرۆزە یان بۆیاغچییەتی بوون بەشەویش پەنایان دەبردەبەرمالاْن یان هەرجێگەیەك بنمیچی هەبوایە شەویان دەبردەسەر یەکێك لەوانە قەناتی کوردۆبوو ، کەپسپۆڕی زمانی کوردی بوو ، هەروەهادەستی بۆلایەنی مێژوو وجوگرافیاو ئەتنۆگرافیابردبوو ، قەناتی کوردۆ وەکوزانایەکی زمانەوانی هەمووکەسێك ناوبانگی دەزانی٠قە ناتی کوردۆلەگەڵ خوالێخۆشبێت دکتۆر مارف خەزنەدار هەردووکیان پێکەوە قوتابی بوون لەئا مۆژگای ڕۆژهەلاْتناسی ئەکادیمیای زانستی ڕووسیا٠لەڕۆژی ٣١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٥ لە ڕوسیاکۆچی دوایی کرد٠

٭سەلاحەددینی ئەییوبی بەڕای ڕۆژئاواییەکان :-

سەلاحەددینی ئەییوبی ناوی (یوسف کوڕی ئەییوبی کوڕی شادی کوڕی مەڕوان)ە٠سەبارەت بەباوکی ناویان لێناوە ئەییوبی٠سەلاحەددینی ئەییوبی لەشارەزوورەوە تادیاربەکرومیسرڕوشام وسودان وحیجازویەمەنی لەژێردەست دابوو٠کۆمەڵێك نوسەری ئەوروپایی دانیان بەوەداناوە ، کە(سەلاحەددینی ئەییوبی)لەپلەیەکی بەرزی ڕەوشتبەرزی بووە٠مێژووناسی گەورەی شەڕەکانی خاچ دروشمەکان (ستیڤن ڕینسیمان) ، دەڵێت : ((ئەوپەیمانی خۆی نەشکاندووە ، لەبەرئەوەش کەسەرداری میللەت بووە تابڵێی لێبووردەوژیروگران بووە))٠(لامۆند)یش دەڵێت : ((صلاح الدین توانیویەتی دەوڵەتێك دا بمەزرێنێت جێگای هەردووئاینەکەی شانبەشان تێداببێتەوە ، صلاح الدین نەیدەویست گاورەکان لەناوببات))٠سیاسەت مەداری ئینگلیزی بەناوبانگ (سێرونستن چەرچل) ناسناوی (مەزنترین شای جیهان)ی لێناوە٠نوسەری ئینگلیز(ڕیدەرهەجارد) دەڵێ : ((صلاح الدین مەزنترین پیاوی سەرڕووی وەمینە))٠مێژووناسانی ڕۆژئاوا ئەوپیاوەتییەی صلاح الدین یان لەبەرچاوە کەلەگرتنی (بەیت والمەقدیس)دا نواندی ، پیاداهەڵدەڵێن باسی ئەوەدەکەن چۆن خۆراکی بەسەرهەژاران دا دابەشکردووە ، چۆن ڕێزی لەئافرەتان گرتووە ، چ دڵێکی بەمنداڵان سووتاوە(چونکە ژن ومنداڵ لەلیستی بێ دەسەڵاتەکانن) ، چ بەزەییەکی بەلاوازەکانیان هاتەوە٠لەم ڕووەوە (فلیپ حەتی) دە لێت : (( ڕەفتاری صلاح الدین لەگەڵ فەرەنگەکانی قودس تا ئەوڕەفتارەی فەرەنگ هەشتاوهەشت ساڵ لەمەوبەرلەگەڵ موسوڵمانەکانی ئەم شارە کردیان ئاسمان وڕێسمانە٠))

کچێکی فەرەنسایی لێی چووە پێشەوە ، وتی : ئەی باوك کوشتەم ، هەی خوێنڕێژ ، دووبراشت بەدیل گرتووم ، ئیترکێ ماوە ؟ بەلاَم ئەم قسە ڕەقانە ئەم سەرکردە سەرکەوتووەی نەئاڵۆزان ودەست بەجێ ناردی هەردووبراکەیان هێناو بەکچەکەی وت : ئەوە دووبراکەت وائازادیان دەکەم تا بێکەس وبێ دەرەتان نەبیت ، هەرچی باوکیشتە لەشەڕێکدا کوژراوە کەخۆی ئاگرەکەی ناوەتەوە٠ئینجاکچە فەرەنسییەکە وتی : بمبوورە گەورەم دەمارێك بووهات بەسەرمداو لەدڵێکی پڕخەفەتەوە گرتمی٠ صلاح الدین ی ئەییوبی لەساڵی (٥٣٢) ی کۆچی بەرا مبەربە (١١٣٧)ی میلادی لەقەڵای تکریت لەدایکبووە ، ڕەچەلەکی ئەم بنەماڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ عەشیرەتی ڕەوادی کەبەشێکن لە خێڵی هەزبانییەکان لەگوندی (دوین) دەژیان٠

٭دی ئێن ئەی :

ترشێکی ناوکی یە لەناوخانەدا ، کەزانیارییە بۆماوەییەکانی دیاریکردنی هەرزیندەوەرێك هەڵد ەگرێت٠

⋆هەیتە :

تاسالآنی حەفتاکان وشەی (هەیتە) لەجیاتی وشەی پۆلیس بەکاردەهێنرا.

⋆کەشکەشان :

کۆبوونەوەی کۆمەڵێك ئەستێرەوتەنی ئاسمانییە.

⋆زرێ :

واتا سینەبەند کەجەنگاوەران زرێیان بەمەبەستی پاراستنی سینە دەپۆشی کەجیایەلەقەلغان زر ێ لەبەردەکرا ، بەلآم قەلغان جەنگاوەران بەدەستی چەپ دەیانگرت چەکەکەشیان بەدەستی ڕا ست دەگرت بۆڕاگرتنی شمشێر یان نێزەی دوژمن سودیان لەقەلغان وەردەگرت ، قەلغان هەبووە شێوەکەی بازنەیی بووە هەشبووشێوەکەی لاکێشەیی بوو کەتۆزێك چەمابۆوە ئەمڕۆش قەلغان بەکاردێت لەکاتی خۆپیشاندان پۆلیس لەبەرامبەربەردهاویشتن بەکاری دێنێت.

⋆ئەسپی تەڕوادە :

شێوازێکی هەڵخەڵەتاندن بوو لەشەڕی تەڕوادە لەنێوان یۆنانییەکان وخەڵکی تەڕوادە (شارێکی کۆن لەتورکیای ئەمڕۆ) یۆنانییەکان وایان پیشان دا کەشکستیان خواردووە وئەسپێکی داری گەو رەیان بۆخەڵکی تەڕوادە بەجێهێشت تەڕوادەییەکان ئەسپەکەیان بردە نێوشارەکەیان ، بەلآم نە یانزانی سەربازە یۆنانییەکان لەناوسکی ئەسپەکە خۆیان حەشارداوە ، دوای هاتنە نێوشارسەربا زە یۆنانییەکان لەسکی ئەسپەکە هاتنەدەرەوەودوای شەڕوپێکدادانێکی کەم دەروازەی شارەکەیان کردەوە. سەرەنجام یۆنانییەکان شارەکەیان گرت و لە شەڕدا سەرکەوتن. (هۆی شەڕی تەڕوادە هێلین ژنی پاشای ئیسوپارت پاریز شازادەی تەڕوادە هێلین ی ڕفاند بووە هۆی هەلآیسانی شەڕە کانی تەڕوادە).

⋆یەکەم ڕۆژنامەی کوردی ڕۆژنامەی (کوردستان) بوو ، کەلە ساڵی ١٨٩٨ لەلایەن (میقدادمدحەت بەگ) لەشاری قاهیرە دەرچوو.(میقداد مەدحەت) ناوێکی لێکدراوە ، کوڕی میربەدرخان بووە.ئەندامی حیزبی ئیتیحادوتەرەقی (کۆمەڵەی یەکگرتن وپێشکەوتن)بووە.لەساڵی (١٨٩٨) پێنج ژمارەی لە ڕۆژنامەی (کوردستان) لەقاهیرە بلآوکردەوە ، دوای ئەوە حکومەتی سوڵتان عبدولحەمیدی عوسمانی هەڕەشەی لێ دەکات ئەگەرنەگەڕێتەوە ئەستەمبووڵ و وازلە ڕۆژنامەی کوردستان نەهێنێ براکانی حەپس یان نەفی دەکات! ئەویش ناچاردەگەڕێتەوە ئەستەمبووڵ ودەست لەبلآوکردنەوەی ڕۆژنامەی کوردستان هەڵدەگرێت.میقداد مدحەت

دووکوڕی هەبوو : ئایەتوللاٚ وفارووق لەگەڵ کچێك٠میقدادمدحەت کەیەکەمین ڕۆژنامە نوسی کوردییە ، جگە لەزمانی دایك ، زمانی عەرەبی وتورکی وفەڕەنسیشی دەزانی٠

٭بەلقان :
نیمچەدوورگەیەکە دەکەویتەباشووری ڕۆژهەلاٚتی ئەوڕوپا٠لەهەریەك لە : (ئەلبانیا ، بولگاریا ، یۆنان ، ڕۆمانیا (یوگسلافیای پێشوو) ، تورکیابەشەئەوڕوپیەکەی پێکدێ)٠

٭مەسنەوی :
مەسنەوی گەورەترین بەرهەمی شیحری (جلال الدین ڕۆمی)یە٠لەشەش بەرگ پێکدێ بۆزۆرزمان وەرگێڕدراوە نوسینەکانی سۆفیگەرین٠جلال الدین ڕۆمی لەسەدەی حەوتەمی کۆچی ژیاوە٠کتێبی مەسنەوی بەیەکێك لەبەرهەمە شیحرییەکانی دادەنرێت٠
٭چۆغان :
گیایەکی بەهاری یە وەکو(کەرەوز)ە دەیانکوتی جلیان پێ دەشوشت٠
٭هەمیشەبەهار :
گوڵێکی گەلاٚسەوزی گوڵ زەردە٠
٭کاروان کوژە :
ئەستێرەیەکی گەشە بەیانیان دەردەکەوێ ، کاروانێك بەڕێکەوتووە پاش ئەوەی شەوحەساونەتە وە وایان زانیوە بەیانی داوە هەموویان کوژراون کاروانەکەیان تالاٚن کراوە ئەوناوەیان بەسەردابڕ اوە٠

٭کۆلارە :
باڵندەیەکی گۆشتخۆروبەرزە فڕە باڵندەی بچووك دەبینێ ڕاوی دەکات و خۆی لاردەکاتەوە وشە یەکی لێکدراوە لە : (کوه + لار) هاتووە ، کەلەشاخان خۆی لاردەکاتەوە ، ڕەنگی ڕەشەوباڵی سپی یە٠
٭شارەقەرباڵەغەکانی جیهان :
١ — تۆکیۆ (٢٨١٥٠٠٠٠)کەس
٢— نیۆیۆرك (١٦٦٠٠٠٠٠)کەس
٣ — لۆس ئەنجلس (١٢٧٠٠٠٠٠)کەس
٤ — بۆمبای (١٥٩٠٠٠٠٠)کەس

*دیكارت : فەیلەسوفێكی فەڕەنسییە٠
*جۆن لۆك : فەیلەسوفێكی ئینگلیزە٠
*كانت : فەیلەسوفێكی ئەڵمانییە٠
*ئادەم سمیس : ئابوریناسێكی ئینگلیزە٠
*ڤۆڵتێر : نوسەروفەیلەسوفی فەڕەنسی یە٠
*بتهۆڤن : مۆسیقاكارێكی ئەڵمانی یە٠
*تاگۆر : شاعیرونوسەرێكی هیندی یە٠
*ڤان كوخ : وێنەكێشێكی هۆڵەندییە ، لەساڵی (١٨٩٠) بەدووگولله خۆی كوشت٠

*ژمارە لەقورئانی پیرۆزدا :
وشەی الیوم (٣٦٥)جارلەقورئان دا هاتووە٠
وشەی الشهر (١٢)جارلەقورئان دا هاتووە٠
وشەی ئادەم (٢٥)جارلەقورئان دا هاتووە٠

*فاست فود :
واتا خواردنی ئامادەكراو٠

*یەكەم گۆڤاربەزمانی كوردی بەناوی (بانگی كورد) لەساڵی (١٩١٣) لەلایەن (جەمال بابان) ەوە دەرچوو ئەم گۆڤارە هەتا هەڵگیرسانی شەڕی یەكەمی جیهانی (٥)پێنج ژمارەی لێ دەرچوو٠
*محەممەدمەولود (مەم) :
ئەم نوسەروچیرۆكنووسە لەساڵی (١٩٢٧) لەشارۆچكەی (شەقلاوە) لەدایكبووە٠
*ڤاتیكان :
دانیشتوانی ئەم وڵاتە(١٠٠٠)هەزاركەسن ، كەسەرجەمیان ڕاهیبن نەژن دەهێنن نەشوودەكەن بۆ یەهیچ منداڵی لێ نییە ، پاپای مەسیحییەكانیش هەرلەم وڵاتە نیشتەجێیە٠ئەم وڵاتەكەوتۆتە ناوشاری ڕۆماڵەئیتاڵیا٠

★هێمای زانستی پزیشکی :

بێگومان هەموومان سەردانی دەرمانخانەمان کردووە ، هێمایەك دەبینین کەدوو(مار) خۆیان لەگۆچانێك ئاڵاندووە ، کەدوو مارەکە بەدەوری گۆچانەکە بۆسەرەوە سوڕاونەتەوە لەکۆتایی دا بازنەیەکیان دروستکردووە لەهەردوولای ئەوبازنەیەش باڵێك هەیە ئەم گۆچان ومارە بەهێمای پزیشکی دانراون ، ئەم هێمایە لەچییەوە هاتووە ؟ لەئە فسانەیەکی یۆنانی کۆن دا (ئێسکۆلاپییۆس) خواوەندی پزیشکی لەیۆنانی کۆن لەنەشتەرگەری وبەکارهێنانی گیادەرمانییەکان زۆرشارەزابووە کاتێك (ئێسکۆلاپییۆس) خەریکی دەرمانکردنی پیاوێك دەبێت خودای خودایانی یۆنان هەورە تریشقەی لێدەداودەیکوژێ٠پێش ئەوەی بمرێت مارێك دێتەژوورەوە ئەویش مارەکەی بەگۆچانەکەی دەستی دەکوژێ ، لەهەمان کات دا مارێکی دیکەدێ گیایەك لەناودەمی مارە مردووەکە دادەنێ ومارەکە زیندوودەبێتەوە ، (ئێسکۆلاپییۆس)یش کەئەوشتەدەبینێ ئەوگیایەی بۆزیندووکردنەوەی پیاوەکە (گێلایۆکۆس)بەکاردەهێنێ٠

★کاری پێشووتری ئەم پیاوە ناسراوانە :

ئابراهام لینکۆڵن : داربڕ

لیندۆن جانسۆن : بۆیاغچی پێڵاو

هایزیش هێملێر : دوکاندار

هۆشی مینە : نانەوا

ژاندارك : شوان

ڤاڵت دیزنی : شاگردی دوکان

★ئەوشتانەی گەڕانەوەی بۆنییە :

١ — ئەوبەردەی کەهاویشتت٠

٢ — ئەوقسەیەی کەکردت٠

٣ — ئەوکاتەی کەتێپەڕی٠

★ئەوناودارانەی بەناوی دایکیانەوە بەناوبانگن :-

| ناوی ڕاستەقینە | ناوی بنەماڵەی دایکی کەپێی ناسراوە |
|---|---|
| ١ — ویلیام ئەدون | شکسپیر |
| ٢ — ئیسعاق ئیسکاف | نیوتن |

| | |
|---|---|
| ٣ — جۆرج پۆل | جۆرج واشنتون |
| ٤ — ئەبلور ویز | پیکاسۆ |
| ٥ — ناپلیۆن ڕامۆلینۆ | پۆناپارت |
| ٦ — ئەبراهام هانکس | لنکۆڵن |
| ٧ — لودینگ کیفرتیش | ڤان بتهۆڤن |
| ٨ — ئەلبێرت کوخ | ئەنیشتاین |
| ٩ — چارلی هیل | چاپلن |
| ١٠ — جۆرج برنارد جۆلی | شۆ |

**★بەیهەقی :**

**ناوی (ئەحمەدکوڕی حوسێن)ە بەیهەق شارێکەلەنەیشاپور ، نەیشاپوریش شارێکی خوڕاسانە ، ساڵی (٣٨٤)ی کۆچی لەدایکبووە ، ساڵی (٤٥٨)ی کۆچی وەفاتی کردووە٠چەندین کتێبی هەیە ، وەك : السنن الکبری ، أحکام القران ،** دلائل النبوة ، الاسماء والصفات ، **٠٠٠ هتد٠**

**★چەمکی دایك :**

**وشەی أم (دایك) ئاماژە بۆدوومانادەکات ، دایك مانای بنەچەوسەرچاوە ، (أم)لەزمانی عەرەبی دا جگە لەدایك مانای بنەچەوسەرچاوەش دەگەیەنێ٠دایك چەمکێکە لەهەموزمانەکانی جیهان دا مانای جۆراوجۆردەگەیەنێت٠لەزمانی عەرەبی دا هەرشتێك چەند لق وپۆپێکی هەبێ وپەلبهاوێژێت ئەوائەوشتە بەسەنتەرهەژماردەکرێت وپێی دەوترێت (أم) ، واتا دایك لەزمانی عەرەبی دا ڕەگ وڕەچەلەکی شتەکانیش دەگەیەنێت بۆیە هەمووشارێك لەزمانی عەرەبی دا کاتێك خەڵکەکە جێی نابێتەوە پەل دەهاوێژێت بەسەنتەری گوندوئاواییەکانی دەوروبەری هەژماردەکرێت ، لەبەرئەوەی هەمووشارێك توشی (انفجارسکانی) دەبێت لەبەرئەوە بەشارێك بگوترێ (أم) واتا دایکی یاخود ڕەگ وڕیشەی گوندەکان وئاواییەکانی دەوروبەری خۆی دەگەیەنێت٠٠٠**

**١ — (أم الکتاب) سوڕەتی فاتیحە دەگەیەنێت٠**

**٢ — (أم القری) شاری مەککە دەگەیەنێت٠ئایابۆچی قورئانی پیرۆزشاری مەککەی بە (أم القری) ناوزەدکردووە ؟ بۆچی تەنهابەمەککەی وتووە : (أم القری) وەکولەئایەتی (٩٢)ی سورەتی (الانعام) داهاتووە :** (لتنذر أم القری ومن حولها)**(ئیبن عەبباس)پێی وایە قورئانی پیرۆزئەم ناوەی بۆیە داناوە ، لەبەرئەوەی بەبنەچەوبنجی هەمووگۆی زەوی دادەنرێت واتا لەڕووی**

دێرینی وکۆنی مەککەوە ، چونکە کۆنترین شارە لەسەرگۆی زەوی ، هەروەهاجوگرافیای شارەکەش کەوتۆتە ناوەڕاستی دنیاوە ، ئەوێ چەق وسەنتەری زەوییە ، هەروەها قیبلەگای موسوڵمانانە کەواتە مەبەست لێی هەمووگوندوشاروئاواییەکانی جیهانە خواش زاناترە٠(ومن حولها) هەمووخەڵکی جیهانە ، چونکە پەیامی ئیسلام پەیامێکی جیهانییەوهەمووخەڵکی دنیادەگرێتەوە٠

٣ – (أم الفواحش) :

پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی : ((الخمر أم الفواحش وأكبر الكبائر))رواه الطبراني یان فەرموویەتی : ((الخمر أم الخبائث))

★تاج مەحەل : بینایێکەدەکەوێتەهیندستان ، ئیمپڕاتۆرێکی بەڕەگەزمەغۆلی هیندستان بۆژنەکەی دروستی کردووە لەساڵی (١٦٣١)٠

★ڕووەکخۆری : شێوە بیرکردنەوەیەکە دژی بەکارهێنانی ئاژەڵە بۆخواردن وبەدەستهێنانی پۆشاك وپێست٠خۆیان بەدووردەگرن لەگۆشت وشیروماست وهێلکە ، خۆراکی خۆیان لەڕێگەی بەرهەمە گیاییەکانەوە بەدەست دەهێنن ، ڕووناکەنە ئەوبەرهەمانەی کەلەئاژەڵانەوە دەست دەکەوێت٠(گۆشت تامێکی خۆشی هەیە ، هەروەهاپڕۆتینێکی زۆری هەیە وبەشێکی گرینگی خۆراکی مرۆڤە)٠بۆنموونە خەڵکی ئەسکیمۆلەسوید بەتەواوەتی لەسەرگۆشت دەژین یان هەندێ هۆزی هیندی کەتەنیالەسەرخۆراکی ڕووەکی دەژین٠ نوسەری ئێرانی (سادقی هیدایەت) پەرتووکێکی بەناوی (گیاخۆری) هەیە٠ئەم بۆچوونەش پووچە کەدەڵێت : خۆراکی ئاژەڵی مرۆڤ بەلای دڕندەیی دەبات ، لەوانە ئەفلاتوون لەکتێبی(کۆمار)وای پیشان دەدات، کەخۆراکی ئاژەڵی دەبێتە هۆی پەیدابوونی گیانی شەڕوشۆڕوشەڕانگێزی وخوێنڕێژی بۆیەتەنیابۆسەربازەکان بەپێویستی زانیوە ، تادڕندەوشەڕکەردەربچن٠هەروەهاشاعیری ئینگلیزی (بایرۆن) لەوبڕوایەدایە کەخۆراکی ئاژەڵی مرۆڤ بەلای دڕندەیی دەبات٠هەروەها(کانت)و(ژان ژاك ڕۆسۆ)ش لەوبابەتەهاوڕان٠ بەڵام زۆرخواردنی گۆشتیش زیانی بۆتەندروستی مرۆڤ هەیە ، بەتایبەتی بەهاران دەرفەتێکی زێڕینە مرۆڤ هەندێك لەخواردنی گۆشت دووربکەوێتەوە ، بەڵام لادانی لەخواردن کارێکی باش نییە٠

★چەقەل :

چەقەل گیاندارێكی دڕندەوشەوگەڕە وەكوگورگە ، بەڵام لەهێزودڕندەیی وەك ئەونییەخۆراكی لەگۆشتی ئاژەڵی تۆپیو هەندێ جارمیوە پێكدێ٠باڵندەوپەلەوەرەخۆماڵییەكان دەخوات ، زەرەروزیانی زۆریش بە بەروبوومە كشتوكاڵییەكان دەگەیەنێت٠بەشێوەیەك كەلەوبارەیەوە پەندێك هەیە دەڵێ : ((چەم بێ چەقەل نابێ))

★سەد :

واتا بەربەست ، بەنداو ، ئاوبەست٠مرۆڤ بۆهەندێك سوودوپێداویستی دروستی دەكات لەوانە : عەماركردن وگلدانەوەی ئاوی باران ودابەشكردنی ئاوبۆكشتوكاڵ وزەوی وزار٠

★زمان :

هیچ زمانێكی زیندووی جیهان نییە ، كەخاوەن وشەی هاوبەش نەبێ لەگەڵ زمانانی تردا، هەندێ جارهاوڕەگەزایەتی وبنەڕەتی مێژوویی دەبنەهۆی پەیدابوونی وشەی هاوبەش یاخوددراوسێیەتی دەوردەگێڕێ ، جاری واش هەیەلەئاكامی بڵاوبوونەوەی زانیاریدا وشەی هاوبەش پەیدادەبێت ، كاتێك كەخوێنەرلەهەردووزمانی كوردی وئینگلیزی وردبێتەوە چەندوشەیەكی هاوبەش لەنێوان هەردووزمانەكەدابەدی دەكات ، وەكو :

ناو : نەیم

برا : برازەر

ئەستێرە : ستار

مانگ : موون

بەد (خراپ) : باد

نوێ : نیو

دلۆپە : درۆب

هەنگوین : هۆنی

لاق : لیگ

ڕووبار : ڕیڤەر

گەمە : گەیم

شەكر : شوگەر

★لەزمانی عەرەبی دا وشەی (رحب) مانای فراوانی شوێن دەبەخشێت ، کەبەیەکێك دەوترێت : (مرحبا) مەبەستیان ئەوەیە شوێنێکی فراوانت بەدی کرد واتا هاتویتە شوێنێکی فراوان نەك تەنگ لەڕووە مەعنەوییەکەی٠

★ئامەد :

(ئامەد) ناوی دێرینی شاری دیاربەکری ئێستایە وشەکەلەدووبەش پێکهاتووە : (ئا)+(ماد) (ئا)لە کوردی کۆندا واتا (گەورە) وەکو (ئاکۆ) واتاکێوی گەورە ، ئازاد واتا کوڕی گەورە٠کەواتە ئامەد و اتا (مادی گەورە) ، چونکە دەڵێن قەلەمڕەوی ماد دووبەش بووە بەناوی مادی گەورەومادی بچو وك٠ئامێدیش کەسەربەپارێزگای دهۆکە هەربەم جۆرەیە٠

★سەربەستی :

وشەی سەربەستی لەدووکەرت پێکهاتووە : (سەر + بەستن) کەمانای سەربەستن یاخودپێچانەوە ، کەمانای ئەوەدەگەیەنێ کاتێ سەردێشێ گەلێ جاربەپەڕۆیەك دەیبەستن ئەمیش بۆئەوەی ژانەسەرەکەی نەمینێ٠

★هەینی :

هەینی وشەیەکە لەئاینی یەوە هاتووە ، وشەکە بەم شێوەیە گۆڕاوە : ئاینی – ئەینی – هەینی٠

★وشەی سەرۆك واتا گەورەوپێشەوای گەلێك وەیاهەردەستەوتاقمێك ئەم وشەیەلەوشەی (سەر) هاتووە ، کەبەعەرەبی (ڕەئیس)ی پێدەڵێن ، ئەویش لەوشەی (رأس) دروستکراوە بەواتای ( سەر)٠

★باجی :

وشەیەکی تورکییەبەمانای (خوشك)دێت٠کاتێك ئەگەرژن وکچ نەناسراوبن بەباجی بانگ دەکر ێن٠

★خاتوون :

بەمانای (کابان) دێت٠هەروەهالەبەرامبەروشەی (خان) دایە٠

★پێشنیاز :

بریتییەلەڕاوبۆچوونێك دەخرێتەپێش خەڵکانی شارەزا تاتاووتوێی بکەن ، ئەگەرببەباش دانرا پەیڕەوی لێ بکەن ، ئەم وشەیە بەرامبەر (اقتراح)ی عەرەبییە٠

★پیاو :

وشەی پیاولەزمانی کوردی دا چەندین وشەی تری لێ داڕێژراون وەك ئاوەڵناو بەکارهاتوون مانا یەکی یەکجارپۆزەتیف دەبەخشن وجێگای چەندوشەیەکی تردەگرنەوە٠بۆنموونە هاوەڵناوی (

پیاوەتی) کەمانای چاکەدەگەیەنێ کەلەوشەی پیاودارێژراوە مانای چاکە یاخود  هەرشتێکی با
ش کەکەسێك بەرامبەربە کەسێکی تربەئەنجامی بگەیەنێ٠ هەروەها  وشەی پیاو  بەبێ هیچ
پێشگروپاشگرێك وەك ئاوەڵناوێك بەکاردێ  ، کەمانای نەبەردی وئازایەتی ومەردی وچەندین
سیفاتی باشی تردەگەیەنێ٠بۆنموونە لەکاتی پیاهەڵدانی کەسێك دەوترێت  پیاوە واتا ئەم کە
سەهەلگری خاسیەتی باشە کەمەرج نییەتەنیالەپیاودا هەبێ لەژنیش داهەیە٠  یاخود ئەگەر
بەکەسێك بوترێ بۆنموونە کەسێکی زۆرپیاوانەیە واتا کورێکەزۆرباشەو  هەمیشە دەستکراوە
یە بۆیارمەتیدانی ئەوانی تر٠ یاخودئەگەرکەسێك بیەوێ  کەسایەتی  یەکێکی تر دابەزێنێ
پێی دەڵێ : پیاونییە٠

★هاوسەر :

ئەگەربێت و وشەی هاوسەرشیبکەینەوە ئەوا  لەدووکەرت پێکدێ بەومانایە دێت کەچەند خا
ڵێکی هاوبەش لەنێوان دووکەس داهەیە ، وەك : (هاوپیشە ، هاوتەمەن ، هاورێ ، هاوپۆل ، ٠٠٠
هتد)٠ هەروەها (هاو)بۆدەستنیشانکردنی کەسی بەرامبەربەکاردێ وشەی (سەر)یش مانای کۆتا
یی دەبەخشێ وەك : (دنیاتاسەربۆکەس نابێ)٠هەندێ وشەی تریش لەمانای هاوسەرنزیکە وەك
: هاوژین٠ئەووشەیەش بەدیلی هاوسەرە٠

★وشەی (عار)واتای چییە ؟

عار وشەیەکی عەرەبییە بۆهەمووشتێك ، کەمرۆڤ پێی شەرمەزاردەبێت دەستەواژەیەکی کورد
یش هەیە ، دەڵێ : (عەیب وعار)٠

★مسیار :

وشەی مسیارلەوشەی (سیر)هاتووە واتا (ڕۆیشتن) ، لەبەرئەوەی پیاوەکە بەردەوام لای
ژنەکەنامێنێتەوە٠

★جیاوازی نێوان وشەی (صنع)و(خلق)چییە ؟

وشەی صنع واتا دروستکردن ، بەواتای ئەوەی شتێك لەچەندین کەرەستەی تردروست بکەی٠بە
لاَم (خەلق) بەمانای بەدیهێنان واتاشتێك لەنەبوونەوە بهێنرێتەبوون بۆنموونە تۆشتێك دەکڕی
لێی نوسراوە (صنع فی العراق) واتالەعیراق دروستکراوە ، بەلاَم هەرگیز ناگونجێت بنوسرێت (
خلق فی العراق)٠دیارە ئەوکەرەستەی کەپێلاَوی لێ دروست دەکرێت خوای گەورە هێناویەتییە
بوون بۆنموونە پێلاَولەچی دروست دەکرێت ؟ جاری وایە لەپێست (جلد)ی حەیوانی ، ئەوحە

یوانەش خوا(جل جلاله)خەلقی کردووە٠

★ڕەگەزپەرستی :
ڕەگەزپەرستی بریتییە  لەشانازیکردن بەنەتەوەیان ڕەچەلەك ، بەسووك تەماشاکردنی خەڵکی ترلەبەرامبەردا٠

★کالۆری :
وشەی کالۆری لەبنەڕەت دا وشەیەکی لاتینی یە واتا (گەرمی)٠

★وشەی قۆندەرە لەچییەوە هاتووە ؟
زۆرجارهەندێك وشەهەیە بەکاری دەهێنین ، بەلاّم واتاکەی نازانین٠ ڕەنگە واتایەکی خراپی هە بێ وپێی نەزانین بۆیەهەقەلەبەکارهێنانی ئەم وشەیە دوورکەوینەوە٠لەسەردەمی عوسمانییەکا ن جەندرمەی تورك جۆرە پێلاّوێکیان لەپێ دەکرد ، کەسەرەکەی ئاسنێکی گەورەی پێوەبوو جا ئەوجەندرمانە شاپیان لەهەرکەس بدابایە ٠٠٠ بۆیەکورد پێیان دەوت : (٠٠٠٠) ، دواتربۆئاسانی بەکارهێنان کردیان بەقۆندەرە٠بۆیەلەجیاتی وشەی قۆندەرەوشەی پێلاّوبەکاربهێنرێت باشترە٠

★ولاّتانی ئەسکەندەنافیا : (دانیمارك ، نەرویج ، سوید ، فنلەندا) دەگرێتەوە٠

★ئەبوبەکری صدیق (خوای لێ ڕازیبێ) :
ناوی (عبدالله بن عثمان)ە ، ناسناوی (صدیق)ە ، دەلێن کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) بەشەوچووە (بیت المقدس) ولەوێشەوە بۆئاسمان بەرزبۆوە ، بەیانی هەموو خەڵك باسی ئەم ڕووداوەیان کردوچوونە لای ئیمامی ئەبوبەکر(خوای لێ ڕازیبێ) ئەم ڕووداوەیان بۆباس کرد وتی : من باوەڕی پێدەکەم٠بۆیە پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ئەم ناسناوەی پێبەخشی٠ ئیمامی ئەبوبەکر سێ کوڕوسێ کچی هەبووە : (عبدالله وأسماء) ئەم دوومنداڵەی لە (قتیلە) بوو دەڵێن : ئەم ئافرەتەموسوڵمان نەبووە لەسەردەمی پێش ئیسلام تەلاق دراوە٠ (عبدالرحمن )و(عائشە) لە (ئوم ڕومان)بوون ، ئەم ئافرەتەلەساڵی شەشەمی کۆچی لەمەدینەوەفاتی کردوو ە٠(محمد) ئەم کوڕەی لە(أسماء بنت عمیس)بووە٠ئەم ئافرەتە لەگەڵ مێردی یەکەمی جەعفە ری کوڕی ئەبی تالیب کۆچی کردووە ، پاش شەهیدبوونی مێردەکەی ئیمامی (ئەبوبەکر)مارەی کردووە٠(أم کلثوم) لە (حەبیبە بنت خارجە)بووە ئەم ئافرەتە خەزرەجی بووە٠ماوەی خەلافە تەکەی دووساڵ وسێ مانگ ودەڕۆژبووە٠

**★عومەری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازیبێ) :**
**ناوی عومەری کوڕی خەتتابە ، ناسناوی (فارووق)ە٠**

**★عوسمانی کوڕی عەففان (خوای لێ ڕازیبێ) :**
**ناوی (عوسمان کوڕی عەففان کوڕی ئەبی العاص کوڕی ئومەییە)یە٠ناسناوی (ذوالنورین)ە واتا (خاوەنی دووڕووناکی) ، چونکە دووکچی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) مارەکردووە٠**

**★عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوای لێ ڕازیبێ) :**
**عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوای لێ ڕازیبێ) سەرەتاناویان لێ نابوو (ئەسەد) ، دایکی ئەوناوەی لێ نابوو بوناوی باوکی خۆی کردبووەوە ، کەناوی (ئەسەد کوڕی هیشام)بوو٠لەکاتی لەدایکبوونی دا ئەبوتالیبی باوکی لەماڵ نەبوو ، کەگەڕایەوە ئەوناوەی بەدڵ نەبوو بۆیە ناوی گۆڕی بۆ(عەلی)٠**

**★چەمکی کورد وکرمانج :**
**کورد ، ناوی ئەوگەلەیە کەلەناوچەیەکی شاخاوی دەژی ، عەرەب دەڵێ : کرد بۆتاك و(أكراد) بۆکۆ٠فارس دەڵێ : (کۆرد) بۆتاك و(کۆردها) بۆکۆ٠تورك دەڵێ : (کیورت)بۆتاك و(کیورتلر)بۆکۆ٠بەڵام کورد لەپاڵ ئەوناوەدا ناوی (کرمانج) بەتایبەتی لەناوچەکانی ژووروودا بۆناوی نەتەوەییش بەکاردێ ، وشەی کرمانج وەکوناوی چینایەتیش بەکارهاتووە٠**

**★وێکچوونی وشە لەنێوان زمانی کوردی ویۆنانی :**
**زۆروشەی هاوبەش لەنێوان زمانی کوردی ویۆنانی دا بەدی دەکرێ ؟ کاتێك ئەسکەندەری مەکدۆنی هێرشی کردە سەرئێران شوێنی هاتووچۆکەی بەکوردستاندا بوو مانەوەی هێزەکانی ئەسکەندەرلەکوردستان هەڵسوکەوت وهاموشۆی ئەوان لەگەڵ کوردان ، هەروەهاپەیوەندی بازرگانی لەوانەیە بوبێتەهۆی ئەوەی کەهیندێك وشە لەنێوان ئەودووزمانەدا ئاڵوگۆڕبن کەناکرێ بەئاسانی بڕیاربدرێ کەکامەوشەهی یۆنانییەوکامەوشەهی کوردە بۆنموونە وشەی (کەشکۆڵ) بەیۆنانی (کاسکۆڵ)٠هەروەها وشەی (تەمبەڵ)بەیۆنانی (تیمبیلیس) ، تەمبەڵخانە بەیۆنانی (تیمبیلخاناس) لەزمانی کوردی ویۆنانی داهەن٠دەتوانین بڵێین کوردین ، چونکە هیچ وشەیەك لەیۆنانی دا نییە کەبەپاشگری (خانە) کۆتایی هاتبێ ، کەمانای (شوێن)دەدات٠بەڵام**

لەکوردی دا دەیان وشەهەیە بە(خانە) کۆتایی هاتووە وەك (چایەخانە ، نەخۆشخانە ، میوانخانە ، باڵەخانە ، کارخانە ، ٠٠٠هتد)٠وشەی (خاکی) لەزمانی یۆنانی دا واتا ڕەنگی خاك ، بەلاّم لەکوردی دا جگە لەوڕەنگەی لەڕەنگی خۆڵ دەچێ واتای مرۆڤی سادەوبێ هەواش٠بەلاّم لەزمانی کوردی دا وشەی وا هەن کەڕەنگە لەزمانی یۆنانییەوە وەرگیرابن بۆنموونە وشەی (پۆل) ئەم وشەیە لەزمانی ڕۆژانەی خەڵکی یۆنان زۆربەکاردێ وەك : پۆلیمەر ، پۆلی تەکنیك واتا تەکنیکی زۆر کەبۆدەربڕینی کۆمەڵە شتێکی زۆرە٠مەعدەنووس بەیۆنانی مایزانۆس٠

چەقەل بەیۆنانی (چاکلی)٠سمۆرە (ساموورى) ، ئاخوڕ (ئاخوڕی) ، ئاخوڕلەکوردی دا بەوجێگایە لەتەوێڵە یان هۆڵ دەڵێن کەگیای تێدەکەن بۆمالاّت٠کوپە (کوپا) ، چەکوچ (چیکودی) ، مەندیل (ماندیلی) یان ماندێلا ، چادر (چادووری) ، بابوج (پاپوچی) ، دیارە یۆنانییەکان ئەم وشەیەیان لەفارسەکان وەرگرتووە٠سۆل (سۆلا)لەکوردی دا بەجۆرێك پێلاّودەڵێن٠دیوار(دوڤاری) ، فتیلە (فیتیلی) ، دونیا(دونیاس) ، سنور(سینۆرا)٠

★ئایامێژووسەربەئەدەبیاتە ؟

مێژووبریتییەلەتۆماری ئەورووداوانەی کەلەڕابردوو ڕوویانداوە٠مێژووبۆئەوەیە کەمیللەتێك یا ن مرۆڤێکی ناسراولەوئیشەداکەکردوویەتی شکابێ یان سەرکەوتبێ ، شکانەکەی یان سەرکەوتنە کەی لەبەرچی بووە لێکبدرێتەوە ، ئەگەرئەومیللەتە شکاوە یان هەڵەی کردووە میللەتێکی ترئە وخەتایەبکات ئەویش ئەشکێ٠

بەزمانی عەرەبی وشەی (التاریخ) مەبەست کاتە٠لەزمانی کوردیش وشەی مێژوو مانای ڕابردوو ، هەروەهاکات دەگەیەنێ٠(توکیدیس) یەکەمجارقسەبەناوبانگەکەی کردووە ((مێژووخۆی دووبارە دەکاتەوە)) ، جاچونکە تۆمارکردنی مێژووپێشت دەبەستێ بەوەستایی دارشتن ودەربڕینی نایاب هۆیەکە بۆئەوەی مێژووبەلقێك لەئەدەبیات دابنێن٠هەندێ مێژوونوسیش ئەدیب بوون بەجۆرێك ڕووداوەکان دەگێڕنەوە هەردەڵێی چیرۆك دەگێڕنەوە وەکو ئەلیادەی هۆمیرۆسی شاعیری یۆنانی شەڕی تەڕوادەی بەهەڵبەست نوسیووە ، بەلاّم ئەم نموونانە نابنە بەڵگە کەمێژووئەدەبە ، چونکە مەسەلەکە هەرپەیوەندی بەشێوەوشێوازەوە هەیە پەیوەندی بەناوەڕۆکەوەنییە٠دکتۆر (ج٠ب٠بیوری) (مامۆستای مێژووی نوێ لەزانکۆی کەمبریدجی ئینگلتەڕە لەوتارێکی دا لەساڵی (١٩٠٣) دەڵێ : ((حەزدەکەم پێتان بڵێم مێژوولقێك نییە لەئەدەب))٠

★مانگی هەنگوینی لەچییەوە هاتووە ؟

مانگی هەنگوینی لەکەلتوری ڕۆمانییەکانەوە هاتووە ، کەبوك وزاوا بۆماوەی مانگێك لەسەریەك هەنگوین وئاویان تێکەڵ بەیەك دەکردوو دەیان خوارد ، دواترئەوکەلتورە بۆهەمموودنیاگوازرایە وە٠زۆرجاریش ئەوماوەیە کەمتردەبێتەوە تادەگاتە هەفتەیەك یان کەمتر٠(ك) دەڵێ : ماوەیەکی زۆرتایبەت وخۆشە ، چونکە یادگارییەکانی ئەوماوەیە لای هەریەك لەژنان وپیاوان دەمێنیتەوە (ه) دەڵێ : ئەم سەفەرە ماوەیەکی زۆرخۆشە ماوەی چوار ڕۆژە لەسلێمانییەوە بۆهەولێرهاتوو ینە بۆئەوەی ئەوماوەیە لێرە بگوزەرێنین٠

★یاسا — قانوون :

"هۆبز" دەڵێ : ((ئەگەریاسالەکۆمەڵ دا نەبێت هەرکەسەلەتاکەکانی کۆمەڵ ڕووبەڕووی یەکدی دەبنەوەوهیچ کەسێك خاوەن ماف نابێت))٠

وشەی یاسا کەلەکوردی دا بەکاردەهێنرێ وشەیەکی کوردی نییە ، وشەی قانوونیش کەلەعەرەبی بەکاردەهێنرێ وشەیەکی عەرەبی نییە ، بەڵکووشەیەکی یۆنانییە یۆنانییەکان کانوون یان پێ وتووە٠وشەی یاساش تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆدەوری دەسەڵاتی جەنگیزخان ، کەکۆمەڵە قانوونێکی دانا بۆئیمپڕاتۆریەتەکەی لەبیابانی مەنغۆلیا ناوی نایاسا٠وشەی جەنگیزخان مانای جەنگاوەر ، بەمندالی (تیمۆجین) بوو لەساڵی (١١٦٤م) لە(مەنغۆلیا)لەدایکبووە ، باوکی سەرۆکی خێڵێکی مەنغۆلی بوو ، تیمۆجین لەتەمەنی چواردە ساڵی دا باوکی مرد ، پاشان هەمووخێڵەکانی ڕاکێشا بۆلای خۆی ویەکێتییەکی مەنغۆلی پێکهێنا ولەساڵی (١٢٠٦) هەمووەمەنغۆلیالەژێردەسەڵاتی تیمۆجین دابوونەیەك ومەنغۆلیەکان ناوی تیمۆجینیان گۆڕی وناسناوی جەنگیزخانیان دایێ کەبەمانای جەنگاوەردێت٠جەنگیزخان (چین)ی داگیرکردوتا(بەغدا)هات ئەوشوێنانەی داگیری دەکردن دەیکردنە کەلاوەو وێرانی دەکردن ئیمپڕاتۆریەتێکی گەورەی دامەزراند لەدوای خۆی مایەوە بۆکوڕەکەی (کۆبلاَن خان) ئەویش زۆربەهێزبووڕووی کردە ڕۆژهەلاَتی ناوە ڕاست وبەغدای داگیرکرد٠

★ئەستێرە :

ئەستێرە ئەوهونەرمەندە یان شانۆکارە یان سینەماکارە یان وەرزشکارە بەناوبانگەیە کەلەبواری پیشەکەی خۆی دا ناوبانگی بەدەستهێناوە ، بویتە هونەرمەند یان وەرزشکارێکی دیاروخۆشەویست خەڵکێکی زۆرخۆشیان دەوێ وپێی سەرسامن٠

★ئایدز :

لەساڵی (١٩٨٣) لەوکاتەی کەنەخۆشی ئایدزئاشکرابووە تائێستا زیاترلە(٥٠) پەنجا ملییۆن کەس تووشی ئەم نەخۆشییە هاتوون٠بەپێی ڕاپۆرتێکی نەتەوەیەکگرتووەکان ئایدزهۆی یەکەمە بۆلەناوچوونی مرۆڤ لەئەفریقیاوبکوژی یەکەمەلەوکیشوەرەوچوارەمە لەئاستی جیهان٠

★گوندی سەرگەڕان :

دەشتی کەندیناوە بەشێوەیەکی گشتی شوێنەکەی دەشتاییی ونزمە بۆیەئاوی باراناوی زۆربەی گوندوزورگەکانی لەکەندێك تێکدەکەنەوە ودێتەخوارێ کەندێکی گەورەدروست دەکات پێی دەوترێت : کەندیناوە٠ گوندی سەرگەڕان یەکێکەلەگوندەبەناوبانگەکانی دەشتی کەندیناوە ئەوگوندە سەربەناحیەی دیبەگەوقەزای مەخمووربو ، بەڵام لەساڵی (١٩٧٦)لەگەڵ چەند گوندێکی دیکە خرانە سەرپارێزگای کەرکوك وقەزای دبس٠دانیشتوانی ئەم گوندە زۆربەیان لەهۆزی (مامەسینی) بوون لەگەڵ چەند هۆزێکی دیکەی لێ دەژیا٠هۆزی مامەسینی دابەش بووبوون بەسەرچەند تیرەیەك لەوانە :-

١ — تیرە(بەرە)ی حوسێن کان٠

٢ — تیرەی مامەند٠

٣ — تیرەی غازی٠

٤ — تیرەی حاجی سمایل٠

٥ — تیرەی مرادی٠

٦ — تیرەی عەبۆ٠

٧ — تیرەی ئەحمەد دارکەیان٠

٨ — تیرەی کەوێ ڕەش٠

٩ — تیرەی توخمەسن٠

١٠ — تیرەی توخمەبەکر٠

★مەموندیان :

مەموندیان یان شێخ مەمووندیان گوندێکەکەوتۆتەبناری چیای سپیلك سەربەقەزای شەقلاوەیە سەبارەت بەناوەکەی دەڵێن مەمۆناوی مرۆڤێکە کوردبەئاینی مەسیحی دەڵێن : دیان واتا ناوەکە لە (مەمۆ + دیان) هاتووە٠بۆچونێکی تر واتا چەند مەموندییەك٠

مەمیند : ناوی گوندێکەلەسنوری شاری نەغەدە لەوانەیە عەشیرەتی مەموندی کۆچیان کردووە چوونەتەئەوگوندەوئاوەدانیان کردۆتەوە٠
لەکوردەواری دازۆرجارمرۆڤ بەناوی زێدەکەی ناسراوە زۆربەی نوسەران وشاعیرانیش ناوی زێدە کەی خۆیان وەك پاشناوبۆخۆیان هەڵبژاردووە وەك : سافی هیرانی ، حاجی قادری کۆیی ، مەلا ی بێسارانی ، عەلی بەردەشانی ، شەرەفخانی بەدلیسی ، ٠٠٠ هتد
مەمیوەندی : مەم + ی + وەند وەك ئەلوەند ، وەند ومەند بەواتای شوێن دێ (ئاباد)٠ بەواتای خاوەن وەك : هۆش مەند ، هونەرمەند٠ مامەند ، مەموند نزیکن لێك٠سودمەند واتائەوکەسە ی کەسوودی وەرگرتووە٠بیرمەند واتاخاوەن بیر٠ماموندی ناوی هۆزێکی کوردە لەویلایەتی وان لەکوردستانی تورکیا٠
★عالا :
گوندێکە سەربەناحییەی کەندیناوەیە ، دەڵێن کابرایەك ناوی عبداللە بوو ، ناوی گوندەکەلەوە وە هاتووە٠
★یەڵدا :
لەم ڕۆژەوە ڕۆژبەرەودرێژبوون دەکشێ وکۆتاشەوی پایزەوهێلی جیاکەرەوەی پایزوزستانە ودوا ین شەوی مانگی پایزەودرێژترین شەوە٠یەڵدا وشەیەکی سریانییە وەك نوئێل واتالەدایکبوون٠
★یەریڤان :
ئەم ناوە بەزمانی ئەرمەنی واتا (بەدیارکەوتن) ، ئەم شارە ناوی (ڕەوان) بوو کەلەناوی کورد ێکەوە هاتووە لەدەوروبەری (٤٦٠) ساڵ لەمەوبەرخانوولەم شوێنەدروست دەکات وپاشان خانو وی دیکەی لێ دروست دەکرێت تادەبێتەگوند ئەم گوندەش بەناوی ڕەوان ناودەردەکات٠

★بەتلیس :
بەتلیس میرێکی کورد بوو پاش ئەوەی فەرمانەکانی ئەسکەندەری بەجێهێناوە،ئەسکە ندەرخەلاّتی کردوشارەکەی بەناوی ئەوەوە ناوناوە بەتلیس٠

★قزڕەبات (سەعدیە) :
ئەم شارۆچکەیە دەکەوێتە سەرکەناری خۆرهەلاّتی ڕووباری سیروان ، کە (٣٣)سی وسێ کیلۆمەتر لەڕۆژئاوای شاری (خانەقین)ەوە دوورە٠قزلڕەبات وشەیەکی لێکدراوە (قز) بەواتای (کچ) دێت لەزمانی تورکی دا ، ڕەبات یاخود (ئاباد) بەمانای ئاوەدانی دێت لەزمانی فارسی دا ، بەمشێوەیەش ماناکەی دەبێتە (ئاوایی کچان)٠

**★ددانی ئاقلی چییه ؟**

**دواددانی مرۆڤ کەدێت بەتایبەتی لەنێوان تەمەنی (١٨ — ٢٥) ساڵی ئەم ماوەیەی تەمەنیش بریتییە لەتەمەنی عەقل بۆیە بەم ددانە دەوترێت ددانی ئاقلی٠**

**★ڕۆمانی گێلەپیاو :**

**ڕۆمانی (گێلەپیاو) نوسەری ناسراوی تورك (عەزیزنەسین) نوسیویەتی و(عەبدولاّ حەسەن زادە) کردوویەتی بەکوردی ، عەزیزنەسین بۆنووسینی گێلەپیاو ڕەنگە ئیلهامی لە ڕۆمانی (چارە ڕەشەکان)ی "ڤیکتۆرهۆگۆ" وەرگرتبێ ، چونکە لەچیرۆکی گێلە پیاودا ، کە(گێلە) دەبێتە بەڕێوەبەری قوتابخانە بەوبۆنەیەوە جەژن دەگێڕێ لە جەژنەکەدا دەیەوێ پێشینەی خۆی بدرکێنێ ودەڵێ : ((هاوڕێیان ڕێگابدەن پێ لەگوناهی خۆم بنێم٠زیاترلەوە ناتوانم خۆم ڕاگرم ، من تووشی ئازاری ویژدان بووم ، وەرن بمگرن !))ئەودیمەنەت بیردەکەوێتەوە پاڵەوانی ڕۆمانەکەی (ڤیکتۆرهۆگۆ) سەرۆکی شارەوانییەوزۆرخزمەتی شارەکەی کردووە و لەلایەن ئیمپڕاتۆرەوە لەقەب ونیشانی بۆدێ ، بەم بۆنەیەوە جەژنی بۆدەگرن لەجەژنەکەدا ڕاستی خۆی دەڵێ وخۆی بەگرتن دەدات٠ماکسیم گۆرکی دەڵێ : تەمەنم بیست ساڵ بوو (ڕۆمانی فاوست)م خوێندەوە دوای ماوەیەك تێگەیشتم کەدووسەدساڵ پێش "گۆتێ"ی ئەڵمانی کەسێکی ئینگلیز کەناوی "کریستۆفێرمارلۆ"یە بەسەرهاتی فاوستی نوسیووە ، لەبەرئەوە نوسەری گەورەی دنیاکەم نین کەئیلهامیان لەیەکتروەرگرتووە٠**

**★حەریق :**

**ناوی مەلا صالح کوڕی مەلا نەصرواللە یە لەساڵی (١٨٥١)ی میلادی لەگوندی (زێوێ) کەگوندێکە لای (سورداش) پاڵی داوەتە ڕۆژهەلاّتی شاخی پیرە مەگروون لەدایك بووە٠مە لا نەصرواللەی باوکی لەکوردستانی ئێرانەوە هاتۆتە کوردستانی عیراق ، بەمەلایەتی لە دێی (زێوێ) گیرساوەتەوە٠(حەریق) پاش ئەوەی لای باوکی سەرەتای خوێندنی دە ست پێدەکات بە فەقێیەتی زۆرجێگای کوردستان گەڕاوە وەکو : (قەرە داخ ، بیارە ، پێنجوین ، موکریان) پاشان لە (سابلاخ) دەبێتە مامۆستای مزگەوتی (سەید حەسەن) لە ساڵی (١٩٠٧) لەتەمەنی (٥٦) ساڵی دا کۆچی دوایی دەکات ولەگۆڕستانی (حاجی مەلا حاجامی) لەسابلاخ دەنێژرێ٠شاعیربەسێ زمان شیعری وتووە : کوردی — عەرەبی — فارسی وە لەکوردی توانیویەتی بە شێوەی هەورامیش شیعربڵێ٠**

★وەفایی :

وەفایی ناوی میرزاعەبدولڕەحیمی کوڕی مەلاغەفورە ، لەساڵی (١٨٤٤) لەشاری سابلاخ (مەهاباد) لەکوردستانی ئێران لەدایکبووە٠لەسەفەری سێیەمی حەجی دا کەلەگەڵ سەید ئەحمەدی خانەقاو حاجی تۆفیق (پیرەمێرد)ی شاعیر لەساڵی (١٩١٤) کۆچی دوایی دەکات وهەرلەوێش ئەسپەردەی خاکی پیرۆزی حەرەمەین دەکرێ٠

★دڵزار :

ناوی (ئەحمەدکوڕی مستەفاحەوێزی)یە ، لە ٨ /١ /١٩٢٠ لەشارۆچکەی کۆیەلەدایکبووە٠ناسناوی شیعری (دڵزار)ە ، دڵزار واتا (دڵ بریندار — دڵ غەمگین)٠

★فەقێ تەیران :

یەکێکەلەشاعیرەکۆنەکانی کورد ، کەبەدیالێکتی کرمانجی سەرووشیعری نوسیووە ، ناوی ڕاستە قینەی (محەممەد)ە٠فەقێ تەیران دوو کتێبی بەناوبانگی هەیە ئەوانیش : (حیکایەتی شێخی سەنعان)و(قەولی ئەسپی ڕەش)ن٠

★نازك الملائكة :

شاعیرێکی ئافرەتی عەرەبە٠

★فوروغی فەروغزاد :

شاعیرێکی فارسە٠

★سەعدی شیرازی :

ناوی (مشرف الدین)ە ناسناوی شیعری (سەعدی)یە لەساڵی (٥٨٣)ی کۆچی لە(شیراز)لەدایکبووە لەساڵی (٦٩٢) ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە٠بەهەردووکتێبی (گوڵستان) و(بوستان) بەناوبانگ بووە٠

★(سەعیدنورسی)لەساڵی (١٨٧٧)لەگوندی (نورس)ی سەربەویلایەتی بەتلیس لەدایکبووە، لەساڵی ١٩٦٠ کۆچی دوایی کردووە٠لەزیندان چەند کتێبێکی نوسیووە بەناوی (پەیامی نور)٠

٭شێوازەکانی دەوڵەت :

یەکەم – مەرکەزیەتی :

ئەوە دەگەیەنێت کەیاساودەستووربەسەرتەواوی دەوڵەتەکەڕادەپەڕێنرێت ، هەروەهایەك فەرمانڕەوالەپایتەخنەوەفەرمان دەکات ، بەلاَم کاتێ دەوڵەتەکە گەورەوبەرین بێت بۆکارئاسانکردنی پایتەخت ناوچەکان کاربەدەستی خۆیان هەیە ، بەلاَم ئەوکاربەدەستانەتەنیاکارگێڕن ، ئەوەی لەپایتەختەوەدەربچێت بێ لادان جێ بەجێی دەکەن٠

دووەم – لامەرکەزی :

بەهۆی ئەوەی هەندێ هەرێم تایبەتمەندی خۆیان هەیە یاخوددەوڵەتەکەگەورەوبەرفراوانە ئەوارژێمی لامەرکەزی پەیرەودەکات ، کەبەهۆیەوە هەندێ دەسەلاَت لەپایتەختەوە دەدرێتەناوچەکان بۆئەوەی کاروباری کارگێری ڕاپەڕێنن بەمەرجێك لەژێرچاودێری پایتەختەوەبێت٠

٭لەساڵی (١٩٢٤) دەستەسڕ (کلینیکس) دروستکرا لەولاَتی سوید٠

٭ماناکانی ناوی ئۆتۆمبیلەکان :

کاپریس : هەوەس یان حەز

کۆرفێت : کەشتییەکی جەنگی خێرایە

کامری : تاجی ژاپۆنی

میتسیوبێشی : سێ زێڕی بەنرخ

ئینفینستی : بێ کۆتایی

لاندکرۆزەر : زەوی بڕ

ئەڤەلۆن : شوێنێکی جوانی بەریتانیایە

مەکسیما : زیاتریان زۆرترین

مەرسیدس : جوان

جاکواز : پڵنگ

سوپەر : باشترین

٭پاشاکانی عیراق :

یەکەم – فەیصەڵی یەکەم :

ناوی فەیصەڵی کوڕی حوسێنی کوڕی عەلی یە ، لەساڵی (١٨٨٥) لەشاری (تائیف) لە نیوە دوورگەی عەرەبی لەدایکبووە٠لەساڵی (١٩٢٠) کرابەپاشای سووریا ، لەئازاری (١٩٢١) لە کۆنگرەی

قاهیره ئینگلیزەکان بڕیاریان دا وەك پاشای عیراق ، لە ١٩٢١/٨/٢٣ لەسەرکورسی پاشایەتی دانرا لەلایەن بەڕیتانیاوە ، لەساڵی ١٩٣٣ کۆچی دوایی کردو لەگۆڕستانی ئەعزەمییە لەبەغدا نێژرا٠خوالێ خۆشبێ دکتۆرمارف خەزنەداردەڵێ:(مەلیك فەیصەڵ یەکێ لەکوڕەکانی شەریفی مەککە حوسێن ) ئینگلیزەکان هێنایان کردیان بەمەلیکی عیراق ئەمە پاداشتی ئەوەبوو کەلە(٩)ی شەعبان بەتەقەیەکی دەمانچە جاڕی هەڵسانی جەنگی دا لەدژی دەسەلاتی عوسمانی ، فەیسەڵ پێشترکرابووبەمەلیکی سوریا ماوەی فەرمانڕەواییەکەی کەم بوو لەدوای مردنی غازی کوڕی بووبومەلیك ئەوکاتەی غازی مرد فەیصەڵی دووەمی کوڕی تەمەنی سێ چوارسالأن بوو ئەوکرایە مەلیك لەجێی باوکی٠بەیانی ١٤ی تەممووزی ساڵی ١٩٥٨ کەهێرش کرایە سەرکۆشکی (ڕیحاب)لەبەغدا فەیصەڵ وعەبدولئیلاه هەردووکیان لەوێ بوون ، گەڵێ کەس لەخەڵکی عیراق بەزەییان بەفەیصەڵ دەهاتەوە بیروڕایان دەردەبڕی کەنەدەبووبکوژرێن ، چونکە دەیانووت هیچ تاوانێکیان نەکردووە عەبدولئیلاهیش تەرمەکەی لەسەرشەقامەکان بەگوریس ڕاکێشرا تادەگاتەبابولئەعزەم٠

دووەم — غازی :

غازی کوڕی فەیصەڵی یەکەمە ، لەساڵی (١٩١٢) لەشاری مەککە لەدایکبووە ، لەدوای مردنی باوکی لە ١٩٣٣/٩/٨ سوێندی یاسایی خوارد وەك پاشای عیراق٠لەشەوی ٣ ی نیسانی١٩٣٣ کۆچی دوایی کرد لەئەنجامی پێکدادانی ئۆتۆمبیلەکەی بەعەموودی کارەبادا لەگۆڕستانی پاشایەتی لەئەعزەمییە بەخاك سپێردرا٠

سێیەم — فەیصەڵی دووەم :

کوڕی غازی کوڕی فەیصەڵی یەکەمە ، لەساڵی ١٩٣٥ لەبەغدا لەدایکبووە٠لەساڵی ١٩٣٥ دانرابەپاشای عیراق ودیاریکردنی عبدالاه وەك (وەصی) ، کەئامۆزای باوکی وبرای دایکی بوو ، چونکە باوکی ژیانی هاوسەری لەگەڵ عالیەی ئامۆزای پێکهێنابوو ، لەساڵی ١٩٥٣سوێندی یاسایی خواردولەسەرکورسی پاشایەتی دانیشت٠لەبەرەبەیانی ڕۆژی ١٤ ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨کوژرا٠

★قەرەج :

دەربارەی وشەی قەرەج چەندبیروڕایەکی جیاوازهەیە :

"م٠بینیامین"وای بۆچووە کەوشەی قەرەج لەوشەی (قەرە)ی تورکییەوەهاتووە بەمانای (ڕەش)٠"ئەب ئەنستانس" وای بۆدەچێ ئەم کۆمەڵە خەڵکی دەورووبەری (کەرەچ)بوون ، (کەرەچ)یش دەکەوێتەنێوان هەمەدان وئەسفەهانەوە٠لەبارەی بنەچەوڕەگەزیان وتراوە

کۆمەڵێك بوون لەهیند دەژیان ، دوایی پەرش وبلاّوبوونەوە هەندێکیان بەرەوئێران چوون ، هەندێکیشیان ڕووەوعێراق ومیسرِ بەڕێکەوتن ، هەروەهابەرەوئیسپانیاوئەندەلووس چوون وبەژیانی کۆچەری مانەوە٠لەبارەی مێژووی کۆچکردنیانەوە ، وەکوزانراوە کەقەرەج نەتەوەیەکی گەرۆکن لەسەرووی ڕۆژهەلاّتی هیندستانەوە هاتوون ، ئەم کۆچکردنەش هەندێك دەڵێن لەسەدەی پێنجەمی میلادییەوەدەستیپێکردووە٠هەندێ نموونە لەوشەکانی ئەوزمانە :-

ژووت : ژن

زوون : زمان

نفت : لووت

گوش : گوێ

چەنگ : دەست

دەخا : باش

خراو : خراپ

ئو : ئەو

کالك : منداڵ

تینە : مریشك

پەیلەر : پێ

نار : ئاگر

مکی : من

تکی : تۆ

ماکی : ئێمە

شماکی : ئێوە

ئو : ئەو

★دۆم :

هەندێك دەڵێن ئەم هۆزە بەڕەگەزخەڵکی ناوچەی (دۆمان)ی هیندستانن وهاتوونەتەناوکوردەوا ری٠

★کشمیر :

ویلایەتێکی هیندییە زۆرینەیان موسوڵمانن وسەرچاوەی ناکۆکی نێوان هیندستان وپاکستان لەسەرکشمیرە ، هیندۆسەکان ڕێژەی ٨٠٪ی دانیشتوانی هیندپێکدەینن موسوڵمانەکانیش

کەژمارەیان (١٣٤) ملیۆنە ڕێژەی ١٢٪پێکدەینن ، کەبەگەورەترین کەمینەی هیندی دادەنرێت٠زۆرجارپێکدادان لەنێوان موسوڵمانەکان وهیندۆسەکان ڕوویداوە بۆنموونە لەساڵی (٢٠٠٢) لەئاکامی پێکدادانێکی نێوان موسوڵمان وهیندۆسەکان ژمارەی قوربانییەکان گەیشتە (٥٠٠)کەس٠

٭پاکستان :

هیندستان پێش دابەشبوون پێکدەهات لەهیندستان وپاکستان وکشمیر٠ "محەممەدعەلی جوناح" ڕۆڵی دیاروبەرچاوی لەدامەزراندنی پاکستان وەکودەوڵەتێك بۆموسوڵمانانی هیند بینی ، پاکستا ن لەساڵی ١٩٤٧ سەربەخۆیی وەرگرت وموحوممەد عەلی جوناح کەڕاتشی کردە پایتەختی ئەم و لاتەتازەیە٠

٭بەدیع بابەجان :

یەکەم هونەرمەندی کوردە وێنەی شاعیرانی کێشاوە ، ئەگەرکتێبەبەناوبانگەکەی خواڵێ خۆشبێ (عەلائەددین سجادی) (مێژووی ئەدەبی کوردی) بخوێنینەوە ، دەبینین لەگەڵ باسی هەرشاعیرێك وێنەیەك کێشراوە٠ئەوەی ئەو وێنانەی کێشاوە ، هونەرمەندی لێهاتووبەسەلیقەیە کەلەساڵی چلەکان لەبەغدابووە ، خواڵێ خۆشبێ عەلائەددین سجادی ڕای سپاردووە کەئەوشاعیرانەی ناویان هەیەلەکتێبەکەی وێنەیان بۆبکێشێت٠ئەویش داوای چۆنیەتی ڕوخساروجل وبەرگییان وشێوەیانی ڕوون بکاتەوە بەوپێیە وێنەیانی کێشاوە٠ئەم هونەرمەندە لەساڵی (١٩٣٣) لەشاری کەرکوك لەدایکبووە ، لەبەرئەوەی حەزی لەخوێندنی هونەربووە ، ساڵی (١٩٤٥) چۆتەپەیمانگای هونەرەجوانەکانی بەغدا ، پاشان لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی (المساحە) دامەزراوەوماوەی (٣٥) ساڵ خزمەتی کردووەوئێنجاخانەنشین بووە٠هەروەهاوێنەی (ئیبراهیم خانی دەلۆ)ی بۆکتێبەکەی مستەفانەریمان بەناوی (شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ)کێشاوە٠

٭سوودەکانی پایسکل :

پایسکل ئامرازێکە کەخەڵکی بۆمەبەستی گواستنەوە وهاتووچۆبەکاری دەینن کەسانێك هەن پا یسکل بۆمەبەستی کاسبی بەکاردەینن هەشەبۆحەزوئارەزوو ، خەڵکانێکیش هەن بۆوەرزش و پێشبڕکێ بەکاری دەهێنن تەنانەت لەزۆرلەزانکۆکانی ژاپۆن وئەڵمانیادا قوتابیان بۆهاتووچۆلە نێوان کۆلیجەکان بەکاری دەینن ، بەلاَم ئەم دەوڵەتانە هەڵساون بەدابینکردنی شەقامی تایبەتی بۆپایسکل سواران٠هەروەهالەکاتی کەوتن پایسکل کەمترمەترسی هەیە بۆمرۆڤ،هەروەهاگرینگی

پایسکل بۆتەندروستی مرۆڤ بۆسوڕی خوێن وگەشەی ماسولکەکان٠بەکارهێنانی پایسکل لەبەکار ماتۆڕزۆرباشترە ، بەلاّم لەم زرِوفەدابەکارهێنانی پایسکل کارەساتی هاتووچۆزۆردەکات ، چونکە شەقامی تایبەتی بۆپایسکل سواران دروست نەکراوە٠

١ – نرخەکەی زۆرهەرزانترە لەسەیارە٠

٢ – ژینگە پیس ناکات٠

٣ – قەبارەکەی بچووکەوقەرەبالغی دروست ناکات٠

٤ – زۆرکەم مەسرەفە٠

٥ – ژاوە ژاودروست ناکات٠

٦ – مەترسی مردن وبریندارکردنی زۆرلەسەیارە کەمترە٠

٧ – بیّ مۆلەتی لیّخورِینە٠

تێبینی :-

لەحالەتی ئێستادا هەولّ بدریّ پایسکل کەم بکرێتەوە نەك زیادبکریّ ، تاکوشەقامی تایبەت بۆپایسکل دروست دەکریّ وەکولەولاّتانی پێشکەوتووی دنیاداهەیە ، چونکە دەبینین کاتێك کەگلۆپی سەوزپیّ دەبێت سەیارە بەپەلەدەیانەویّ برِۆن ، بەلاّم لەناکاوپایسکلێك لەلای گلۆپی سووردێت وەك سەیارە یاسای وەستانی نییە ، تێدەپەرِیّ ورِووداوی ترِاژیدی لیّ دروست دەبیّ ، هەروەهاپایسکل هیچ ئیشارِەتێکی نییە ئەمەش بۆمندالاّن وهەرزەکاران زۆرترسناکە ، هەروەها پایسکل بیّ ژمارەیە٠(سەرچاوە : گۆڤاری گولاّن ، ژ(٣٠٧) ، ٢٠٠٠)٠

*لە جیهان دا ئەوشارانەی گەورەترین شارن ، ئەمانەن : (شاری تۆکیۆ ، شاری نیبۆرك ، شاری لەندەن ، ٠٠٠هتد٠

*شەرِی عیراق وئێران لە ٨ /٨/ ١٩٨٨ وەستا٠

*تاوەری بیزا :

تاوەری بیزا یەکێکە لەوشتانەی لەجیهان دا بەناوبانگە ولەسەیروسەمەرەکانی جیهان دەژمێردرێت٠سەمەرەی ئەم تاوەرە لەوەدایە کەوا تاوەرەکە رِاست نییە ، بەلّکوبۆلایەك خواربۆتەوە ئەم تاوەرە بۆتە شوێنێکی گەشت وگوزار کە خەلّکانی جیهان سەردانی دەکەن و درێژییەکەی (٥٥)مەترەو لەشاری توسکانیایە لەولاّتی ئیتالّیا پێکهاتووە لە (٨) هەشت نهۆم٠

★زاگرۆس :

بەوزنجیرە شاخەدەوترێ ، کەلەئاراراتەوە درێژدەبێتەوە تاناوچەی خوزستان ، وەئەم زنجیرە شا خانەتورکیالەئێران جیادەکاتەوە ، هەروەهاسنوری ئێران لەعیراق جیادەکاتەوە٠

★گردی ژمارە (٦٠) :

سەیرترین ڕووداوە ، کەلە (٢٨) ی ئابی ساڵی (١٩١٨) لەکۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی ، کەئو ستوڕالیەکان بەشدارییان تێداکرد لەکوشتاری گردی ژمارە (٦٠) ڕۆژێکی خۆش وئاسمان هەوری پێوەنەبوو خۆریش بەدەرەوەبوو ، کەنزیکەی (١٠٠)سەد سەربازی ئینگلیزی بەرەوگردی ژمارە (٦٠)شەست ڕۆیشتن بینراشەش حەوت تەن (جسم) لەشێوەی هەورێکی درێژ دەوری گردی ژما رە (٦٠) یان دا ، ئەمجارە یەکێك لەم هەورانە بەتەنیادەسوڕایەوە ئەوانی تریش لەشوێنی خۆیا ن وەستابوون هەورەکە بەتەواوی هەمووسەربازەکانی داپۆشی ، ئەمجاهەورەتەنیاکەدەستی کرد بەڕۆیشتن ئەوانی تریش دوای کەوتن وڕۆیشتن ئیترسەربازەکان نەمان ولەناوچوون٠

★گاپ :

ئاویەکێکەلەگرینگترین هۆکاری مانەوەی ژیان لە سەرزەوی٠ ئاوپێکدێت لە گەردێك ئۆکسجین و دووگەردهایدرۆجین ، ئاو ٧٠٪ ی ڕووی زەوی داپۆشیوە ، کەبەبەرگی ئاوی ناودەبرێت٠بەپێی یا سای نێودەوڵەتی وەك لەرێککەوتننامەی(هلسن)ی ساڵی (١٩٩٢) دا هاتووە ، هەرڕووبارێك کەسنو ری نیشتیمانی ببڕێت وبڕژێتە خاکی دەوڵەتێکی ترەوە یان کەنارەکانییەوە ڕەوتی ئەم ئاوە بەڕ ووباری نێودەوڵەتی ناودەبرێت٠ئەودەوڵەتەی ڕووبارەکەی لێ هەڵدەقوڵێ وئەودەوڵەتەش تێی د ەڕژێت هەموویان مافیان بەسەرئەوڕووبارەوە هەیە٠ساڵی ١٩٩٧ یاسای بەکارهێنانی ڕێڕەوی ئاوی نێودەوڵەتی بۆکەشتیوانی لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بڕیاری لەسەردرا و(١٠٠)سەد دەوڵە ت لەئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان دەنگیان بۆدا ، تەنیاتورکیا و دوودەوڵەتی دیکە بەیاسایەڕازی نەبوون و دەنگیان پێنەدا٠ڕووباری نیل کە درێژترین ڕووباری جیهانە بەرلەوەی بڕژێتە دەریای ناوەڕاست بە (٩)نۆ وڵات دا تێ دەپەڕێت ململانێیەکی توندلەنێوان ئەم (٩)نۆو لاتەدا هەیە لەسەرئەم ڕووبارە٠لەتوێژینەوەیەکی (سی ئای ئەی)دا ئاماژەبەچوارناوچەوکۆمەڵە وڵات دەکرێ کەئەگەری ڕوودانی شەڕلەسەرئاودا تیایدا بەهێزە بەهۆی کەم ئاوییەوە ، ئەوانیش بریتین لە :

کۆمەڵەی یەکەم ئەم وڵاتانە دەگرێتەوە : (میسر ، سودان ، ئەسیوپیا ، کینیا ، تەنزانیا ، برۆ ندی) ، کەهەموویان هاوبەشن لەڕووباری نیل دا٠

کۆمەڵەی دووەم ئەم وڵاتانە دەگرێتەوە : (عیراق ، سوریا ، تورکیا) ، کەکەوتوونەتە سەرڕووبا

ری دیجلەوفورات٠
کۆمەڵەی سێیەم ئەم ولاٌتانە دەگرێتەوە : ( فەلەستین و ئوردن و سوریا و لوبنان لەلایەك و ئیسرائیل لەلایەکی تر ، کەلەڕووبارەکانی : ئوردن ویەرمووك ولبکانی و٠٠هتد هاوبەشن٠
کۆمەڵی چوارەم ئەم ولاٌتانە دەگرێتەوە : (ئاسیای ناوەڕاست کە ڤیرغستان وکازاغستان وئۆزبە کستان وتاجیکستان وتورکمانستان ، کەلەڕووباری سەرداریاوئامورداریادا هاوبەشن٠

پرۆژەیەکی ئاودێری وبەرهەمهێنانی وزەی کارەبایە٠ئەم پرۆژەیە لە (٢٢) بیست ودووبەنداوپێکدێ ، کە (١٤) چواردە بەنداولەسەرڕووباری فوراتە و(٨) بەنداویش لەسەرڕووباری دیجلەیە ، ئەمە جگەلە (١٩)نۆزدە وێستگەی بەرهەمهێنانی کارەبا ، کە (١١) یانزە وێستگەلەسەرڕووباری فوراتەو(٨)هەشتیش لەسەرڕووباری دیجلەیە٠ئەم پرۆژەیە بۆدوومەبەستە : یەکێکیان بەرهەمهێنانی وزەی کارەبایە ، دووەمیان تورکیابەنیازە لەداهاتوودا ئاوبەعیراق بفرۆشێت ، هەروەها بۆپاڵەپەستۆخستنە سەرسوریاوعیراق لەکاتی پێویست دا٠پسپۆڕێکی ئابوری سیاسی دەڵێت : ((ململانێی داهاتووی ناوچەکە لەسەرئاودەبێت))٠ئەم بەنداوانەدەتوانن بەتەواوی ڕێگالەهاتنەناوەوەی ئاوبۆناوعیراق بگرن٠هەروەهاهۆکارێکی ناکۆکی نێوان عیراق وئێران بریتی بوولەئاوی کەنداو ، کەعیراق و ولاٌتانی عەرەبی دەڵێن :کەنداوی عە رەبی ، بەلاٌم ئێران دەڵێ : کەنداوی فارس٠
لەبەرئەوەی کۆنترین شارستانییەت شارستانییەتی میسروعیراقە ، یەکەمیان لەسەرقەراخی ڕووباری نیل ئەویتریان لەنێوان ڕووباری دیجلەوفورات دەستی پێکردووە٠کێشەی ئاویش لەکێشەی نەوت وگازی سروشتی گەورەترە لەبەرئەوەی هیچ مرۆڤێك ناتوانێت بێ ئاوبژی٠شارستانیەتی نێوان دیجلەو
فورات وەك باخچەهەڵواسراوەکان وپەیکەری شێری بابل لەوشاکارانەیە کەبەڕەمزی شارستانیە ت دەژمێردرێت٠شوێنێکی ترکەجێگای سەرهەڵدانی شارستانییەتە کەوالەسەرلێواری ڕووباری نیل لەمیسر کەشاکارترین کاریان هەرەمەکانە ، کەبەیەکێك لەحاجباتییەکانی جیهان دەژمێر درێت ، هەروەهانوسینی هیرۆگلیفی کەنوسینی وێنەییە٠

★ماچ :
ماچ مانای ئەوپەڕی خۆشەویستی دەگەیەنێ ، دایك وباوك جگەرگۆشەی خۆیان ماچ دەکەن بەزۆریش دەم بۆسەر ڕوومەت یان نێوچاوانیان دەبەن٠دکتۆرێکی سویدی لەڕۆژنامەی

(لاترسيرا) نوسيويەتی : ماچ بۆدڵ وبۆلەش بەکەڵکە ، چونکەدەبێتەهۆی بەرگری لەش ، هەروەهاماچ دڵ بەگوڕدەخات ولەئەنجامدازیاترهەوادەچێتەناوشانەکان٠

★گرینگترین بەرهەمەکانی تۆڵستۆی :

١ — حیکمەتەکانی پەیامبەرموحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) وشتێك دەربارەی ئیسلام٠نا میلکەیە٠

٢ — شەڕوئاشتی٠ڕۆمانە لەدووبەرگ دا ساڵی (١٨٦٩) نوسیویەتی٠

٣ — ئاناکارنینا٠ڕۆمانە لەساڵی (١٨٧٨) نوسیویەتی٠

٤ — مرۆڤ وژیان٠

٥ — مرۆڤ بەچی دەژی ؟ چیرۆکە

٦ — سێ پرسیار٠چیرۆکە

٧ — ئاغاوخزمەتکار٠چیرۆکە

٨ — پێویست بووئاگرەکە هەربەپڕوشاکی خۆی بکوژێتەوە٠چیرۆك

٩ — مناڵی

١٠ — هەرزەکاری

١١ — گەنج

١٢ — قەوقاز

١٣ — هونەرچییە ؟

١٤ — مردنی ئیڤان ئیلیشت

١٥ — هێزی تاریکی٠شانۆنامەیە

١٦ — زیندووبوونەوە٠چیرۆکە

١٧ — حاجی موراد

١٨ — ئەلبێر

١٩ — دانپیادانان

٢٠ — کورتەی ئینجیل

٢١ — ڕۆژی دوایی

چەندبەرهەمێکی تریش ٠٠٠

★لێزەر :

هەرلەپەیدابوونی یەکەم ئامێری لێزەر لەساڵی (١٩٦٠) ، تاوەکوئێستاگشت بوارەکانی ژیانی گرتۆتەوە ، لەبواری پیشەسازی توانراوە لەکاری لەحیمکردن وتاواندنەوەکان بەکاربهێنرێت ، هەروە

هابۆزانینی گشت نارێکییەك لەبنمیچی بیناکان بەکاردەهێنرێت ، چونکەلەتوانای لێزەرداهەیە هەمووجۆرەچەمان وخواروخێچییەك لەبیناکان دا پیشان بدات٠لەبواری پزیشکی دا بایەخێکی تایبەتی هەیە لەعەمەلیات کردنی چاودا بەکاردەهێنرێت ، تاوەکوئێستا چەندین عەمەلیاتی سەرکەوتووئەنجام دراوە ، ئەوەی یەکەم جیهازی لێزەری داهێناوە (جیمس) ی زانابووبەپشت بەستن بەتێوری هەردووزانا (شالو)و(ڕناون) لەساڵی (١٩٦٠) جیهازی لێزەری داهێنا٠

**لەبارەی ڕەوشت :**

**ڕەوشت بریتییە لەهەڵسووکەوت کردن لەگەڵ خەڵکی٠**

یەکێك لەڕەفتارەهەرەبەرزەکانی ئادەمیزادی تێگەیشتوو ، ڕەوشتی باش وچاك وڕێزلێنانی خەڵکییە ، چونکەئەگەرکەسانی نەتەوەیەك ڕەوشتییان باش نەبێ ئەونەتەوەیەڕێگای بەرەوهەڵدێردەڕوات ، بۆیەپێویستەمرۆڤ لەژیانی ڕۆژانەی داهێمن ولەسەرخۆبێ وڕێزی گەورەوبچووك بگرێ ، کوردیش بەشێوەیەکی گشتی خاوەنی ڕەوشتی بەرزوبالأیە ، دیوەخانەکانی کوردەواری نموونەیەکی ئاسایی ڕەوشتی بەرزە ، ئەگەرسەدزەلامیش دانیشتبن لەگەڵ هاتنی هەرمیوانێکی ترهەمووهەڵدەستنەوەسەرپێ وچەندەهاجاربەخێرهاتنی دەکەن٠لەڕۆیشتنیشدابچووك پێش گەورەناکەوێ٠بەکورتی پەیڕەوکردنی ڕێزلێنانی خەڵکی نەك هەرڕەوشت بەرزییە ، بەڵکوئەرکێکی گرینگی ژیانیشە٠گەلانی سەرزەویش هەریەکەیان داب ونەریت وڕەوشتی تایبەتی خۆیان هەیە بۆنموونە : دانیشتوانی ئوستوڕالیا سڵاوکردنیان بەلووت بوو ، واتالووتیان لەیەك دەدا٠دانیشتوانی (گاتا) کەبەیەکێ دەگەن لایەکی کراسی خۆیان لادەدەن وشانیان دەردەخەن ، ئەم ڕەفتارەبەدڵسۆزی وبڕوابەیەکترلەقەلەم دەدەن٠تیرەیەکی ئەفریقیایی نەریتێکی زۆرسەیریان هەبوو ، ئەگەرجەنگاوەربۆیەکەمجارمنداڵێك ببینێ تفی لێدەکردوئەمەش دەبووەجێگەی دڵخۆشی منداڵەکە ، چونکەئەم ڕەفتارەی لەخۆی گەورەتربەشانازی دەزانی مانای وابوومنداڵەکەزۆرئازاورێك وپێکە٠لەوڵاتی (تیبت)دا کاتی میوان بەڕێخستن دەبوایەزمانی لێ دەربهێنرێ ، چونکەمانای وابووتام لەقسەوڕەفتاریان وەرگیراوە٠پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێ : ((فأبواه يهودانه أوينصرانه أويمجسانه))روه البخاري٠واتا : ((دایك وباوك منداڵەکانیان دەکەنەجوولەکە یان گاور یان ئاگرپەرست)) جابەپێی ئەم فەرموودەیە ڕاددەی کاریگەرییەتی دایك وباوکمان لەبواری پەروەردە وڕەوشت بۆڕوون دەبێتەوە٠جارێکیان پیاوێك هاتەلای پێشەواعومەری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازیبێ) کاتێ

کەخەلیفەبوو ، پێی ووت : ئەی خەلیفە ، ڕێگاوچۆنییەتی پەروەردەکردنی منداڵمان پێ نیشاندە٠پێشەواعومەرر(خوای لێ ڕازیبێ) وتی : ڕێگەیەکت پێ نیشان دەدەم کەچۆن پێش لەدایکبوونیان پەروەردەیان کەی ، کابراگوتی : بەڵێ٠گوتی : دایکێکی صالحەیان بۆهەڵبژێرە٠ فەیلەسوفی ئینگلیزی(برتراندڕاسل)دەڵێ : ((ڕەوشتەبەرزەکان لەمێژوودا دووسەرچاوەی هەبوو ە ، سیاسی وئاینی))٠زانایەکی بیرکاری دەڵێ : ئەگەربێت وئافرەت خاوەنی ڕەوشتی بەرزبێت ئە وکاتەیەکسانەبە(١) وەئەگەربێت وخاوەنی جوانیش بێت ئەوابۆیەکەکە سفرێك زیاد دەکەین و یەکسان دەبێت بە(١٠) هەروەهائەگەربێت وخاوەنی ماڵ وسامانیش بێت سفرێکی تریشی بۆزیاد دەکەین یەکسان دەبێت بە (١٠٠٠) وەئەگەرهاتووخاوەن پلەوپایەش بووسفرێکی تریشی بۆزیاد د ەکەین یەکسان دەبێت بە (١٠٠٠) جائەگەربێت ولەسەرەتادا ژمارە (١)(ڕەوشت)لابەرین ئەواتەنها سفرەکان دەمێنیتەوە وە سفریش بەتەنها هیچ نرخێکی نابێت، جائەگەربێت وئافرەت ڕەوشتی تێدانەبووئەواهیچ بەهاونرخێکی نابێت٠لەڕەوشتەجوانەکان بۆنموونە ، کە دووکەس خەریکی قسەوباسی خۆیانن جوان نییەکەسێکی دی بچێتە نێوانیان و خۆی هەلبقورتێنتە قسەی نێوا نیان٠بەبێ وشەی بەڕێزوکاك وخاتوون بانگی کەس نەکەی٠لەگەڵ ئافرەت دا تەوقەنەکەی تە نانەت ئەگەرخۆشی دەستی هێنایەپێشەوە پیاوبۆی نییە تەوقەی لەگەڵ بکات٠ئەوانەی پرچیا ن سپی بووەوتەمەنیان هەڵکشاوە نابێ پرچیان ڕەشبکەنەوە ، چونکە ڕەشکردنەوەی پرچ فرت وفێڵە٠گرینگیدان بەقسەی بەرامبەرەکەت نیشانەی ئەدەبە٠ئەگەریەکێك پرسیاری لێکراوە خۆ ت تێ هەڵمەقورتێنە لەجیاتی ئەووەلاٚم مەدەوە٠هەروەهالەڕەوشتەجوانەکان لێبوردنە خوای گە ورە دەفەرموێ : (ود كثيرمن أهل الكتاب لويردونكم من بعد ايمانكم كفارا حسدا من عند أ نفسهم من بعد ماتبين الحق فاعفوا واصفحوا حتى يأتي الله بأمره ان الله على كل شيء قد ير) البقرة : ١٠٩ ئەم ئایەتە لەمەدینە دابەزیووە فەرمان بەموسوڵمانان دەکات چاوپۆشی لە وجولەکەوگاورانەبکەن ولێیان خۆشبن ، کەحەسادەتیان پێدەبەن وهەوڵی هەڵگێڕانەوەیان لە ئیسلام دەدەن٠هەروەهالەسورەتی (الجاثية) ئایەتی (١٤) دەفەرموێ : (قل للذين امنوا يغفروا للذين لايرجون أيام الله ليجزى قوما بماكانوا يكسبون) واتا : (بلێ بەوانەی بڕوایان هێناوە ببورن لەوانەی بەتەمای ڕۆژەکانی خوانین (بڕوایان بەڕۆژی دوایی نییە) تاوەکوخوا(جل جلاله ) خۆی پاداشتی خەڵکی بداتەوە لەسەرئەوەی کردوویانە)٠لەئاینی ئیسلامدا ئەگەرکەسێك تاوا نی بەرامبەرکەسێك کرد ، ئەوائەوکەسەدووڕێگەی لەپێشە ، یان تۆڵەی لێ بسەنێتەوە یان لێی خۆشبێ٠ بەلێبوردن مرۆڤ کەم نابێ ، بەڵکوپێی گەورە دەبێ٠هەروەهالەڕەوشتەجوانەکان پارا ستنی نهێنی یە ، چونکەبەدرکاندنی نهێنی لەوانەیە کارەسات بکەوێتەوە ، کەزۆرجاردرکاند نی نهێنی بۆتەئاژاوە کەچەندین کەس تووشی شەڕوئاژاوەبوونە یان لەدەستدانی متمانە٠

**قومار :**

**قوماریارییەکی مەترسیدارە زۆرجاربینراوە کەسی قومارکەرلەسەرمێزی قومارخانووناومالّەکە ی تادەگاتەکچ وهاوسەرەکەشی دۆڕاندووە! هەندێك جاردۆڕاندنی هەمووشتەکان وتەنانەت کۆتا یی هاتن بەژیانیشی لیّ دەکەوێتەوە٠ هەروەك لەشاری (   ) پیاوێك دوای ئەوەی بەهۆی قومارکر دنەوە پارەیەکی زۆرقەرزاربوو واتاهەرپارەی قەرزکردووە لەقوماردۆڕاندوویەتی قەرزەکانیشی بەسەرکەلەکەدەبیّ لەنێومالّەکەی خۆی دا گوللەیەکی ئاڕاستەی خۆی کردوکۆتایی بەژیانی خۆ ی هێنا٠**

**قەدەروقەزا :**

**ناصری سوبحانی دەلّیّ : خەلّك بەگشتی دەلّێن قەزاوقەدەر ، بەلاّم لە پێشدا ئەندازەی هەرکار ێك ، کەبڕیاردراوە دیاریکراوە کەمانای قەدەرە ، پاشان بەپێی ئەوەی کەبڕیاردراوە کارەکە ئە نجام دەدریّ کەمانای قەزایە کەواتە وشەی قەدەرلەپێش قەزادیّ٠**

**قەزاوقەدەرهەیە ، ئەمەشتێکەوبینراوە ، لەوخۆشناوەتییە پیاوێك کوڕێکی سیّ چوارسالاّنەی خۆی لەگەلّ ئەبیّ دەچێتەدەرەوەبۆڕەزوباخ دەگاتەسەرڕەزەکە لەپاش هەندێك کوڕەکەی خەوی لیّ دەکەویّ ، ئەویش هەلّی دەگریّ ولەبن دارێك دایدەنیّ وجەمەدانییەکەی خۆی ئەدابەسەریاوخۆی دەچێتەلای کارەکەی خۆی خەریکی بێلّکاری دەبیّ ، کتوپڕبەدەم بێلّەکەوە دووپشکێکی گەورە دەردەپەڕیّ وڕوودەکاتەمندالّەنوستووەکە کابرابەبێلّەکەوە هەرڕائەکا بەشوێنیاهەرچەندەئەکانایگاتیّ کابرادەلّیّ وەکویەکیّ لەدوواوە پێی گرتبم هەرچەندم ئەکرد نەئەڕۆیشتم وتی : دووپشك لەدەستم دەرچوو ڕاست ڕووی کردەکوڕەکەوچووەژێرجامانەکەوە پاش تۆزێك هاتەدەرەوە وملی ڕێگای گرت وتی : من لەتاوکوڕەکەم ئاگام لەدووپشك بڕا چوومەسەرکوڕەکەم جامانەکەم لادا وسەیرم کردمارێك قەفی خواردووە بەدەوری کوڕەکەمدا سەری نزیکی بن ملی کوڕەکەم کردووە ، لەوکاتەدادووپشکەکەگەیشتووە چووەداویەبەتەپلّی سەری مارەکەومارهەرلەجێی خۆی دارەق بۆتەوە ئیترڕاست گەڕاوەتەوە٠وتی : کەئەوەم دیت چاوم بەدووپشکەکەکەوت لەگەڕانەوەکەدا نەچووم بەشوێنیا وازم لێهێنا ، چۆوەکونەکەی خۆی٠کاتێك لەم ڕووداوە وردئەبینەوە دەبینین ئەم ڕووداوە بەڕێکەوت ڕووینەداوە ،**

بەڵگوئەوەمان بۆڕوون دەبێتەوە کەخوای کاربەجێ ئیزنی لێنەبووە ئەومنداڵە شتێکی بەسەربێ٠

راست وچەپ :

١ – میلی سەعات لەلای ڕاستەوە بۆلای چەپ دەسووڕێتەوە٠

٢ – وەکودەستووری ئاینی ئیسلام ، خەڵك کەچوونە ماڵاَن یان مزگەوت ئەوکەسەی لەلای ڕاستە سەرەتابچێتەژوورەوە٠

٣ – لەکۆن دا پاشاوگەورەوسەرۆکی وڵاَت ، دوو وەزیری هەبوو ، وەزیری دەستە ڕاستو وەزیری دەستە چەپ ، وەزیری دەستە ڕاست دەسەلاَتی زیاتری هەبوو ، لەکاتی پێویست دا جێگری پاشا بوو٠

٤ – دەستی ڕاست لەدەستی چەپ بەهێزترە٠

٥ – کوڕوکچ کەمارە دەکرێن ئەلقە دەخەنە پەنجەی دەستی ڕاست ، لەپاش گواستنەوە دەخەنەپەنجەی چەپ ، واتا دڵیان پێکەوە گرێداوە وبوون بەهاوسەری یەکتری،چونکە دڵی ئادەمیزاد تەنانەت ئاژەڵیش لەلای چەپەوەیە٠

٦ – زۆربەی زۆری خەڵکی بەدەستی ڕاست دەنووسن ، زۆربەدەگمەن ڕوودەدات کەسێك بەدەستی چەپ بنووسێ٠

٧ – سەلام وتەقەکردن بەدەستی ڕاست دەکرێت٠

٨ – پاشاوپیاوی گەورەوئەفسەرلەناوئۆتۆمبیل لەلای ڕاست دادەنیشن٠

٩ – بووك وزاوا کاتێك دەکرێنەناوئۆتۆمبیلەوە ، زاوالەلای ڕاست وبووك لەلای چەپ دادەنیشێ٠

١٠ – مرۆڤ کەدەخرێتەناوگۆڕەوە بەرەوقیبلەدرێژدەکرێت وبەلای شانی ڕاست دەنێژرێ٠

١١ – بورغی بەلای ڕاست توند دەکرێت وبەلای چەپ شل دەکرێتەوە٠

١٢ – دەنگی ڕادیۆوتەلەفزیۆن وئامێرەکانی تربەلای ڕاست زیاد دەکرێت وبەلای چەپ کزدەکرێت٠

١٣ – چاوی ڕاست لەچاوی چەپ بەتین ترە٠

١٤ – گوێی ڕاست لەگوێی چەپ زیاتردەبیستێت٠

١٥ – موسوڵمانان لەسەربەرماڵی نوێژ بەئەنگوستی دەستی ڕاست شایەدی بەخواوپێخەمبەر دێنن٠

١٦- لەدوای تەواوبوونی نوێژ موسوڵمانان بەلای ڕاست دا ، پاشان بەلای چەپ دا سەلام دەدەنەوە٠

١٧ – باشترین شێوەی خەوتن ئەوەیە ، کەبەلای ڕاست دا خۆدرێژبکەی٠
١٨ – ئێمە بەلای ڕاستەوە دەست بەنووسین دەکەین ، بەلأم ئینگلیز بەلای چەپ٠
١٩ – سی ئادەمیزاد دووبەشە ، بەشی لای ڕاست لەهی لای چەپ گەورەترەو زۆرترهەوادەکێشێ٠
٢٠– لەزمانی کوردی دا وتن وقسەی بەجێ بەوشەی (ڕاست)دەردەبڕێت وەك دەڵێن : ڕاستی گو وت٠ڕاست برۆ ڕێی شێربگرە٠لەڕاستی لامەدە٠

## ناولێنان :

ناوهێمایەبۆمرۆڤ وکات وشوێن وبەهۆیەوە ئەوشتانەی پێ لەیەکدی جودا دەکرێتەوە٠ناولەڕێزمان دا پێناسەدەکرێت بەوەی وشەیەکە بۆناولێنانی کەسێك یان شتێك یان گیانلەبەرێك بۆناسینەوەی ئەوکەسە یان ئەوشتە یان ئەوگیانلەبەرە٠کەناوەکەبیسترا یەکسەرئاڕاستەی فکروسەرنجت بۆلایەنی ناولێنەرەکە دەچێت٠ناولێنان چەندەهاهۆکارکاری لێ دەکات وەکو : (ئاینی ، سیاسی ، نەتەوایەتی ، ٠٠٠هتد)٠هەندێ کەس ناوە ئاینییەکان هەڵدەبژێرن وحەزی لێ دەکەن وەکو : (ئەحمەد ، محمد ، مستەفا ، ٠٠٠هتد) هەندێکی دیکە ناوی شاعیروئەدیبان هەڵدەبژێرن وەکو : (هێمن ، گۆران ، هەردی ، ٠٠هتد)٠هەندێکی دیکە ناوی وەکو : (غاندی ، هیتلەر ، نەهرۆ ، ٠٠٠هتد) ، کەلەپەنجاکان وشەستەکان لەئارادابوو٠هەندێکی دیکە ئەوناوانە هەڵدەبژێرن کەگوزارشت لەهەستی نەتەوەیی دەکات وەکو (کوردستان ، کوردۆ ، ٠٠٠هتد)٠ئەرکی گرینگی دایك وباوك ئەوەیە کەناوێکی جوان بۆمنداڵەکانیان هەڵبژێرن کەلەدواڕۆژدا نەبێتەمایەی نیگەرانی وشەرمکردنی منداڵەکانیان، چونکە هەندێك ناوهەیە ناشیرینە یاخودنەگونجاوە ، هەروەها ناو لەبواری دەروونناسییەوە زۆر کاریگەری لەسەرمنداڵ هەیە ، هەندێ کەسیش لەناونانی منداڵەکانی بایەخ بەئاوازدەدات٠

## مانای هەندێك ناو :

ژاکاو : واتا سیس بۆنموونە : گوڵەکە ژاکاوە٠بەواتای تێکچووشێواویش دێ ، وەك : پرچی ژاکاوە ، واتا پرچی تێکچووەوشێواوە٠
کەنعان : زەوی کەنعان پێشتربەولأتی فەڵەستین وتراوە٠
دڵزار : بەواتای غەمگین
دلاوەر : دڵڕفێن
دلارام : دڵ + ئارام

